## ئەوەی یەکەمی عەلمانییەتی کورد

# ڕیشەی ئیلحاد لە کوردستان

نووسینی: مەسعود عەبدولخالق

وەرگێڕانی: سەرهەنگ عەبدولواحید



تویژینەوەی ئیسلام و عەلمانیەت

# نەوەی یەکەمی عەلمانیەتی کوردی

## پاشکۆ:ڕیشەی ئیلحاد لە کوردستان


نووسینی:

مەسعود عەبدولخالق

وەرگێڕانی بۆ کوردی:

سەرهەنگ عبدالواحد



ژمارە سپاردنی (٨٥٦)، بەرواری ١٩-١١-٢٠١٨

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

ئەم هەوڵە کەمەم پێشکەشە بە :

- ڕۆحی باوك و دایکی خۆشەویستم.
- بە هەموو ئەوانەی بەدوای ڕاستیدا دەگەڕێن و تێدەکۆشن لەپێناو نەهێشتنی ستەم لەسەر مرۆڤایەتی.

مەسعود عبدالخالق

ئـەو توێژینەوەیـە بـە زمـانی عربـی نوسـراوەو بەشـیکە لـە بەدەسـت هێنـانی ماستەر، بەناونیشانی (عەلمانی و ئیسلام کاریگـەریان لەسـەر دروسـت بـوونی دەولەتی عیراق)، پێکهاتوە لـە سـیێ بـەش، ئـەوەی وەرگێـڕدراوە لێـرە تـەنها بەشی یەکەمە کە تایبەتە بە عەلمانی وئیسلام، دووبەشەکەی تر سەبارەت بـە دروست بوونی دەولەتی عیراقە لەلایـەن بـەریتانیاوە، ئینجـا کاریگـەری ئـاینی وعەلمانی یەکەمیان بە بەرگری و دوەمیان بەهاریکاری.

# پێڕست

| ناونیشان | لاپەڕە |
| --- | --- |

# پێشەکی

پاش ڕووخانی خەلافەتی ئیسلامی لە ٣/ ٣/ ١٩٢٤ز بە تەواوی، کۆمەڵێك شەپۆلی هزر و تیۆر و دۆخی سەیر جیهانی ئیسلامی گرتەوە، هەندێکیان هزری و بیروباوەڕی بوون، کە بووە هۆی سەرهەڵدانی عەلمانیەت و ئیسلامی، هەندێکی تریان سیاسی و یاسایی بوون، بەگوێرەی ڕێکەوتنامەی نێودەوڵەتی جیهانی ئیسلامی دابەشکران بۆ دەوڵەتی بچوك بچوك، لە باشترین شێوەیدا ئەم دەوڵەتە بچوکانە لەسەر بناغەی پەیوەندی نەتەوایەتی عەلمانی بنیاتنران دوور لە کلتور و ڕۆڵی ئیسلامی، عێراقیش یەکێکە لەو دەوڵەتە بچوکانەی کە ساڵی ١٩٢١ز دروستکرا لە باوەشی داگیرکار و لە بارودۆخێکی جیهانی و هەرێمایەتی جیاواز بەم شێوەیەی خوارەوە:

١. ڕووخانی خەلافەتی ئیسلامی کە خۆی دەبینیەوە لە دەوڵەتی عوسمانیەکان و سەرکەوتنی هاوپەیمانان، لە کۆتایی جەنگی جیهانی یەکەم ١٩١٤ _ ١٩١٨ز بووە هۆی ئەوەی ئەو ئیمپراتۆرانەی مابوونەوە لە جیهان بگۆڕێن بۆ دەوڵەتی نوێ.
٢. داگیرکردنی ناوچەکە و دابەشکردنی بەگوێرەی ڕێکەوتننامەی سایکس _ بیکۆ ١٩١٦ز و سیڤەر ١٩٢٠ز لە لایەن داگیرکەر بە هاوکاری عەلمانیەتی ناوخۆیی، دروستکردنی دەوڵەتی نەتەوەیی تێیدا بە گوێرەی پرۆژەی (ئیمپریالیزمی ئەوساو ئاژانسەکانی زایۆن) .
٣. شکستهێنانی بەرگری و شۆڕشی[١] ئیسلامی دژ بەم پرۆژەیە.

---

(١) لەم توێژینەوەیە مەبەستمان لە بەرگری ئەو ماوەیە کە هێزەکانە بەریتانی هاتنە ناو عێراق، بەڵام شۆڕش بریتییە لە پرۆسە و ڕاپەڕینی سەربازییە کە گەل پێی هەڵسا پاش داگیرکردنی عێراق لەلایەن بەریتانیا.

٤. ئەم دەوڵەتە بچوکانە (بە تایبەت عێراق) بەبێ ویستی دانیشتوانەکەی دروستکران، ئەمەش لەژێر سایەی تاکە دامەزراوەی یاسایی نێودەوڵەتی (کۆمەڵەی گەلان) بوو مافی چارەی خۆنووسینی بۆ گەلان دەرنەکرد، بەڵکو گوزارشت بوو لە بەرگێکی یاسایی بۆ پڕۆژەی داگیرکاری مۆدیرن دژی جیهانی ئیسلامی ئەو کات.

لەبەر ئەوە: سروشتی بابەتی دەوڵەتی نوێی عێراق ئاڵۆزە و چەندین لایەنی جیاوازی هەیە، وڵاتانی ڕۆژئاوا لە ڕێی بەیاننامە و بەڵێنەکانیان لە پێش جەنگ و دوای ئەویش وا خۆیان دەرخست گوایە ئازادکەری گەلانن، لەو کاتەی ئامانجە شاراوەکانیان بەدیهێنانی مەبەستە داگیرکاری و مەبەستە زایۆنی بوو هەروەك دواتر ڕووندەبێتەوە، لە میانەی بڕیاری پێکهێنانی عێراق و دەوڵەتی بچوکی تر لە ڕۆژهەڵاتی ناڤین، ئەمەش لەگەڵ بڕیاری دروستکردنی کیانێکی ئیسرائیلی لە ناوچەکە هات لە ڕێگەی بەڵێننامەی بەلفور ساڵی ١٩١٧ز.

لەبەر ئەوە ڕاجیاییەکی قوڵ لەبارەی کۆمەڵێك پرسیاری نەمر لە ئارادایە کە پەیوەستە بە نیاز و مەبەستەکانی داگیرکاری ئیمپریالیزم لە پشت پێکهێنانی ئەم دەوڵەتە بچوکانە و دابەشکردنی جیهانی ئیسلامی و عەرەبی و کوردی و دانانی سنور لە نێوانیان ،زۆرجاریش دانانی سنوور لەنێوان یەك میللەت، ئایا ئەم هەنگاوە بۆ گەلانی ناوچەکە پاداشتە یاخود سزا؟ لە سەرەتادا ڕەوتی فراوانی نەتەوەیی و ئیسلامیەکان دژایەتی ئەم پڕۆژەیان دەکرد، دوای ئەوە ئیسلامیەکان بە تەنیا مانەوە تا ئێستاش هەر ئەوان دژی ئەم پڕۆژە مەترسیدارەن، لەگەڵ ئەوەی ڕەوتی نەتەوەیی _ هەتاکو دەسەڵاتدارانیش _ داندەنێن بەوەی ئەم سنورانە دەستکردن، جیهانی عەرەبی و نیشتمانی عەرەبی یەکە، وەك ئەوەی لە بەیاننامەی یەکەمی شۆڕشی ٨ی ئازاری ساڵی **١٩٦٣** لە سوریادا هات: ((سوریا وڵاتێکی عەرەبیە و گەلەکەی

داننانێ بە سنورە دەستکردەکەی بەردەوام و تاهەتایە لە سنوری نیشتمانی عەرەبی گەورە دەژیەت))[١]، لە کاتێکدا بە ڕاشکاوی داننانێن بەوەی ئەم دەوڵەتە بچوکانە دروستکراون و لە شوێنەواری داگیرکەرن، ئا ئەمە خاڵی سەرەکی ڕاجیاییە لە نێوان عەلمانیەکان و ئیسلامیەکان، بە شێوەیەك یەکەمیان پاڵپشتی ئەم پرۆژەیە دەکات و ڕایی دەکات و تائێستاش پێیەوە پابەندە، لەو کاتەی ئەوەی دووەمیان شۆڕشی لە دژ بەرپاکرد تا ئێستاش ئامانجی سڕینەوەی ئەم شوێنەوارەیە.

## گرنگی بابەتەکە:

دروستبوونی دەوڵەتی عێراقی گرنگیەکی جیاوازی هەیە، زۆربەی مێژوونووسانی (عەلمانی) هەوڵیانداوە پەیوەندی دروستبوونی دەوڵەتی عێراق و پرۆژەی داگیرکاری سەهیۆنی لە ناوچەکە لە یەکتری دووربخەنەوە، کە بەم هۆکارە وڵاتانی عەرەبی بە تایبەت عێراق لە ڕابردوو زۆریان ناڵاند و لە داهاتووشدا دەناڵێنن بە دەست کێشەی سیاسی و کۆمەڵایەتی و شارستانی و کێشەی دەسەڵاتداران لەگەڵ گەلەکانیان و لەگەڵ گەلانی تر کە عەرەب نین، ملکەچبوونیان بە نەخشە و پیلانە فراوانخوازەکانی ئیسرائیلی و ڕۆژئاوایی، زۆرجار دەبوونە پاسەوانی، پاش ڕووخانی خەلافەتی ئیسلامی ئەوەی (شەکیب ئەرسەلان) ساڵی ١٩٣٠ز پێشبینی کرد هاتەجێ کە وتی: عەرەب دوای خەلافەت دەبنە خزمەتکاری بیانیەکان[٢]، وتەیەکی بەجێیە جیا لەوەی کە مانەوە و بەردەوامی ئەم دابەشکردن و پابەندبوون بەم دەوڵەتە بچوکانە _ لە نێو ئەمانەشدا عێراق _ خزمەتکردنێکی خۆڕاییە بە پرۆژەی داگیرکاری و سەهیۆنی.

---

([١]) الموسوعة السياسية _ النسخة الأصلية _ نص البيان _ ص٧٠١ ملحق.

([٢])موفق بني مرجة– صحوة رجل المريض ، دار الكويت للصحافة / الكويت. ص ١٣٧.

لەو کاتەی ئەو توێژەر و مێژوونووسانەی کە باسکران لە هەوڵی بەستنەوەی دروستبوونی ئەم دەوڵەتە بە کۆششی بزوتنەوەی نیشتمانی عێراقی شکستیهێنا، ئەو لایەنەی کە سازشی کرد بە ماڵ و سامان و زێڕ و پۆست بەرامبەر داگیرکەر لەگەڵ ئەو شۆڕشەی لە دژی هەڵگیرسا وەك یەك حسابی بۆ دەکەن. پەیوەندیەکی پتەو لەنێوان پرۆژەی داگیرکاری و ئەو بارودۆخەی عێراق توشی بوو لە نائارامی دواکەوتن و پارچەبوون و دکتاتۆریەت و کێشە نەتەوەیی و مەزهەبیەکان کە بوونیان هەیە، ئەمەش بووە هۆی لەکارکەوتنی ڕۆڵ و ئەرکەکەی بەرامبەر بابەتە چارەنوسازەکان.

## ئامانجی توێژینەوەکە:

بەگوێرەی توانا زانستییە کەمەکەمان هەوڵدەدەین کاریگەری ئیسلامیەکان و عەلمانیەکان لە درووستبوونی دەوڵەتی نوێی عێراق دەرخەین، لێکۆڵینەوە لەو ڕەوتە بکەین کە هاوکار بوونە لەگەڵ داگیرکەر، هەروەها ئەو ڕەوت و لایەنەی کە شۆڕشی دژی داگیرکەر ئەنجامدا، دواتر دیاریکردنی بەرپرسیارەتی بارودۆخی خراپی جیهانی عەرەبی بەگشتی و عێراق بە تایبەتی، هەوڵدەدەین ئەو ئامانجانەی داگیرکەر دەرخەین کە لە پشت دروستکردنی ئەم دەوڵەتە بچوکانەن ئەمەش بە شیکردنەوەی لوغزی خوارەوە: بەریتانیا بە سروشتی داگیرکاری خۆی بە زەبری هێز دەهاتە ناوچەکە و هەزاران سەرباز و ئەفسەری لەدەست دەدا، ماڵ و پارەی زۆریان خەرج دەکرد بۆ پێکهێنانی ئەم دەوڵەت عەرەبیانە لەوانەش عێراق، کۆششی زۆریان خەرج کرد لە پێناو تەواوکردنی دامەزراوە و پێویستیەکانی دەوڵەت وەك حکومەت و پەرلەمان و سوپا و داهات، دانانی سنوور، لە کۆتاییدا دانان و بردنی بۆ کۆمەڵەی گەلان وەك دەوڵەتێکی سەربەخۆ، پێشکەشکردنی بە دەوڵەتی عێراقی!، ئایا ئەم لۆژیکە لەگەڵ سروشتی داگیرکەر و بنەماکانی سەرمایەداری و لیبراڵیەتی

بەرژەندیخواز دەگونجێ ؟ ئایا پیلانێکی گەورەی لە دواوە نییە ؟ هەوڵ دەدەین ئەم مەتەڵە شیبکەینەوە، ئەوە بتوێژینەوە کە ئایا پڕۆژەی دەوڵەتی عێڕاقی پڕۆژەیەکی داگیرکاری بوو یاخود بەرهەمی بزوتنەوەی نیشتمانی عێڕاقی بوو ؟ عەلمانی وئاینی لەکوێی ئەو هاوکێشە ئالۆزەن؟

## گرنگترین کێشەکانی ئەم توێژینەوەیە:

لە میانەی ئەم توێژینەوەیە ئەم کێشە زانستی و هونەریانەم ڕووبەڕوبوونەوە:

١. نەمتوانی ڕاستەوخۆ بەڵگەنامە بەریتانی و عوسمانیەکان بە تەواوی دەستبخەم کە پەیوەستن بە کاروباری ویلایەتەکانی عێڕاقی.

٢. زۆربەی ئەو مێژوونوسانەی لەبارەی عێڕاق نووسیویانە لەژێر سایەی ڕابوونی نەتەوەیی بوونە بۆ ڕازیکردنی ئەمری واقیع بووە، هەوڵیانداوە ڕەشنووسێکی بنەڕەتی مێژوویی و شارستانی و یاسایی و سیاسی و شۆڕشگێڕی و نیشتمانی خودی بۆ دەوڵەتی عێڕاق دروست بکەن، تێبینی دەکرێت کە بۆشایی و زنجیرەی ونبوو هەیە لە میانەی قۆناغەکانی دروستبوونی دەوڵەتی عێڕاقی، بە بنچینەیەکی قوڵی مێژوویی دەسپێدەکەن، دروست بوونی دەولەتی عیراقی بە مێژووی دەرکەوتنی بزوتنەوەی نیشتمانی و نەتەوەیی و شۆڕشی بیست دەبەستنەوە ، لە کاتێکدا شۆڕش شکستی هێنا و بە ڕێگەیەکی داخراو گەیشت. لێرەوە دەخرێنە سەر ڕێچکەی بەریتانی بۆ ئەم دروستکردنە، ئەمەش ئەو بۆشایی و زنجیرە ونبوەیە کە ناتوانرێ پێکەوە ببەسترێتەوە، لەبەر ئەوەی ئەم دوانە گوزارشت لە دوو مێژوو و دوو خواست و دوو ئامانجی لە یەکتر دوور و ململانێکار دەکەن، لەبەر ئەوە هەر

توێژەرێك بێت ڕووبەڕووی لەمپەری زۆر دەبێتەوە بۆ گەیشتن بەم زانیارییە ڕاستەقینانە دەربارەی دروستبوونی ڕاستەقینەی ئەم دەوڵەتە لە ڕووی پاڵنەر و ئامانج و لایەنە بەشدار بووەکان.

٣. تێبینی دەکرێ هەموو ئەو نووسینانەی کە پاش دروستبوونی دەوڵەتی نوێی عێراق دەربارەی مێژووی ئەم ناوچەیە دەرچوون، بۆ ئەم ناوانە وەرگێڕدراون (وڵاتی نێوان دوو ڕووبارەکە ...، میزۆپۆتامیا، وڵاتی بابل، وڵاتی ئاشور، سواد، ...تاد) بۆ (عێراق)، هەروەها هەڵسان بە ڕێکخستنەوەی ئەو ڕووداوە مێژوویی و شارستانی و زانستیانە کە لەسەر ئەم زەویە ڕوویانداوە و گەڕاندنەوەیان بۆ مێژووی عێراق، وا بۆ خوێنەر دەردەکەوێ کە عێراق بەم قەبارە و سنوور و پێکهاتانە خاوەنی ڕەگ و ڕیشەیەکی مێژوویی و سیاسی و کۆمەڵایەتی و شارستانییە بۆ هەزاران ساڵ دەگەڕێتەوە، لە کاتێکدا حەقیقەت ئەوەیە کە مێژووی سیاسی عێراق پاش جەنگی جیهانی یەکەم دەرکەوت ئەو کاتەی بەریتانیا لەناو ٣٢ ویلایەتی عوسمانی سێ ویلایەتی هەڵبژارد بۆ پێکهێنانی عێراق.

## پەیڕەو و پلانی توێژینەوەکە:

پشتی بە چەندین پەیڕەو پلان بەستووە لەوانە: مێژوویی و سیاسی و شیکاری و بەراوردکاری، هەوڵمداوە لە هەست و سۆز و کاریگەری ئەمری واقیع دوورکەومەوە، بەڵکو پەیوەست بم بە توێژینەوەیەکی بابەتی دەربارەی ڕاستیەکان لەبارەی دروستبوونی دەوڵەتی نوێی عێراق لە نێوان ئەم سێ کاریگەرییە سەرەکییە: عەلمانیەت، ئیسلامی و ڕۆڵی داگیرکەری بەریتانی تێیدا، بەوەی کاریگەری ئیسلامی

و عەلمانی لەم پرۆسەیە زیاتر لە توێژینەوە هزری و فەلسەفیە درێژدابڕەکان نزیکە، زۆرجار لە کاتی کورتکردنەوەی پێویستی بە خوێندوەیەکی چڕ و پڕ هەیە، بەتایبەت ئەوەی من زۆر پشتم بە گواستنەوەی دەقەکان نەبەستووە، بەڵکو هزرەکەم لێوەر گرتووە لەپێناو کورتکردنەوەی.

لەسەر ئەمە توێژینەوەکەم دابەشکردووە بەگوێرەی بەش و دەروازەکان بەم شێوەیەی خوارەوە:

ناونیشانی توێژینەوەکە: ئیسلام و عەلمانیەت (ڕۆڵیان) کاریگەر لە دروستبوونی دەوڵەتی نوێی عێراق١٩٢١. کە پێکدێت لە سێ بەش، هەر بەشێك پێکدێت لە سێ دەروازە و هەر دەروازەیەکیش لە سێ باس پێکدێت.

لە بەشی یەکەم باسی پێناسەکانی عەلمانیەت و سەرهەڵدانی چۆنیەتی هاتنە ناو جیهانی ئیسلامی کراوە، بەراوردم لە نێوانی و هزری ئیسلامی کردووە دەربارەی دروستبوونی دەوڵەت، لە بەشی دووەم باسی بارودۆخی جیهانی و هەرێمایەتی و ناوەخۆییم کردووە پێش دروستبوونی دەوڵەتی عێراق.

لە بەشی سێیەم و کۆتایی کەمێك بە درێژی باسی کاریگەری عەلمانیەت و ڕۆڵی داگیرکەر لە لایەك، لەلایەکی تر کاریگەری ئیسلامی لە نەخشەکێشانی ناوچەکە و عێراق بەتایبەتی، قۆناغەکانی دروستبوونی دەوڵەتی نوێی عێراق و گرنگترین دامەزراوەکانی، دواتر بە دەرەنجامی باشەوە دەرچووین کە نەخشەی پێکهێنانی دەوڵەت پاداشت نەبوو بۆ گەلانی ناوچەکە، بەڵکو سزایەکی توند بوو کە کاریگەریەکەی تا ئێستاش ماوە، بە زۆری ئیسلامیەکان دژی ئەم نەخشەیە وەستانەوە و عەلمانیەکان سازشیان کرد، دووەمیان سەرکەوت و یەکەمەکەیان شکستی هێنا.

## بەشی یەکەم

# ئیسلام و عەلمانیەت

لەم بەشەدا ئاماژە بە پێناسەکانی عەلمانیەت و مەبەست و بارودۆخی سەرهەڵدان و گەشەکردنی دەکەین، بە هەمان شێوە باسی هۆکارەکانی بڵاوبوونەوەی لە جیهانی ئیسلامی دەکەین، هەروەها گرنگترین پاساو و هێز و توانای مانەوەی، کاریگەریان لە پێکهێنانی کیانە سیاسی و قوتابخانە و دەستوری دەوڵەتان. پاشان باسی ئیسلام و هێڵە گشتیەکانی، ڕەگەزەکانی هێزی بەردەوامیەکەی، گرنگترین لایەنە سیاسیی و لایەنە ناکۆکەکانی لەگەڵ عەلمانیەت دەکەین.

مەبەست لە توێژینەوەی ئەم بەشە دیاریکردنی کاریگەری ئیسلام و عەلمانیەتە لە فەرهەنگی پرۆسەی دروستبوونی دەوڵەتی عێراق ساڵی ١٩٢١ز.

لەسەر ئەم بناغەیە ئەم بەشەمان بۆ ئەم دەروازانەی خوارەوە دابەشکرد:

دەروازەی یەکەم: عەلمانیەت، سەرهەڵدان و گەشەکردنی، هۆکار و پاساوەکانی.

دەروازەکانی: ئیسلام، هزری فەلسەفی دەربارەی ئیسلام، ئیسلام و ئیسلامی، عەلمانیەت لە جیهانی ئیسلامی.

دەروازەی سێیەم تیۆریای دەوڵەت لە نێوان ئیسلام و عەلمانیەت، دیاریکردنی ( ڕۆڵی ئیسلام و عەلمانیەت لە دروستبوونی دەوڵەت ...).

## دەروازەی یەکەم

# چەمکی عەلمانیەت

### باسی یەکەم: عەلمانیەت لە ڕووی زمانەوانی و زاراوەییەوە

جیاوازی لە بۆچوون و بەرژەوەندی وای کردووە زۆربەی زاراوە و چەمکەکان پێناسەگەلێکی زۆر هەڵبگرن، لە نێو ئەمانەش عەلمانیەت، بەڵام نیمچە کۆدەنگیەك هەیە لەسەر مەبەستەکەی کە بریتیە لەوەی: بانگەشەیەکە بۆ ژیان کردن بەبێ ئاین[(١)]،یان وەك مەوسوعەی (Encyclopædia Britannica) وەسفی کردوە ژیانێك بۆ سەرزەوی [٢]، بە هۆی جیاکردنەوەی ئاین لە دەوڵەت ، یاخود (جیاکردنەوەیەکی ڕەها لە نێوان سیاسەت و ئاین) [(٣)] کە هۆبز (١٥٨٨ _ ١٦٧٩ز) بۆ یەکەم جار بانگەشەی بۆ دەکرد، ئەویش لە ڕێگەی بەستنەوەی ئاین بە یاسا و جیاکردنەوەی لە ڕاستی[(٤)]، بە سودوەرگرتن لە تیۆرەکانی میکافیلی (١٤٦٩ _ ١٥٤٧ز) لەبارەی دروستکردنی زانستە نوێکانی سیاسیەت، لە میانەی دارِنینی سیاسەت لە ئەخلاق و ئاین[(٥)]، بە فراوانبوونی پلەبەندی ئەم زانستانە

---

(١) الندوة للشباب الإسلامي _ الموسوعة الميسرة في الأديان والماهب المعاصرة، ط ١ _ رياض ١٩٨٨ ص ٣٦٧٠ .

2 Encyclopædia Britannica- Article: secularism

(٣) أ _ الموسوعة العربية العالمية، مؤسسة أعمال الموسوعة للنشر والتوزيع، الرياض السعودية، الطبعة الثانية ١٩٩٩ _ (مادة: العلمانية)، ج ١٦ ص ٤١٥ ب_ د. عبدالوهاب كيالي، الموسوعة السياسية ج٤، الطبعة الثالثة ١٩٩٥.

(٤)ينظر: ١-توماس هوبز-اللفياثان(الاصول الطبيعة والسياسة لسلطة الدولة )ت:ديanaحرب، ط١،دار فارابي ص١٢٦. ٢- الموسوعة الفلسفية المختصرة، تعريب: فؤاد كامل، جلال العشرى، عبدالرشيد الصادق دار القلم -بيروت، منشورات النهضة -بغداد ص٥٠٥ - ٥٠٦

(٥) نقولا ميكافيلي _ الأمير _ تعريب: خيري حماد، ط٨ ١٩٧٧م، دار الأفاق الجديدة _ بيروت ص ١٧. بما أن هذا الفصل بدأ بتعاريف ومفاهيم لذالك اسندنا إلى المعاجم والموسوعات قبل المصادر.

عەلمانیەت هەموو ڕەهەندەکانی ژیانی ئەم سەردەمەی گرتەوە، ئەو کاتەی ئەرکەکەی گۆڕا بۆ جیاکردنەوەی ئاین لە تەواوی ژیان، پاشان پێناسەکەی گۆڕا و فراوان بوو فەلسەفە و سیاسەت و زانستە کۆمەڵایەتی و ئابووری و یاساییەکانی گرتەوە، بۆ هەر یەکێکیان پێناسەی تایبەت پەیدابوو، لەوانە:

١. عەلمانیەت: مەزهەبێکی یاسایی _ سیاسیە بە وەلانانی دەسەڵاتی ئاینی جیا دەکرێتەوە[١].
٢. عەلمانیەت: پەیڕەوێکی دونیاییە، نائاینییە، مەدەنی نائەکلیرکییە، نا یاساییە، نادرێتە پاڵ ڕەهبانیەت، گرنگی بە ئاین نادات[٢].
٣. لە (المعجم القانونی) عەلمانیەت هاتووە بەوەی: دونیایی نا ئاینییە[٣].
٤. لە (المعجم الشامل)ی فەلسەفیدا هاتووە کە: لائیکی و عەلمانیە بە مانای جیهانگەراییە، بە پێچەوانەی ئاینی یاخود کەهەنوتی[٤].
٥. لە (معجم علم الإجتماع) نویێ، (ڕەگەزەکان)ی پێناسەکەی هاتووە بەوەی دونیاییە، نارۆحییە، نائاینیە، وەلانانی و قەتیسکردنی ئیمانە، مەدەنییە، ناپیرۆزە، عەقلانی و سودگەرایە[٥].

---

(١) الموسوعة العربية _ طبعة الأولى ٢٠٠٥، دمشق، هيئة موسوعات. مجلد (١٣) ص ٤٠٣، مادة العلمانية.

(٢) منير بعلبكي، المورد، قاموس إنجليزي _ عربي: الطبعة (٣٣) ٢٠٠٣، ص٨٢٧ مادة: سيكولار.

(٣) حارث سليمان الفاروقي _ المعجم القانوني (انجليزي _ عربي)، لبنان، الطبعة الرابعة / ٢٠٠١م، ص ٦٣٠، مادة سيكولار.

(٤) د. عبدالمنعم الحفنی _ المعجم الشامل للمصطلحات الفلسفية، مكتبة المدبولی، ط ٣ ٢٠٠٠م، ص ٥٦٢ مادة: العلمانية.

(٥) بڕوانة: د. عبدالوهاب المسيرى و عزيز عظمى _ علمانية تحت المجهر، الطبعة الأولى ٢٠٠٠، دار الفكر المعاصر، بيروت، دار الفكر ديمشق _ ص٥٩ _ ٦١

6. Encyclopædia Britannica: any movement in society directed away from otherworldliness to life on earth[1]

٧. لە فەرهەنگییە بیانیەکانیش پێناسەی عەلمانیەت هاوشێوەی ئەمانەی سەرەوەیە، هەروەك لە فەرهەنگی (Oxford) [٢] و فەرهەنگی (Longman) [٣] و فەرهەنگی (Dictionary of modern written Arabic) [٤] هاتووە کە: نائاینی، دونیاگەرایی، پێچەوانەی پیاوانی ئەکلیرکییە..

هەرخودی زاراوەی ئەکلیرکی لە بنەچەدا لە(clerge) هاتوە مانای میرات واتە میراتگری خوایی، ،لەسەردەمی موساش ئەوان میراتگری خوا بوون لەسەر ئەو زەویە کە مولکی خوایەو ئیتر باج وسەرانە بۆ ئەوانە بوو[٥].

**کەواتە مانای عەلمانی** : پاش خوێندەوەی ئەم پێناسانە و قوڵبوونەوە لێیان بۆمان ڕووندەبێتەوە کە عەلمانیەت بە مانای نائاینی دێت، دژ و پێچەوانەی (ڕۆحی _ ئەکلیریکی _ کەهەنوتی) یاخود پێچەوانەی (ئاینییە) بە شێوەیەکی گشتی، یاخود لە کەمترین دۆخیدا بێلایەنە بەرامبەر بە ئاین، ئەمە مانای گشتییە لای ئیسلامی و عەلمانیەکان و بێلایەنەکان لە ناوەندی زانستی تۆماریان کردووە[٦]، هەروەك لە فەرهەنگی ئۆکسفۆرد _ زانستی _ بە زمانی ئینگلیزی هاتووە و عەلمانیەت:

---

[1] Encyclopædia Britannica- Article: secularism
[2] (Oxford _ sixth edutram, 2000 p1155
[3] (Longman _ secular _p 617
[4] (Hans Wehr _ secular_ p 636
[٥] توماس هوبز-اللفياثان الاصول الطبيعة والسياسة لسلطة الدولة ص**٥١٧**
[٦] شبلي عيسى _ العلمانية والدولة الدينية _ وزارة الثقافة والإعلام _ بغداد، ط١ ١٩٨٦م ص١٨.

باوەڕبوونە بەوەی پێویستە ئاین لە دامەزراوە کۆمەڵایەتی و فێکارییەکان دووربخرێتەوە .. تاد[١].

عەلمانیەت گرنگی بە کاروباری دونیا دەدات بەبێ گوێدانە دوارۆژ، کە بە ئینگلیزی بەرامبەر بە سیکۆلارە _ secular پێکهاتووە لە وشەی (سایکۆلۆم)ی لاتینی واتە (ڕۆژگار) یاخود (نەوە) یاخود (سەدە) یان دونیا[٢]. بە زمانی فەرەنسی بەرامبەر وشەی لائیکییە Laique واتا جیهان (دونیایی) پێچەوانەی ئاینی کەهەنوتی[٣]، پێکهاتووە لە وشەی Laizismی لاتینی واتا گشتی یاخود ڕۆلەی گەل، واتا مەدەنی فێرنەکراو پێچەوانەی وشەی Clerc (ئەکلیرك _ پیاوی ئاینی فێرکراو)[٤]، لە ڕۆمای کۆن بەو کەسانە دەوترا (لائیکی _ عەلمانی) کە هیچ پلەیەکی ئاینیان هەڵنەگرتبوو لە کەنیسە[٥]، لە سەردەمی ڕۆشەنگەری و گۆڕانکاری بەسەر کەنیسەدا بەو پرۆسەیە دەوترا (عەلمانی _ سیکۆلار)[٦] کە دەوڵەت سەروەت و موڵکی کەنیسەی خۆماڵی کرد (واتە: کردیە موڵکی دەوڵەت)، بە هۆی لاوازی بێتوانایی لەو سەردەمدا (بەگوێرەی پێوەری یاسایی) زۆرجار عەلمانیەت بە ناشیاوی بێتوانایی کەنیسە لە کاروباری گشتی دەوترێت[٧]، ئەگەرچی هەریەکە لە لائیکی

---

(١) ئەمەش دەقە ئینگلیزیەکەیە: the belief that reliogion shoud not be involved in the organization of society, Education..etc: Oxford _ ibid_ p1155

(٢) العلمانية تحت المجهر _ المصدر السابق ص ٥٩.

(٣) شبلي عيسى _ العلمانية والدولة الدينيية .. المصدر السابق، ص١٨.

(٤) موسوعة العربية .. المصدر السابق، ج١٣ ص ٤٢٣.

(٥) العلمانية تحت المجهر .. المصدر السابق، ص ١٢. كذالك أنظر: د. عبدالوهاب الكيالي _ موسوعة السياسية _ ط ١٩٨٧م، طبعة بيروت ج٤ ص ١٧٩.

(٦) WWW. Standardkurd. com

(٧) موسوعة العربية، المصدر السابق ج ١٣ ص ٤٠٣.

وسیکولاری کەمێك لێکجیان بەلام لێرەوە مانای عەلمانیەت وەك هاوواتای عەقلگەرایی و نوێگەری و سەردەمی بلاوبوەوە .

یەکەم بەکارهێنانی سیاسیشی لە پەیماننامەی ویستفالیا بوو سالی ١٦٤٨ز[١]، لەگەل ئەوەی رەگ و ریشەی زۆر کۆنە _ بە باوەری خۆم _ لە رووی مانا و بەکارهێنان لەم چوار زمانە (لاتینی _ فەرەنسی _ ئینگلیزی _ عەرەبی)، لە زمانی عەرەبیدا دەگەرێتەوە بۆ پێش ئەم مێژووە، کە بۆ گوزارشت کردن لە ناوی ئەنجومەنی جسمانی یەهودی بەکاردەهات، کە ئەنجومەنی جێبەجێکاری دونیایی بوو بەرامبەر ئەنجومەنی رۆحانی (دوارۆژیی)[٢]، لە ئینگلیزی asecular دەگەرێتەوە بۆ لاتینی (هەروەك پێشتر باسمان کرد، لە فەرەنسیش لائیکی دەگەرێتەوە بۆ بنچینەی ئیغریقی لە Laikas[٣] بە مانای رەشۆکی، ئەمەش زاراوەیەکی نزیکە لە کاتی دەرکەوتنی عەلمانیەت، کە دەگەرێتەوە بۆ سەردەمی هارون (د خ) کە یاسا و کۆت و بەندەکان بەسەر کاهینەکان دەسەپێندران بەسەر ئەوانی تر نەدەسەپێنران لە لاوییەکان[٤]، یاخود جەماوەر بە گشتی، ئەوانە پێیان دەوترا (لائیکیەکان)، دونیاییەکان، (عەلمانیەکان) (پێچەوانەی کەهەنوت)، کاتێك سەردەمی رۆشەنگەری دەستی پێکرد لە ئەوروپا یەکەم داواکاری جیاکردنەوەی ئاین بوو لە دەولەت، بۆ ئەوەی هەموو خەلکی ببێتە لائیکی (یاخود عەلمانی)، تەنها بۆ دونیا کار بکات[٥]

---

(١) العلمانية تحت المجهر .. المصدرالسابق ص ١١–١٢.

(٢) کارکردن لەم ئەنجومەنانە لە عێراق تا سەردەمی پادشایەتی هەر بەردەوام بوو، لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەم دەسەلاتە یاساییەکەی لە (إرادە فرمان) وەرگرت کە لەلایەن سولتانەوە لە سالی ١٨٤٨ دواتر یاسای ئاینزای یەهودی دەرچوو ژمارە: ٧٧ سالی ١٩٣٠ لە الملكيه : بروانە: حەنا بەتاتو ( عێراق بەرگی ١ ل ٢٩١).

(٣) معجم الشامل المصدر السابق ص٥٦٢.

(٤) رجل من أبناء عشيرة لاوی المكرسين لمساعدة الكهنة (جدول وشروح _ الكتاب المقدس _ مادة: لاوی).

(٥) معجم الشامل– المصدر السابق ص ٥٦١ _ ٥٣٢.

هەروەك پیناسەکەی مەوسوعەی بریتانی سەروو، ... بەم شێوە زاراوەی عەلمانیەت دەرکەوت و بڵاوبوەوە.

یەکەم کەس لە جیهانی ئیسلامی لائیکی فەرەنسی بۆ (عەلمانیەت) وەرگێڕا (لویس باستر _ میسری) بوو لە فەرهەنگەکەی (فەرەنسی _ عەرەبی) ساڵی ١٨٢٨ز [١]، لە بنەڕەتدا عەلمانیەت زاراوەیەکی تایبەتە بە یەهودی هیچ پەیوەندی بە زانست و عیلمەوە نییە، زۆرجار ئەم وەرگێڕانە تێکەڵەیەك لەگەڵ مەزهەبی زانستی دروست دەکات، وەك ئەوەی عەلمانیەت ئاماژە بێت لەسەر شوێنکەوتنی هەنگاوە زانستیەکان بەرامبەر نکۆڵیکردن و پشتێکردنی، تا ئێستاش لەسەر ئاستی جیاواز جیاواز خەڵکی توشی ئەم تێکەڵکردنە بووینە، موحەمەد مهدی شەمسەدین دەڵێت: ((وێژەی عەلمانیەت کە نزیکە لە وێژەی(علم)و زانست زۆرێك لە عەمامە بەسەرەکانی خەڵەتاندووە، لەبەر ئەوە پاڵپشتی ئەم بانگەشەیان کردووە)) [٢]، ئیسلامیەکان بە تەنیا نین لە توشبوون بەم تێکەڵکردنە، بەڵکو دەبینین هەندێك فەرهەنگ و پسپۆڕ توشی هەمان دەرد بوونە، بۆ نمونە دەبینین فەرهەنگی حزبی بەعس (تعریفات ببعچ المصگلحات) لە مادەی (العلمانیە) ئەمەیان نووسیوە: ((عەلمانیەت وشەیەکی لێکدراوە لە (العلم) زانست و (العالم) زانا بە پێچەوانەی پیاوی ئاینی)) [٣]، لە (المعجم الشامل) بە مانای زانست (العلم) هاتووەو وا نووسراوە: ((لەوانەیە وشەی عەلمانیەت (علمانیە) بە (ژێرەی عەین) لە زانست (العلم)ەوە هاتبێت، ڕۆشەنگەری لەسەر زانست سەریهەڵدا واتە زانستی دونیا

---

(١) ینظر: أ_د محمد عمارة _ معركة المصطلحات ، مادة العلمانیة      ب_ لێکۆڵەر _ هەڵبژاردن لە نێوان عەلمانی و ئیسلامی ٢٠٠٥ز هەولێر لاپەڕە ١٣ _ ١٤.

(٢) العلمانیە _ المصدر السابق ص ٨٧.

(٣) تعریفات ببعض المصطلحات _ مكتبة الثقافة والإعلام لحزب البعث االعربي الإشتراكی، مادة، العلمانیة ص٨.

نەوەك زانستی ئاین)[١]، پەرتوکی تر هەن هەمان پەیڕەویان گرتۆتەبەر، مەبەستیان لەمە دەرخستنی ململانێی عەلمانی و ئاینی بووە وەك ئەوەی لە نێوان زانست و نازانستی بێت، یاخود نەزانین و بێئاگایی لێی بەهۆی نزیکی عەلمانیەت لە ڕووی وێژەوە لە علم، هەر جۆرێك بێت هەڵبژاردنی وێژەی عەلمانیەت، هەڵبژاردنێکی سەرکەوتوو بووە، خزمەتی پڕۆژەی عەلمانیەتی کردووە لە جیهانی ئیسلامی و عەرەبی، ئەگەر پێناسەی (باستەر) مەبەستدار بوو بێت یاخود نا.

(١) أ_ معجم الشامل .. المصدر السابق ص ٥٦٣ ب_ قاموس التربية _ مادة secular ج_ (تيارات الفكر الغربي المعاصر _ ص ٣٥)

## باسی دووەم: سەرهەڵدان و گەشەکردنی عەلمانیەت

### ڕیشەی فەلسەفی عەلمانیەت:

لەسەرەتادا عەلمانیەت سیستەم نەبوە وەك ئیستا، زیاتر ئەوانە بووینە کەلە فکری فلسفی بۆچوونی تایبەتیان هەبوە لەبارەی پەیوەندی خوا بە سروشت یان هەر لەسەر خودی ئیمان ، ئەو کاتی دەهریان پێدەووترا وەك(جیمس پروير) لە کتێبەکەی (الإلحاد الغربي Western Atheism) دەهری لەپێش سوکرات دەست پێ دەکاو هەریەکە لە(هرکلیت و ئەناکسیمینس و ئەبیکۆڕ و ئەناکسیماندر..) دەهریان پێ وتراو ە[1]،زۆربەی جار بەرامبەر ئاینەکان وپیغمبەران وەستاون، هەرچەندە لایەنگرانی عەلمانی ئیستا لە تەقەلایەکی بێووچانن بۆ ئەوەی خۆیان لە بێدینی دورخەنەوە ،بلێن عەلمانی لەگەل مولحیدی لێکجیایە ، بەلام نەیان توانیە ،چونکە ڕیشەکەی لەویٚ دێت ئەگەر چی لەو سەردەمە عەلمانی باوەڕداریش گەلێ زۆرە لەهەمو ئاینەکان ، ڕاستە مولحید و گوماندار وبێئاین و..هەموی لیکجیان ،خەریکە بلێین مولحیدی تەواو نەبوونی هەبوە نە دەبیێ ،دوای ووردبوونەوە لەنوسینەکانی ئەوانەی ناویشیان نراوە مولحید دەردەکەویٚ زیاتر گومانیان هەبوە نەك مولحیدی تەواو،هەندیکیان باوەڕیٚکیان هەیە لەگەل ئەو سەردەم ناگونجیٚ ،سوکرات و جۆردانۆ و.. تەنانەت زینفۆن(٤٣٠ پ ز)یش کە بە مولحد ودەهری ناوزەد کراوە کەچی ئەو بەرجەستە کردن وبەمرۆڤ چواندنی خوای ڕەتکردەوە ،ووتی ئەورووپا وادەزانن چاوی خودا شینە ،ئەفریقی بە ڕەش ،ئاسیای سەروو چاوی خودا بچوك ..،ئەوانەی ڕەت کردەوە ناویان نا مولحیدە ،ئەوانی تریش زیاتر (دوودلـن نەك مولحد) هەتا

---

[1] مانای دەهری لە سەرچاوە جیاجیاکان بەو شێوەیە هاتوە:أ-لسان العرب (ابن منظور مادة: دهر): الدهر اسم المدة العالم(عمر الدنيا)، رجل الدهري أي الذي لا يؤمن بالآخرة./ ب- راغب الأصفهاني في (مفردات الفاظ القرآن- مادة: دهر) رجل الدهري أي الذي لا يؤمن بالآخرة./ ج- منجد ص٢٢٧، الدهري هو الملحد.

(دیگۆراس)کەبەیەکەم موحلدی ئەورووپی هەژمار دەکریت دەردەکەوێ موحلد نەبوە دوودلی وگومانی هەبوە ،بۆیەش ئەو ئامارە زیاتر نزیکە لەڕاستی کەدەلێت ئیستا رێژەی موحلید(موحلیدی ڕەها) تەنها لە٢٪ی جیهانە[1]، بەلام ئەوەی زۆر بەربلاوە تا ئیستاش دەهریە ،یان نەچەرالیزم(naturalism)، لەبەر ئەوەی پانتاییەکی زۆری عەلمانیەتیش بە ڕەچەلەکی فلسفی دەچیتەوە سەر دەهری، ئەوانە ڕایان وابوە ئەو بونەوەرە دەکرێ دروست بێت بیٚ ئەوەی پێویستمان بە خوا و (خالق) و دروستکارێك هەبێ،دەشکرێ بەردەوامیش بێت بەهۆی سروشت، ئەوە ڕای کۆنی (دەهریەکان) و بوە ڕای هرکلیتیش کە وتبووی(بوونەوەر یەکەوکەسیش دروستی نەکردوە، هەرواش دەمێنێتەوە، بەرێك وپێکی دەگۆڕێ)[2]، لەدواییش دەقی ئەو گوفتەیە لەلایەن فریدریك ئەنجلیس لەسەردەمی نوێ هاتوەودەلێت: دەتوانین لەو گەردوونە بگەین چۆن دروست بوە و چۆن کار دەکا بیٚ ئەوەی پێویستیمان بە خودا (یان هەر زیادەکی نامۆ هەبیٚت) ، لاپلاس و هۆلباخ وزۆری تر وەك لینین ووتویانە: هەرچی هەیە بریتیە لە مادەی جولاو[3]،بەو شێوەیە دەهری کۆن ومادی سەردەم یەك ناسنامەی فکری فلسفیان هەیە ،کە هەردوولایان زەمینەی فکری وفلسفی بۆ سیستەمی سیاسی عەلمانی پێك دەهێنن.

عادەتەن ئەو جۆرە زاناوبیریارانە لە خزمەتی دەسەلاتێکی ستەمکاربووینە ،دژی ئازادی ودیموکراسی ئەو سەردەمی بووینە ، فەیلەسوفی یۆنانی کۆن (هرکلیت) هەم دەهری بوە هەم دژبە بنەمای ئازادی و دیموکراسی بوە، ،لایەنگیری دوور خستنەوەی ئاین وئەخلاق وبەزەیی بووینە لەکارەکانیان ...بۆیە عەلمانیەتیش لە

[1] بۆ ئەو رێژەیە بڕوانە:دعدنانابراهیم– مدخل الى معرفة الالحادوبرهان النظم (مطرقةالبرهان وزجاج الالحاد) ص٢٣

[2] ملاحظات فلسفیة- ط روسیة ص٣١٨

[3] لینین –مؤلفات ص١٦٢

بنەچەدا گەلالەی دەسەلاتی ستەمکاربوە ، یەکەم زانا کە هەوڵی جیاکردنەوەی ئایین و سیاسەتی داوە سینکا(٤-٦٥م) فەیلەسوفی دەهری رۆم بووە[1]، لەقازانجی دەسەلاتی ستەمکاری رۆم ،زینۆن(٣٠٠ پ.ز) بۆ پاپای ئەسینا، مارکۆس ئۆلیتۆس وئیکتیپۆس(٦٠-١٢٠) بە نۆکەری ئیمپراتۆر بە ناوبانگ بوو.. ئەوانە بە (ستۆیلی)ناوزەد دەکران واتەماستاوچی ، بە هەمان شیوە میکاڤیلی بۆ بنەماڵەی حوکومداری مدیتچی وئاواش لاپلاس وهۆبز و... زانای هۆڵەندی هۆگۆ گرۆتیۆس(١٥٨٣-١٦٤٥)بە دامەزرینەری یاسای دەولی وسیستەمی عەلمانی هەژمار دەکریٚ کەچی لایەنگری کۆیلەداری بوە.. وزۆری تر،رۆفائیلی هونەرمەند وینەی ئەرستۆ و ئەفلاتونی لەتەنیشت یەك وا دروست کردبووئەفلاتون ڕووی لە ئاسمان و ئەرستۆش رووی لە زەوی بەو مانایەی یەکەمیان لاهوتی و دوەمیان ناسوتی، یان سادەتر یەکەمیان ئاینیانەودوەمیان عەلمانیانە، ئەفلاتون ئاینی ولەڕیزی میلەت بوە وەك جون لویس دەڵیٚ دەنگی میلەت وشاری بوە، ئەرستۆش لە خزمەت داگیرکەریٚکی وەك فیلیپی مەقدونی[2]، دوایش بوە فەیلەسفی رەسمی ئیمپراتۆریەت وماموٚستای ئەسکەندەری مەقدۆنی مونەزیری دەولەتی بەندایەتی بوو، سینکای دوەم ماموٚستای نیرۆنی زۆردار بوو کەدوای خۆی دەماری بڕی وسینکای کوشت[3]، سەرەڕای هەمو ئەو ڕاستیانەش مانای ئەوەنیە سەرچاوەی عەلمانی مولحیدی بیٚت ، نە ئەوەشە گوایە بیلایەن بوو‌بیٚت ،نەخیٚر،بە ووردتر بۆ دیاری کردنی ناسنامەی فکری وفلسفی عەلمانی دەبیٚ بگەڕیٚنەوە سەر ڕوانگەی سیٚ جۆرە بیرکردنەوەی لەبارەی (خوداو دروستکەرەوە )لەمەدرەسەکانی یۆنانی کۆن بەو شیٚوەی خوارەوە :

١- ئینکاری خواو حوکمی سروشت ئەوە فەلسەفەی مادیەکانە بریتی بوون لە

---

[1] موسوعة علم الإجتماع ص٣٣٩

[2] سبينوزا-رسالة فى اللاهوت و السياسة ص٢١١

[3] د.عدنان على رضا النحوى- المسلمون بين العلمانية وحقوق الأنييسان الوضعية، ط ١ ١٩٩٧م، ص١٠

(هرکلیت، دیموقریتس، لویکیب ، ئەناکسیمینس ، ئەبیکۆر ، ئەناکسیماندر..) هەریەکە بەجۆریك باوەڕی بەوە نەبوو خودا داهێنەری بوونەوەرە، دیموکریت ولوکریشیس ووتویانە بناغەی هەموبوونەوەر ئەتۆمە نەك خودا[1].

٢- پێیان وایە خودا هەم دروست کەرە هەم حوکمیشی ڕاستەوخۆیە لەسەر ژیان وبیٚ ژیان وسروشت، ئەوەیان زیاتر ڕای ئاینیە پەتیەکانە، نزیکە لە سیستەمی سیۆکراتی،فیساگۆرس وسوکرات و..

٣- خوا دروستکارە بەلاّم هەقی بەسەر گەردوون و بونەوەر وسروشت نەماوە، لێرە ئەبیقور لە موحلیدی پلەیەك دادەبەزیٚ و دەڵێ لە خوای ناوەشێتەوە حوکم لەو بوونەوەرە لەسەر مارو بۆق وئاوو ئاگر بکا و خۆی بچوك بکاتەوە وازی لێهێنایە[2]،ئەوانە گەلیٚ زۆرن ئەرستۆ پیشرەویانە زیاتر دیزمیان پێدەووتریٚ ،

ناسنامەی عەلمانیەتی ئیستالەو بەشەیە(لە جۆری سێیەم)،جۆریکە لەدیزمی، لەسەردەمی نویٚ (هربرت تچیرپۆری ١٥٨٣-١٦٤٨)بەیەکەم دامەزرێنەرەوەی دیزمی هەژمار دەکریٚ[3]،دیکارتیش یەکەم کەسە کە یاساکانی سروشتی ئاوا دارشت ودەڵیٚ:خوا سروشتی دروست کردوە ووازی لیهیناوە،سروشت وژیان بیٚ خودا کاری خۆی بەهۆی یاساسروشتیەکان دەکا، بۆیە لە تویژینەوەی (خواوەند) تەنها بۆ یەکەم

[1] لە کتیبی (دیالکتیك الطبیعة ص٢١٦ )دەلیٚ یەکەم زانا کە ووتی جیهان لە ئەتۆم پیك هاتوە لۆکیبۆس بوو نەك دیموکریتیس، لە ص٥٧ یش دەلیٚ ئەوەی کیشی ئەتۆمیشی دۆزیەوە دالتون نەبوە بەلکودیوجین لایرسی بوە.

[2] موسوعة الفلسفية المختصرة ـ ص٢٢

[3] موسوعة الفلسفية السوفيتية ص٢٢٧

پرۆسەی (خلق) پیویستە[١]، وەك وەسفی (ویل دیورانت) خودا بە سیستەمی(مەلەکی دەستووری) شای بەریتانی چواندوە چۆن خاوەنە نەك حاکم ئەویش هەر دروست کەرە نەك فەرماندەرد،ەتوانین بلێین فکری عەلمانی بەگشتی پشت بەو فەلسەفەیەو ڕایەی سێیەم دەبەستێ ،وەك بەشێك لە لێك جیاکردنەوەی (حاکم) و (خالق) ئایین بۆ خودا و حوکمیش بۆ ئادەمیزاد، خلق بۆ خودا وئەمر بۆ مرۆڤ، لە سروشتیش (خلق) بۆ خوا و بەڕێوەبردنیش بۆ سروشت.دیزمیەکان لە فەلسەفەی یۆنانی.. تادەگاتە عەلمانیەتی ئەو سەردەمە کە دەڵێن (خلق) بۆ خوا دەگەڕێتەوە بەڵام(امر) بۆ ئێمەیە بە پیچەوانەی (أَلَا لَهُ الْخَلْقُ وَالْأَمْرُ)، کاروباری ئاسمانی بۆ خواو زەویش بۆ ئێمە، دەیانەوێ بلێن ئەودنیایەی نزیك لە ئێمە –سروشت وژینگەی ژیان وەك بونەوەر نیە هەمو کارەکانی لەدەست خۆی بێت، بەو شێوەیە هەروەك چۆن عەلمانیەتی ئیستا لە لیکجیاکردنەوەی ئاین وسیاسەت هاتوە ،فکری فلسفیەکەشی لەو لیکجیاکردنانەوەی سەروو هاتوە ،ئەوەش ناسنامەی فکری فەلسەفەیەکەیەتی.

---

[١] الفیزیاء ووجود الخالق ص٢٥

## سەرهەلدانی عەلمانیەت

لە ڕووی مێژوویی و کات و شوێنەوە گێڕانەوەی جیاواز هەیە لە بارەی سەرهەڵدانی زاراوەی عەلمانیەت ، هەروەها بۆچوونەکان جیان لەبارەی یەکەم بەکارهێنانی ئەو زاراوەیە، ناوی هەریەکە لە (میکافیلی و سپینۆزا و هۆبز و هی تریش)دێت هەروەها لە بنەمای شۆڕشی فەڕەنسی، بەشێکیش بۆکاریگەری شۆڕشی ئەمریکاش لەبینا کردنی دەولەتیان ڕوون تر لەوە دێت کاتێ ویلایەتی ڤیرجینیالە سالی ١٧٨٩ ویستی ئاینی فەرمی مسیحی بێت، جیفرسۆن ڤیتۆی دژ بە بەکارهێنا بۆ ئەوەی دەستور جێی بنەماکانی مسیحی ودەسەلاتی کنیسە بگرێتەوە و بوە هۆی لێك جیاکردنەوەی تەواوی ئاین لە دەولەت بەشێوەی فەرمی، دوایش ناوی نرا(اعلان الحقوق)، ئیتربەشێك لە زانا و فەرهەنگە کۆن و نوێکان ئەو سەرەتایانە بەمێژووی سەرهەڵدانی عەلمانیەت دەژمێرن[١]،بەڵام زۆربەی لێکۆڵینەوە و توێژینەوە زانستیەکان بۆ ئەوە دەچن چەمکی عەلمانیەت دەگەڕێتەوە بۆ پەیماننامەی ویستفالیا[٢]،یەکەم جار وەك ناو لەوێ هاتوە،لە مەوسوعەی بریتانیش واهاتوە بەلام باسی سیاسی عەلمانی نیە بەلکو بەجۆریکی ترە ئەوە دەقەکەیەتی( and it was decreed that all secular lands...)[٣] ، ئەم پەیماننامەیە پاش جەنگی ئاینی و ڕەگەزی و مەزهەبی هات لە ئەورووپا (کە بە جەنگی سی ساڵی ناونرا) ١٣٥ ئەندام بەشداری ئەم پەیماننامەیان کرد، کارەکانی لە ١٤/ دیسێمبەری ساڵی ١٦٤٤ز دەستپێکرد و لە

[١] کتێبی (تیارات الفکر العربي المعاصر ص٢٠٤) زیاتر بەلای شۆرشی فرنسیة نەك شۆرشی ئەمریکی .

(٢) تعریفات ببعض المصطلحات _ مکتبة الثقافة والإعلام لحزب البعث االعربي الإشتراکی، مادة، العلمانیة ص٨.

[3] Encyclopædia Britannica- Article: Westphalia

٢٤ ئۆكتۆبەری ساڵی ١٦٤٨ز كۆتایی هات بۆ یەكەم جار زاراوەی (سیكۆلار _ عەلمانی) لێبەكارهات [١] ، هەندێك لەم بنەمایانە ئەمانە بوون:

١. دانانان به سەروەری و سەربەخۆیی وڵاتانی ئەندام.
٢. یەكسانی و پێدانی ئازادی ئاینی به كاسۆلیك و پرۆتستانت و كالفینیەكان[٢].
٣. دابەشكردنی ئەو زەویانەی كه ناكۆكیان لەسەره له نێوخۆیان.
٤. لەگەڵ ئەوەی ئیسپانیا رەتیكردەوە ئیمزا لەسەر ئەم پەیماننامەیه بكات، بەڵام دانینا به سەربەخۆیی هۆڵەندا، بەرهەمی ئەم پەیماننامەیه دووباره له نوێوە رێكخستنەوەی ئەوروپا بوو، دەوڵەتی نەتەوەیی و دەوڵەتی بچوك (به تایبەت له ئەڵمانیا) و كەنیسەی تایبەت دەركەوتن، به ئەمەش زاڵبوونی لاهوت بەسەر عەقڵ كۆتایی هات[٣].

بێگومان ئەم زانایانەو (ئەوانەی پێشتر ناومان هێنان: میكیافیلی، هۆبز، سپۆنزا ..) و پەیماننامەی ویستفالیا، رۆڵی گرنگیان گێرا له پتەوكردنی چەمكی عەلمانیەت، بەڵام رووكاره كۆنەكەی هەبوە ئەگەر بەم ناوەش نەبێ ، لایەنێكی لەو ململانێییە مێژوویيه (خراپه و چاكه، نوێ و كۆن، ئاینی و بێ ئاینی ...) بریتی بوه له

(١) ینظر: أ–العلمانية تحت المجهر ·· المصدرالسابق ص١١–١٢ ب–الموسوعة العربية العالمية .. المصدرالسابق ج١٦ص٤١٥ / ويستيفاليا مدينة تقع غرب ألمانيا.. ج– Encyclopædia Britannica- Article: Westphalia

(٢) العلمانية..– المصدر نفسه –و الصفحةنفسها.

(٣) ویل دیورانت _ قصة الحضارة، اعداد: سهيل محمد ديب، مؤسسة رسالة: الطبعة الأولى بيروت ج٣ ص٥٣٠ ..

عەلمانیەت، بەم شێوەیە بنەماکانی عەلمانیەت لە دژی ئاین لە قوڵایی مێژوو دەبینین، هەندێ ئینسکلۆپیدیا و توێژینەوەی تایبەت بە فەلسەفەی مێژووی یەکەم فەیلەسوفی دژ بە (ئایین و باوەڕ) دەگێرنەوە بۆ مەدرەسەی هندی و دەڵێن یەکەم موحلید (سومخیا) لە (٤٥٠ پ ز) بوە، بەشێکی تر بۆ مەدرەسەی یۆنانی لەوێش بۆ حەکیمی گەورە (پیلاس ٥٥٠پ-ز) یان دیاگراس ٥٠٠ پ-ز، ناوی هەریەکە لە (ئەناکسیۆگوراس٥٠٠پ-ز، ئەناخسیماندەر، تیۆدۆرس، گریتۆس، ئەبیکۆر(٣٤١-٢٧٠ پ ز)، (شیشرۆن ١٠٦- ٤٢ پ.ز، هاتووە، هەر لەوانەش مەدرەسەی (نازانم- گومان) ی موحلیدی سەری هەلداوە، ئەنجلس(١٨٢٠-١٨٩٠) دەڵێت: ئەبیکۆر مەزن ترین مادی موحلیدی فەلسەفەی یۆنانیە[1]، هەر (سینکا ٥-٦٥ز)ش بەیەکەم جیاکەرەوەی ئایین لە سیاسەت هەژمار دەکرێت، لەوانەیە دۆزینەوەی ڕەگەزەکانی عەلمانیەت لە قوتابخانە فلسفیەکانی یۆنانی بدۆزینەوە هەتا لە ڕەوتی میانگیریشی، کە هەڵسان بە گونجاندنی نێوانی فەلسەفەی خواناسی[2][3] و فەلسەفەی بێباوەڕی[4] ، ووتیان: ڕاستە خوای گەورە دروستکەرە، بەڵام دونیای بۆ مرۆڤ جێهێشتووە[5]، لەوەوە ڕەوتی (دیزم _ پەروەردگاریتی

---

[1] دیالکتیك الطبیعة -فهرس الاعلام ص٣٧٨

([2]) لە یاسا و ڕێساکانی (جۆن کالفن ١٥٠٩_ ١٥٦٤) دروستبووە لە میانەی پەرتوکەکەی بە ناونیشانی (أنظمة الدین المسیحی) دانینەدەنا بە دەسەڵاتی پاپا، هەوڵی بەدیهێنانی حکومەتێکی دەدا کە پشت بە شەریعەتی خوا ببەستێ بەبێ هیچ شتێکی تر ئەویش پەرتوکی پیرۆز بوو _ سەرچاوە : الموسوعة السیاسیة، ب١ ل ٤٣٣.

([3]) لە پەرتوکی _ الملل والنحل_ی ئەبو فەتحی شیرازی هاتووە: فەلسەفەی یۆنانی سەرچاوەکەی سروشە، فەیلەسوف (ئەنبادقلیس) زانستی لە (داود) وەرگرتووە، فیساگۆرس لە حەزرەتی سلێمان ...تاد. بڕوانە: لاپەڕە ٦٧ و ٧٢.

([4]) ئەمانەش ئەم فەیلەسوفانە بوون: تاڵیس، ئینکسیمانس، هرقلیت، دیموقریتس، ئەبیقۆر، ئەکسینۆفان .. بۆ زیاتر بڕوانە: موسوعه الفلسفه ص٤٦٧.

([5]) ئەمەیان بە شاژنی بەریتانیا چواندووە کە خاوەندار و شاژنە بەڵام دەسەڵاتی لە دەستدا نییە، بەم شێوەیەش خوای گەورە دروستکەرە و دەسەڵاتدار نییە.

Diesm)سەری هەلدا، کە زاراوەیەکی ئیغریقیە واتا پەروەردگار، بە پێی(موسوعە لالاند) یەکەم کەس زاراوەی (دیزم)ی هێنایەوە کایەوە (فیریە)بوو لەسالی ١٥٦٤لەبەرگی دوەمی کتێبەکەی( chritiemt instraction )[١]، بەلام لەسەردەمی نویێ (هربرت تچیرپۆری ١٥٨٣-١٦٤٨)بەیەکەم دامەزرێنەرەوەی دیزمی هەژمار دەکریێ[٢](وەك لەپیشوو تر ووتمان)، دواتر بووە ئایدۆلۆژیای ئاینی کە دانینا بە بوونی خوا تەنهاوەك دروستکەر نەك بەڕێوەبەر، واتە خودا وازی لە دونیا هێنا بۆ مرۆڤ (بەگوێرەی باوەڕی ئەوان)،دەگۆتریێ یەکەم فەیلەسوف کە ووتی خوا جیهانی دروست کردوەو دوای وازی لێهێناوەو پشت گوێی خستوە ئەبیکۆری یۆنانی بوە[٣]. بەو شێوەیە (مارتن لۆسەر) بۆچوونی نزیك لەم بۆچوونەی هەبوو، دەلێت: ((خوای گەورە ئەندازیاری دروستکردنی ئەم بونەوەرەیە وەك شانۆ بۆ مرۆڤی بەجیێ هێشتووە))[٤]، ئەم تیۆرە عەقلێ پیاوانی ئاینی گرتەوە و (قەشە ولیەم سامبل) لە کەنیسەی کەتنبری لە بەریتانیا دەلێت:(خوای گەورە بە تەنیا ئاینی دانەناوە، بەلکو مرۆڤیش بەشداری کردووە) [٥]، ئەم بۆچوونانەش نزیکن لەو بۆچوونانەی عەلمانیەتی ئەم ڕۆژگارە ، کە جیاکردنەوەیەکی ئاشکرا لە نێوان ئاین و دونیادا کراوە، لەبەر ئەوە وا دادەنرێت کە عەلمانیەتی سەردەم درێژکراوەی هزری یۆنانی کۆنە، موحەمەد مهدیشەمسەدین دوورتر لەمە ڕۆیشتووە کاتێك دەلێت: ((ڕەگ و ڕیشەی عەلمانیەت دەگەڕێتەوە بۆ کۆمەلگاکانی یۆنانی و ئیمپڕاتۆریەتی

---

[١] موسوعة لالاند الفلسفية ص٢٥٧ .

[٢] موسوعة الفلسفية السوفيتية ص٢٢٧

[٣] الموسوعة الفلسفية المختصرة ص٢٢.

([٤]) شبلي عيسمي – علمانية ودولة الدينية.. ص٢٢.

([٥]) هه لبزاردن له نيوان عه لماني وئيسلامى. ص١٣.

ڕۆمانی پێش مەسیحیەت))، زیاد لەوەش دەڵێت: ((عەلمانیەتی نویٚ هیچ نییە تەنها وێنەیەکی عەلمانیەتی کۆمەڵگەی ڕۆمانی بتپەرست نەبێت)) [١].

قۆناغێکی تر ( هاوشێوەی عەلمانیەت) پاش سەردەمی فەلسەفەی یۆنانی هات بە ناوی ڕۆژگارپەرست (دەهری)ـیەکان هەروەك قورئانی پیرۆز باسی دەکات وەك هزرێکی دژە ئاین، واتا ماددەگەرایی سروشتی[٢]﴿ وَقَالُوا مَا هِيَ إِلَّا حَيَاتُنَا الدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا يُهْلِكُنَا إِلَّا الدَّهْرُ وَمَا لَهُمْ بِذَلِكَ مِنْ عِلْمٍ إِنْ هُمْ إِلَّا يَظُنُّونَ ﴿٢٤﴾﴾ الجاثية. واتە: (خوانەناسان دەڵێن: ژیان تەنها ژیانی ئەم دونیایەیە، دەمرین و دەژین بە نۆرە هەر ڕۆژگار و زەمانەن کاریگەرن تیاماندا و دەمان مرێنن جا ئەوانە وەنەبێت لەسەر بنچینەی هیچ جۆرە زانستی و زانیاریەك ئەوە بلێن، بەڵکو تەنها پشت بە گومان و دوودڵی دەبەستن). لە تەفسیری (في ظلال القرأن)دا هاتووە: ((ڕۆژگاپەرستەکان (دەهرانیەکان) ڕەوتی گومانگەران، ئەو خەڵکانەن کە دوارۆژ و قیامەتیان لا گرنگ نییە، بەڵکو تەنها دونیایین))[٣]، گومانگەراش کۆنن لەوەتەی مرۆڤ بوونی هەیە بەرامبەر دڵنیایی کە پێغەمبەران هێناویانە،یەکەم قوتابخانەی بیرۆنی گومانگەراش لە ساڵی (٣٦٥ _ ٢٧٥ پ. ز) لە یۆنان دامەزرا[٤]، لەسەدەی شازدەهەمیش مەزهەبی گومانگەرا دەرکەوتەوە وەك پاڵپشتیەك بۆ عەلمانیەت.

---

([١]) العلمانية... المصدرالسابق ص٨٣.

([٢]) مانای دەهری لە هەر یەکە لەم فەرهەنگانەی خوارەوە بەم شێوەیە هاتووە: أ/ (لسان العرب، ابن منظور مادة: دهر): دەهر ناوی مادەی جیهانە (تەمەنی دونیا)، پیاوی دەهری واتە ئەو کەسەی باوەڕیان بە دوارۆژ نییە. ب/ راغب الأصفهاني لة (مفردات الفاظ القرأن _ مادة: دهر) پیاوی دەهری ئەو کەسەیە کە باوەڕی بە دوارۆژ نییە. ج/ منجد لاپەڕە ٢٢٧، دەهری کەسێکی بێباوەڕە.

([٣]) سيد قطب – في ظلال القرآن، الطبعة (١٠) دار الشرق ج٥ ص٣٢٣٢، كذ لك جاء فى تفاسير (روح البيان ج٨ ص٤٤٩ و(مختصر تفسير الطبرى –) واخرين متفقين على معنى المذكور.

([٤]) د.عدنان على رضا النحوى– المسلمون بين العلمانية وحقوق الأنبيسان الوضعية، ط ١ ١٩٩٧م، دارالنحوى للنشر–رياض ص ٣١– ٣٢.

ئەم پێکەوە بەستنەوە لەنێوان عەلمانیەت و ڕۆژگارپەرستەکان تەنها لای ئیسلامیەکان نەهاتووە، (شبلی عیسمی) لەبارەی ڕۆژگارپەرستەکان(دهری) نووسیویەتی: (...بزوتنەوەی زەندەقە و ڕۆژگارپەرستەکان لەم خاڵەدا لەگەل مادییەتی بێباوەڕی بە یەکدەگەن لەگەڵ عەلمانیەتە توندڕەوەکان)[١]، لەسەر ئەم بنچینەیە جەمالەدین ئەفغانی لە پەرتوکەکەی (رد علی الدهريين) وەڵامی هەریەکە لە فۆلتێر و ڕۆسۆ و بنەماکانی شۆڕشی فەڕەنسی داوەتەوە[٢].

شۆپنهاوەر باسی ڕۆژگارپەرستەکان دەکات دەیبەستێتەوە بە ڕابردووەوە دەڵێت خوای گەورە نەهاتۆتە بوون بەڵکو دێتە بوون (ليس متحققا بل ستحقق)[٣]، واتە: هەمووان بەشدارن لە تێگەیشتنی ناڕوون بۆ بەدیهێنەر و دروستکەر تاوێك بە ئامادەنەبوونی تاوێکی تر بە وازهێنان لەم دونیایە تاوێکی تر بە تەواوی نکۆڵیکردن، ئەوان وەك موشریکانی عەرەب بوون ئەوانەی کە دژی بانگەوازی پێغەمبەر ( د خ)) وەستانەوە بە هەمان وتە،لەبەر ئەوە لە (مفردات ألفاظ القرأن) هاتووە کە موشریکی عەرەبەکان ڕۆژگارپەرستەکانن[٤].

ئەم هزرانە (دەهری ودیزم و موشریك و ...ڕۆژگارپەرستی و پەروەردگاریێتی و ئاینە دەستکردەکان) کاریگەری زۆریان لەسەر هزری مرۆڤایەتی دانا بە هەمان

---

(١) العلمانية والدولة الدينية .. المصدرالسابق ص ٣٦.

(٢) د.محمد عمارة – أعمال الكاملة.لجمال الدين الأفغانى، ط ١ ١٩٧٩م "المؤسسة العربية للدراسات والنشر – بيروت ج١ ص ١٠٨.

(٣) عبدالرحمن البدوي– شلنج، الميثالية الألمانية– دار النهضة العربية –القاهرة\١٩٦٥م– ص٣٦٦ . ❁نیتشە لە پەرتوکەکەی (هكذا تكلم الزرادشت) باسی ڕەوڕەوەی بوون دەکات کە مانای دەهری عەلمانیەت چییەت، پاش هەموو گۆڕانکارییەکان ڕەوڕەوەی بوون تا هەتاهەتایە بەردەوام دەەبێت .. ❁زۆربەی عەلمانیەکانیش بەم شێوەیە باسی دەهرییەکان دەکەن ( نا کۆتایی جیهان _ هەربوویی جیهان) وەك کات و شوێن.

(٤) راغب الأصفهاني .. المصدرالسابق ص ٣٢٠.

شێوەش لەسەر هزری ئاینی[١]، كە ڕۆڵی ئاینیان لە نێوان تاك و پەروەردگار كورتكردەوە(دين شخصي)، بەم شێوەیەش ڕەگەزێكی سەرەكی عەلمانیەت پێكدێنن، لەبەر ئەوە دەبینین زۆربەی هزرە فەلسەفی و سیاسی و كۆمەڵاتیە باوەكان لە ئەوروپا كە بۆ بڵاوبونەوەی عەلمانیەت لە دایكبوو بە تایبەت لە سەردەمی ڕابوون (چاكسازی) و ڕۆشەنگەری ڕەگ و ڕیشەی دەگەڕێتەوە بۆ قوتابخانە یۆنانی و ڕۆمانیە كۆنەكان[٢]، یەكەم كەس كە بانگەشەی بۆ جیاكردنەوەی دەسەڵاتی سیاسی لە دەسەڵاتی ئایینی كرد زانای ڕۆمانی (سینكا ٤پ. ز _ ٦٥ز) بوو[٣] و دواتر ڕەگ و ڕیشەی عەلمانیەتی كۆن كە دژی بانگەوازی پێغەمبەران دروست بوو، نەوەك بەم جۆرە كە دەڵێن بەرهەمی عەقڵگەرایی و نوێگەری و ڕۆشەنگەری و زانستە، بەڵكو فۆڕمێكی نوێیە لە ململانێی بەردەوام لە نێوان ئاینی و نائاینی[٤]، لە ڕاستیدا ئەم دوو ئاڕاستەیە هاوتەریبن لە مێژووی مرۆڤایەتی تا ئەمڕۆكە، یەكێكیان نوێنەرایەتی عەلمانیەت دەكات ئەوەی تر ئاینی، ئەم پڕۆسە مێژووییە بووە هۆی كەڵەكە بوونی جۆرێك لە جیاكردنەوەی ڕووكاری لەنێوان عەقڵ و نەقل یاخود لەنێوان عەقڵی دروست و نەقڵی نادروست بەگوێرەی گوزارشتی ئیبن روشدو رازی و ئیبن

---

(١) انظر: د.عدنان علي النحوي – المسلمون بين العمانية وحقوق الإنسان الوضعية /.ط١١٩٩٧م، دار النحوى للنشر –رياض . ص٢٧ كذلك أنظر: ما حدث بعد ان جلب أسكندر وعلماء معه لنشر فكر اليوناني موجود فى(مطلب: العلمانية فى العالم الأسلامى) من هذا البحث..

(٢) د.عدنان....– المسلمون ... المصدر نفسه ص ٢٧ – ٣٢ – كذلك( محمد مهدي شمس الدين– العلمانية ... المصدرالسابق ص ٨٣).

(٣) موسوعة علم الإجتماع ص٣٣٩.

(٤) بەگوێرەی معجم الشامل ... یەكەم دەركەوتنی عەلمانیەت دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی هاڕوون، لە (خشتەی ڕوونكردنەوە) (پەرتوكی پیرۆز _ عەهدی نوێ) لە ڕوونكردنەوەی هاڕوون هاتووە: برای گەورەی موسا، یەكەم كاهین بوو لەناو گەلی ئیسرائیل و باوكی هەموو كاهینەكان بوو، بەم شێوەیە ڕەگ و ڕیشەی عەلمانیەت لەگەڵ ڕەگ و ڕیشەی كەهەنوت بوو .. واتە لە ململانێیەكی بەردەوامدان..

تەیمییە[١]، چ کاتێك ڕەوشی ئاینی لە دۆخی هەڵبەز و دابەز بوو ، ئەوا دەبێتە ململانێ و ئاشتەوایی(پێکەوە) لەگەڵ عەقڵ ،ئەوا دەبێتە سەرەتای سەرهەلدانی عەلمانیەت و پشیویشە بۆ سەربەخۆیی و پیرۆزی ئاینە، چونکە ئاشتەوایی نێوان ئاین و عەقڵ وەك نەریت لە سایەی دەسەڵاتێکی سەردەمی و زەمەنی بەرجەستە دەبێت، دواتر ئاشتەوایی بەگوێرەی ئاستی عەقڵی ساتی و ئانی دێتە بوون[٢]، ئەمەش دەبێتە هۆی لارێبوونی ئاینی و کەم و کوڕی، تا ئاستێك لە هەندێك ئاین فرە خوایی دروست ببێت، لەوانە: خوای خەراپە و خوای چاکە، خوای ڕۆژ و خوای باران، خوای وشکانی و خوای دەریا دواتر خوای هەموو تیرەیەك ، لە قاموسی خرافات بە سەدان خوای جۆراوجۆر تۆمارکراوە لە مێژوودا (شالیمۆ خواوەندی خیر ی ئۆگارینیەکان بوە ، فۆرسیتی خواوەندی ئاشتی ئەسکندینافیەکان بوە ،کیۆپید خوای ئاشتی رۆمان بوە ،میترا خواوەندی دادگەری ئاریەکان بوە[٣]، ئەشتار خوای جەنگی ئاشوریەکان بوو، ئانۆ خوای سۆمەریەکان،ئۆدنیش خوای جەنگی ئەسکندینافیەکان بوە ،ئۆنیرۆس خوای جەنگی میسریەکانی کۆن بوە ، ئیرینیس خوای ئەگریکیەکان بوو بۆ تۆلەسەندنەوە ،ئیراناگی خوایەکی میلەتانی ژاپۆنی جەنگی بوە ،ئایسەر خوای جەنگی ئەسکندینافیەکان بوە ،ئەیسکۆلاب خوای چارەسەری نەخۆشی بوە بۆئەگریکەکان ، زبابا خواوەندیکی بابلیەکانی جەنگ بوە ،لاماشۆ ،مارس ،میرڤا مۆت،نینۆرتا ،یۆتیزلۆپۆ چیلی...ئەوانە هەموی خواوەندی شەڕو توندوتیژی بووینە[٤]

---

(١) قسەکردن لە نێوان عەقڵی ڕێژەیی و ئاین کە حەقیقەتە ڕەهاکانی هەڵگرتووە، لەبەر ئەوە هەر ئاشتەوایییەك دەبێتە هۆی گونجاندنی نێوان حەقیقەتی ڕێژەیی و حەقیقەتی ڕەها لە کۆتاییدا لە هەمووی بەگشتی زۆرێك لە حەقیقەت وندەبێت .

(٢) دەقەکە دەڵێت: بەڵگەی عەقڵی ڕاشکاو لەگەڵ بەڵگەی شەرعی دروست تێکناگیرێ _ ئیبن تەیمیە _ مجموع الفتاوى، ط٢/ ١٩٩٨م، دار الوفاء _ مملكة العربية السعودية ج٥ ص ١٤٩.

٣ قاموس الخرافات والاساطير ص٢١،ص٧٦،ص٨٧،ص٩٣ ص١٢٧،ص١٥٠،ص١٧٧ ص١٨٩،ص٢٠٤ .

٤ قاموس الخرافات ۃالاساطير ص٩٤ ص١١.

... جیا لـەوەی خوای ئاسمان و خوای زەویش هەن[١]، ئەمە جیاکارییە لـەنێوان ئاسمان و زەوی[٢] کە بووە هۆی جیاکردنەوەی چەمکە یەکانیەکان، دونیا و دوارۆژ، یاساکانی زەوی و یاساکانی ئاسمان، لاهوت و ناسوت لـە مەسیحیەت[٣]، عەقڵ و نەقڵ،ئەهلی قەلەم وئەهلی شمشێر، پیاوانی ئاینی و پیاوانی نائاینی، مەسیح و مەسیحیەت، دواتر جیاکردنەوەی ئاین و دونیا عەلمانیەتی لـێ بەرهەم هات، وەك ئەوەی ئاین بۆ دوارۆژ هاتووە، مرۆڤی وەك دیلی چاوەڕوانی تەسلیمبوون بە ئەمری واقیع داناوە بەبێ بەرگری و کۆششکردن،لـەرسالـەکانی (اخوان الـصفا)ش ژمارە(٣٠) بە ناو نیشانی (مثنویة الإنسان) دەڵێت: مرۆڤ پیك هاتوە لـەدوودژی، جەستەی مادی ودەروونی ڕووحانی ،یەکەمیان بۆ دنیا کاردەکا ودوەمیش بۆ دوارۆژ هاتوە[٤]، ئەوەیان تەنزیریش بوە بۆ پاپاو ئیمپراتۆر: هەروەك مرۆڤ لـەدوولای مادی وروحی پێك هاتوە دەبێ دەسەڵاتیش لـەو دوولایە پێك بێت، ئاین وپاپا بۆ روحی ودوا رۆژ ، مرۆڤ و دەوڵەت و ئیمپراتۆریش بۆ جەستەو دنیای،ناسوت بۆ دنیا لاهوتیش بۆ دوا رۆژ... دەقی تر لـە ئینجیل ئەم تیۆرەی پتەوتر کردووە، بە بۆنەی پێدانی سەرانە بە قەیسەر تێیدا هاتووە (ئەوەی هی قەیسەرە با بۆ قەیسەر بێت،

---

([١]) ئەمەش واتا کۆمەڵگە بە قۆناغەکانی گەشەکردن نەڕۆیشتوون لە فرە خوایی بۆ یەکتاپەرستی وەك باوەڕیان وایە (شوێنکەوتووانی تیۆری پەرەسەندن) جەخت دەکاتەوە کە هزری مرۆڤ یەکتاپەرستی دروست کردووە، بەڵام ڕاستیەکەی ئەوەیە کە هزری مرۆڤ هۆکار بووە بۆ دروستکردنی فرە خوایی لە یەکتاپەرستی هەروەك (ولیام شمت) جەختی لەسەر دەکاتەوە و دەڵێت: (بنچینەی ئاین یەکتاپەرستییە دواتر بۆ فرە خوایی) زانستی کۆمەڵناسی ل ٤١٨..

([٢]) لە بیرو باوەڕی مەجوسدا هاتووە کە پاش ململانێ و ئاشتەوایی لەنێوان یەزدان و ئەهریمەن (کە دوو خواوەندن) ڕێکەوتن کە جیهانی خوارەوە تەنها بۆ ئەهریمەن بێت بۆ ماوەی ٧٠٠٠ ساڵ _ الملل والنحل .. سەرچاوەی پێشوتر ل ١٩٧. عەلمانیەت لەسەر ئەم جۆرە هزرانە دروست بووە.

([٣]) اللاهوت: عالم الغيب، آخرة، والناسوت عالم الشهادة أيى الدنيا( أنظر معجم الشامل ... ص ٨٦٧: مادة: ناسوت.

[٤] رسائل اخوان الصفاء وخلان الوفاء- رسالة رقم:٣٠ص١١٢-١١٣

ئەوەشی هی خوایە با بۆ خوا بێت)[١]، بەم شێوەیەش (نیشتمانی من لەم دونیایە نییە)[٢].

لە ئامۆژگارییەکانی سەرکردە ئاینیەکان بۆ گەل بۆ ئۆقرەگرتن بەرامبەر دەسەڵاتی ستەمکار ولەپێناو گەیشتن بە بەهەشت هەروەك لە ئنجیلدا هاتووە: ((گوێم لێبوو دەیوت: چا و بە چاو و ددان بە ددان، بەڵام من بە ئێوە دەڵێم: دژایەتی ئەو کەسە مەکەن کە دەیەوێ خەراپە بەرامبەرتان بکات. ئەگەر یەکێك بیەوێ زلەیەك لە ڕوومەتی ڕاستەتان بدات لاڕوومەتەکەی تری بۆ وەرگێڕە، ئەگەر یەکێك ویستی ستەمتان لێبکات بۆ ئەوەی پۆشاکتان ببات، ئەوا پۆشاکیان بۆ جێبهێڵن))[٣].. (أَجَابَ يَسُوعُ :مَمْلَكَتِي لَيْسَتْ مِنْ هذَا الْعَالَمِ. لَوْ كَانَتْ مَمْلَكَتِي مِنْ هذَا الْعَالَمِ، لَكَانَ خُدَّامِي يُجَاهِدُونَ لِكَيْ لاَ أُسَلَّمَ إِلَى الْيَهُودِ. وَلكِنِ الآنَ لَيْسَتْ مَمْلَكَتِي مِنْ هُنَ)ا[٤]،هەرلەوە ڕۆسۆ دەلێت ئاینی مسیحی تەنها باسی ئاسمانە باسی کیشەی زەوی تێدانیە ،دەشلێ بۆدروست کردنی کۆمەلگەیەکی بێدەنگ واچاکە هەموی مسیحی بن[٥] ،لە شوینێکی تری ئینجیل

---

([١]) إنجيل متى٢٢ الطبعة الرابعة ١٩٩٢، اتحاد جمعيات كتاب المقدس (٢١ – ٢٢)/٢٢ مجموعة آياه تبدأ من (١٥–٢٢) بەهۆی پێدانی جزیە بە قەیسەر، وەڵمەکەی بەم دەقە هاتووە: ئایا دروستە جزیە بە قەیسەر بدەین یاخود نا ؟ ...وتیان: بۆ قەیسەر ! پێی وتن: پێیبدەن، ئەوەی هی قەیسەرە با بۆ قەیسەر بێت ئەوەش هی خوایە با بۆ خوا بێت. بەڵام لە (كتاب المقدس – الإنجيل وأعمال الرسل) دار المشرق – بيروت، الطبعة الأولى ١٩٨٤ دەقەکە بە جۆرێکی تر هاتووە لە ئنجیلی مەتادا ٢٢ (١٥ _ ٢٢) جیاوازی لە نێوان ئەم دوو نوسخەیە هەیە: لێرە دەقەکە بەم شێوەیە هاتووە: پێی وتن: ئەوەی هی قەیسەرە پێیبدەنەوە و ئەوەشی هی خوای با بۆ خوا بێت.

([٢])كتاب المقدس–العهد الجديد مت (٣٤:٦) هەروەها جان جاك روسو–فى العقد الّجتماعى –ص٢٠٨ (ونقله لكتاب المذكوربصيغة: وطن المسيحى ليس في هذا الدنيا) ..

([٣]) الكتاب المقدس العهد الجديد –متى ، اصحاح ٥ (٣٩ – ٤١) – .. المصدرالسابق..

[٤] كتاب المقدس- إنجيل يوحنا ١٨: ٣٦

[٥] روسو – فى عقدالاجتماعى ص٢٠٨

هاتوە:( فلا تهتموا للغد.لأن الغد يهتم بما لنفسه.يكفي اليوم شره ..) [١] ، ئەوە بوویتەکاریگەری لەسەر بەشیکی زۆر لەزانایانی ئیسلامیش کە پێیان وابیت پەیوەندی دەسەلات وهاوولاتی بەو شیوەیە بیت: ئەگەر کاری دەسەلات چاك بوو ئەوا پاداشی خواییان دەبیٚ وهاوولاتیش دەبیٚ سوپاسیان بکەن ،ئەگەر خراپەشیان کرد ئەوا دەبیٚ هاوولاتی ئۆقرە بگریت بۆ رۆژی دوای ( ونقل عبد الكريم الخطيب قول الحسن البصري :ألا لا تسبوا الولاة فإنهم ان أحسنوا فلهم الأجر وعليكم الشكر، و ان أساؤوا فعليهم الوزر وعليكم الصبر، وإنما هم نقمة ينتقم الله بهم ممن يشاء فلا تستقبلوا نقمة) ، گەلیٚ جاری تر رێك بە پیٚچەوانەی ئاینی ئەسل (هەر بەناوی ئاینەوە) کاری خراپ کراوە،ئاین بۆ دژی زولم هاتوە چ بەدەست چ بە زمان چ بەدل کە گوزارشی ڕاستەقینەی قۆناغەکانی معارەزەیەبۆ هەمو دۆخێك ، کەچی بەکاریان هیناوە بۆ مل کەچی مەزلوم لە قازانجی زالم، قەشە ئۆگستین دەیوت هەژاروبەندەقەدەری خودایە نابی خۆ رزگار بکەن وئەو قەدەرە تیك بدەن ،نابی بەرگری ومعارەزەیی بکەن ، ڕوون تر قدیس ئۆکستین لە کتیبی(ملكوت الله) دەلیٚ (بۆیە خواعەبدایەتی داهیناوەك سزا بۆیە هەرتەقەلایەکی معارەزەیی بۆ هەلوەشاندنەوەی سیستەمی عەبدایەتی ئەوە یاخی بوونە لە فەرمانی خودا٢، ابن عبد ربه هەمان بۆچوون بەناوی ئاینی ئیسلام دووبارە دەکاتەوەو دەلیٚ: اذاكان الحاكم عادلافله الأجر وعليك الشكر واذاكان ظالما فعليه الوزر وعليك الصبر)[٣] ، ئیبن تەیمیەش وەسفی سولتان وادەکاو دەلیٚ(أن السلطان ظل الله في الأرض) [٤] زیاتر لەوەش لەلایەن ئیمامەکان ووتراوە ٦٠ سال لە سولتانیکی زالم باشترە لەوەی یەك شەو بیٚ سولتان بین ،بۆیە دژایەتی ومعارەزەکردنی دەسەلاتی حرام

---

[١] -إنجيل متى ٦: ٣٤).

[٢] ماركسية قرن عشرين ص١٤٦

[٣] د محمد شحرور-الكتاب والقران ص١٠١

[٤] مجموع الفتاوى ج٢٨/٢٩٠-٢٩١

کردوە وداوای کردوە ملکەچی وئۆقرە باشترە لە بەرگری وفتنە ، لەوەوە مارکس بەم جۆرە ئاینانەی وتووە ((تلیاکی گەلان)) [١].

کیشەی گەورەی فقە(نەك هەمو فقە) ئەوەیە کەمتر ئامانجی ئاینی دێنێتەدی کە بەرپاکردنی شارستانی وئیعمار وپیشکەوتن وتکنیك وگەشەی عەقلی ، زۆر جارمنهجیکی عەبەسیە دیارنیە ئامانجی چیە بۆ دونیا ،دونیاو قیامەتی لیکجیاکردۆتەوە گوایە ئاین بۆ قیامەتەو عەقل وزانستیش بۆ دونیا، وای کردوە ئاینی ئیسلامیش بەرەو لاهوتی وسروش وجۆریك لە مەسیحیەت بڕوا کە وەسفی ئەوە هەڵگریٚ ئاینی ئیسلامیش ئاینی شەخسی بێت، وای کرد سپینۆزا بلێت (ئەرکی فلسفە دۆزینەوەی هەقەو ئەرکی ئاینیش بەندایەتی) ، گرنگی نەدانی بەشی ئەکتیڤی فقهی ئیسلامی بەفلسفەو فکرو زانست و تەکنۆلۆجیاو هێنانەدی شارستانی کاریگەری ئاینی لەکۆمەڵگە دابڕی ... ئەمە دۆخێکی ئاینی لادراوە لە ڕاستەڕێگەی خۆی کە مرۆڤ بەرەو ئەفسانە و خەیاڵ دەبا، لە کۆتاییدا ئاین لەلایەن پیاوی ئاینی و دەسەڵاتدار و عەلمانی وەك یەك بەکاردێت، دەبێتە هۆکارێك بەدەست ئەو چینانەی کە ئاین بەکاردەهێنن دژی گەل بە گشتی، بەم شێوەیە مەسیحیەت لە ئەوروپا توشی لادانی زۆر بوو لە بواری بیروباوەڕی و هزری و سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابوری،(کۆمەڵگەی موسوڵمانیش بە جۆریکی تر)، کە بووە کۆسپێکی مەزن لە بەردەم پێشکەوتنی شارستانی، ئەمەش دەرەنجامێکی لۆژیکییە بەریەك بکەویٚ لەگەڵ پێشکەوتنی مرۆیی، لەمەشدا بووە یەکەم شانۆی ئەم بە یەکدادانە، بەریەك کەوتن لە نێوان دەسەڵاتی ئاینی (کەنیسە) لەگەڵ زانا و فەیلەسوف و توێژەر وتەواوی

[١]نص مقولة ماركس جاء في كتابه(نحو نقد لفلسفة الحق الهيجلية- ١٨٤٤م): إن الهم الديني هو في الوقت نفسه تعبير عن هم واقعي واحتجاج علي هم واقعي . إن الدين هو آهة الخليقة المضطهدة ، هو قلب عالم لا قلب له ، مثلما هو روح وضع بلا روح . إنه أفيون الشعب .

سیاسەتی مەدەنی، پەرتوکەکانیان قەدەغەکردن لەناویشیاندا پەرتوکی ئیسلامی زانستی(نەك فقهی)، دادگایەکیان بۆ دانان و هەندێکیان سوتاندن، تۆمەتباریان کردن بە هەرتەقە و بێباوەڕی[١].

تویژینەوەکانی (تەتەوریەو مادی ) هەولیان داوە قۆناغ بەندیەکی وابکەن بە پێی گەشەی عەقلانی ئاین بخەنە پاشو ڕیشە بۆ عەلمانیەت بدۆزنەزە ، بیکەنە مێژووی گەشەی عەقلانیەت ،جاریش وایە عەلمانیەت وعلمیشیان تیکەل کردوە ، کەچی وانیە ئاینی ونائاینی بەتەریبی هاتوە ،گوایە سەرەتای کۆمەلگە(شیوعیة البدائیة) بیئاینی بووبێت ،ئەوە ئەسلی نیە ،زۆربەی زانایانی ئەنسرۆپۆلۆجی وشوینەوارناسان کۆکن کە لەمێژوودا میلەتان بیَ کۆشك وتەلار بوە، بیَ فەلسەفەوهونەر بوە بەلاَم هەرگیز بیَ ئاین و پەرستگا نەبوە، لە (معجم لاروس)یش هاتوە کە لە تاکی دڕندە ترین میلەتانیش مەیلی ئاینی تیدا بوە، لە قورئانیش ئاماژە بەوە کراوە بۆ هەموو نەتەوەیەك پێغەمبەرێك بەزمانی خۆیان ڕەوانەکراوە (وما ارسلنا من رسول الا بلسان قومه ليبين لهم فيضل الله من يشاء ويهدي من يشاء وهو العزيز الحكيم)[٢] ، موحدەکان مێژوویەکی ئەسیلیان نیە ،هەروەك دەبینین فەیلەسوفە موحیدەکانیوەك: هرکلیت، سومخیا، پیلاس، دیاگراس، ملیۆس، ئەناکسیۆگوراس، شیشرۆن، تیۆدۆرس، گریتۆس، سینکا،... لایەنگری وایان بۆ دروست نەبووە لەسەر ئاستی میللی، تەنها لەسەر ئاستی تویێژی فەیلەسوف و زانا و عاقلّمەندان بووە،کوا ئیستا میلەتیك لەسەر ڕاڕەوی موحدیکی مێژوویی بڕوات ،ئەوەتا جیهان دابەش بوە بەسەر میلەتانی پیغمبەرەکان ،ئەوروپا بۆ مسیح وجیهانی ئیسلامی بۆ محمد ویەهودی بۆ موساو ،چین

---

(١) أ– شبلی عیسمی–العلمانیة والدولة الدینیةص٣٦ ب– موسوعة المیسرة .. .. المصدرالسابق ص ٣٦٧.
٢ سورة إبراهيم - آية ٤

وئاسیای رۆژهەلات بۆ کۆنفۆشیۆس،هندبۆ بوزاوزەردەشت و ..بوزاو کۆنفۆشیۆس وزەردەشتیش بە تەئکید سەرچاوەی ئاینیان هەیە مادام توخمی (ئەخلاق)سەرمەشقە .
(جگە لە پیغمبەران) شان بەشانی ئەوفەیلەسوفانەش فەیلەسوفانی ئاینی هەبوە (یۆنانی و هەرسیّ مەردەسەی سەرەکی ئایینی و نائایینی و مام ناوەندی لیّ خەملّی)، مەدرەسەی ئایینی (یان نزیك لەئایینی ) بریتی بوو لە فەیلەسوف و زانایانی وەك (فیساگۆرس وئەمبادیکلس و ئەنکسیمونراس تا دەگاتە سوکرات)، (المقدسی) دەلّیّ باپیرانی ئەفلاتون لە پیغەمبەرانن (وأما الحرانية فإنهم يقولون لن تحصى أسماء الرسل الذين دعوا إلى الله وان مشهورهم أراني واغثا وذيمون وهرمس وسولن جد أفلاطن لأمه)[١]. ئەوەی ڕوونە هەریەکە لە فیساگۆرس و ئەنبادیکلس قوتابی (ح.سولیمان) و (ح.داود) بووینە[٢] لە (طبقات الامم- الصاعدى الأندلسى) زیاتر باسی لە پەیوەندی ح.سلیمان و فیساگۆرس کردوە ،بەلام لە کتیبی(تاريخ الحكماء – على بن يوسف القفطى ص١٥) دەڵێت قوتابی لوقمان بوە ، سپینوزا دەلّیّ سلیمان بە حکیم ترین مرۆڤی سەر زەوی وەسف کراوە[٣]، بۆیە ئەوانە خاوەنی دەعوەش بوونە بۆ بلاوکردنەوەی ئایین ، لەگەلّ هاتنی ئەسکەندەر بۆ رۆژهەلّات دوو قوتابی فیساگۆرس بەناوی (مەرزنۆس وڤلانۆس) فەلسەفەو باوەڕی فیساگۆری وهیلنیستیان لە فارس وهند بلاودەکردەوە[٤]، بالی ئاینیەکان چالاك ترو دلسۆزتر بووینە ،بەلام دوای ئەزمونی ئەوروپا نۆرەی نائاینیەکان هاتەوە ،ئیتر فەلسەفە و زانستی بیّ باوەڕی بەردەوام بووە تا سەدەکانی ١٧ بەدواوە تەکانی بە خۆدا، گەورەترینیان سپنوزا و هۆبز شوبنهاوەر، دیفید هیوم، جون دیوی، برتراند راسل،.. پیّیان وابوو ئایین و

[١] البدء والتاريخ ص١٥٠
[٢] شهرستانى -الملل والنحل..ق٢ ص ٧٢ .
[٣] سبينوزا –رسالة فى اللاهوت والسياسة، ترجمة:د حسن حنفى، دارالطباعة-بيروت، ط١ ص١٤٥
[٤] - ابي الفتح الشهرستاني- الملل والنحل – تحققت محمد عبدالقادر الفضل، بيروت، طبعة الأولى ج٣ ص٧٩ – لة(قصة الحضارة – ج١٣ ) لە ٥٢٩ز باس لە رۆیشتنی زۆریك لە فەیلەسوفان کراوە بۆ ئەو شوینانە.

شەریعەت لە یاسا وەردەگیرێ نەك لە (راستی گەردوونی)، یاساش فەرمانی دەسەڵاتەوەك هۆبز(١٥٨٨– ١٦٧٩ ز) دەڵێت، واتا ئایین لە خودا وەردەگیرێتەوە بۆ نێو دەوڵەت[١]. بەشێکیش بە کتێب و توێژینەوەی زانستی و فەلسەفی ئایدۆلۆژیا هاتنە مەیدان دژ بە ئایین، لەوانە : (النسق المسیحیة)ی شوبنهاور، (جوهر المسیحیة)ی فیورباخ١٨٤١، (الوجود والعدم) ی سارتر، (مستقبل الوهم) ی فروید.. ئەوانە کتێبی هەرە موڵحیدودژ بە خواو ئاینەن[٢]، ئینجا مەکیاڤیلی بە (میر)، ئیڤان باڤلۆڤ(١٩٣٦–١٨٤٩) لەبارەی (محاضرات فی عمل نصفی الکرة الموخیة)، سپیۆنزا (١٦٣٢– ١٦٧٧) (الرسالة في اللاهوت و السیاسة)...، لەدوای شۆڕشی فرنسا ١٧٨٩م بۆ یەکەم جار بڕیارِ بەناوی گەل درا لە جیاتی بە ناوی خودا، لەدوای ئەوانەش: فریدرێك نیتچە (١٨٤٤– ١٩٠٠) خاوەنی دروشمی(مەرگ بەر خودا)، داروین (اصل الانواع)، مارکس ئەنجلس لینین ...

دواتر زانست بووە لایەنێك و ئاینیش لە دژی وەستا، هەر سەرکەوتنێکی زانست لە بەرامبەریدا شکستێکی ئاین بوو، یەکەم شانۆ بۆ ئەم ململانێیە لەگەڵ فەلسەفە بوو، ڕەگ و ریشەی ئەم ململانێیە (عەقڵی)یە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی قوتابخانە یۆنانیەکان (هەرووەك پێشتر باسمان کرد) لە سەردەمی رۆشنگەری جارێکی تر بۆی گەڕانەوە لە سەدەی (١٦ تا ١٧,٥) ڕووبەڕوو لەگەڵ چەمك و تێگەیشتنە ئاینیەکان، دواتر ململانێکە هەڵکشا بۆ گۆڕەپانی زانستی لە کاتی دۆزینەوە گرنگەکان لە زانستە گەردوونیەکان لەلایەن کۆپەرنیکۆوە (١٤٧٣ز _ ١٥٤٣) و کیبلەر (١٥٧١ _ ١٦٣٠ز) کە شۆڕشی گەورەی لە عەقڵی مرۆڤایەتی بەرپا کرد، لەسەر دەستی نیکۆڵا میکافیلی (١٤٦٩ _ ١٥٤٧ز) بەرەو گۆڕەپانی سیاسەت

[١](هۆبز– مبادئ القانون — ئەوەش بە دوو بەش چاپکرا لە ١٦٤٠ ز (الطبیعة الانسانیة)، (الهیئة السیاسة).
[٢] - المعجم الفلسفی الشامل.. ص ٨٩

هەڵکشا کاتێك کودەتای بەسەر تێگەیشتنی ئاینی و ئەخلاقی سیاسیدا کرد، لە پەرتوکەکەی (الّمیر) و ( أگروحات) ئەوەی ناوی دەنێن سیاسەتی نوێ و سەردەمی دامەزراند، لەبەر ئەوە میکافیلی وەك دامەزرێنەری عەلمانیەت ناوزەند دەکەن لە هەندێ سەرچاوەدا، یاخود بەلایەنی کەمەوە دامەزرێنەری عەلمانیەتی سیاسیە[١]، هۆبز (١٨٥٥ _ ١٦٧٩ز) ئەم هزرەی بە تەواوی گەشەپێدا بە ئاراستەی جیاکردنەوەی سیاسەت لە ئاین[٢].

بۆ رۆژگاری ئیستا سێ بیرمەند رۆلیان هەبوو لە سەرهەلدان وپتەوکردنی عەلمانیەت و گواستنەوەی بۆرۆژگاری ئیستا، ئەوانیش: ١/ یاساناس (جین بۆدین)ی فەرەنسی، ٢/ سیاسەتمەدار (جۆهاش تیسوس)ی ئەلّمانی، ٣/ دادوەری هۆڵەندی (جریتیۆس) ئەو کەسە بوو کە بناغەی بۆ یاسای نێودەوڵەتی دانا[٣]، پاش گفتوگۆکردنی چڕ لەبارەیەوە، جۆن هیلیۆك (١٨١٧ _ ١٩١٦ز) زاراوەی عەلمانیەتی بۆ یەکەم جار بە مانا نوێکەی بەکارهێنا، هۆلیۆك هەولّیدا پێناسەیەکی نوێ بێنێت وای بیرکردەوە کە بێلایەنە وەك ئەمەی خوارەوە: ((باوەڕبوون بە توانای چاکسازیکردنی دۆخی مرۆڤ لە میانەی رێگە مادییەکان، بەبێ بەرەنگاربوونەوەی بابەتی بیروباوەڕ، جا بە پەسندکردن بێت یاخود رەتکردنەوەی))[٤].

---

(١) سەربارى هەردوو پەرتوكەكەى (أمير، أطروحات) پەرتوكى ترى هەن وەك (فن الحروب، تأريخ فلورنسا) بە رێسای (ئامانج پاساو بە هۆکار دەدات)، تێیدا ئامۆژگاری دەسەڵاتداران دەکات، بۆ ئەوەی دەست بەسەر هێزی گەلدا بگرن، دۆخی سیاسی ئێستا لە جیهان وەك بنەما بۆ ئەمە دەگەڕێتەوە. لە ڕاستیدا دامەزرێنەری مەزهەبی سیاسی عەلمانییە، نەوەك زانستی سیاسی نوێ.

(٢) أ- الموسوعة العربية العالمية .. المصدرالسابق ج ١٦ - ص ٤٠٢ ب- موسوعة الفلسفية المختصرة .. المصدرالسابق ص٥٠٣.

(٣) الموسوعة العربية العالمية، المصدر نفسه ج ١٦، ص٤٠٢-.

(٤) أ- العلمانية تحت المجهر .. المصدرالسابق ص ١٢، ب-موسوعة العربية العالمية .. المصدرالسابق( المصطلح: العلمانية.

لەگەڵ پتەوكردنی عەلمانیەت لەلایەنی سیاسی و هزری و یاسایی، كەنیسە كۆمەڵێك سازشی كرد، لە ساڵی ١٨٨٥ز بە فەرمی دانینا بە جیاكردنەوەی هەردوو دەسەڵاتی مەدەنی و ئاینی[١]، بۆ یەكەم جار پڕۆتستانت دانینا بەوەی (بەخششی خوایی بەبێ نیوەندگیری كەنیسە بە مرۆڤ دەگات)، دواتر مەزهەبی كاسۆلیكی دانینا _ كە بابا لاوینی سێزدەهەم دایهێنا لە كۆتایی سەدەی نۆزدەهەم _ بە جیاكردنەوەی ئەم دوو دەسەڵاتە، دواتر بابیوسی یازدەهەم ڕەزامەندی خۆی ڕاگەیاند بۆ جیاكردنەوەی ئاین لە دەوڵەت كە فەڕەنسا پشتی پێبەستبوو[٢]، پاشان بە پلە بەندی ئاین گۆڕا تەنها بۆ پەیوەندی نێوان خوا و تاك و بۆ بابەتێكی تاكەكەسی.

بەڵام لە ڕووی واقیعیەوە ئاڕستەی سیاسی نوێ لەسەر بناغەی نەتەوەیی دروست بوون، بۆ یەكەم جار لە دەرەوەی چێوارچێوەی ئاینی لە ناوچەكە شانشینێكی نەتەوەیی خاوەن سنوور و سیاسەتی خۆی دروست بوو لە ئینگلتەڕا لە ماوەی (١٤٨٥ _ ١٥٨٩) لەسەر دەستی هێنری حەوتەم، لە فەڕەنسا لە ماوەی (١٤٦١ _ ١٤٨٣ز)، لە ئیسپانیا (١٤٦٩ز)، دواتر هۆڵەندا[٣] پەیماننامەی ویستفالیا ساڵی ١٦٤٨ بوونی ئەم دەوڵەتانەی بەهێزتر كرد، ئەمە بە سەرەتای سەردەمی عەلمانیەت دادەنرێت هەروەك موحەمەد شەمسەدین مێژووی عەلمانیەت لە سەردەمی نوێ بە كۆتایی سەردەمی دەرەبەگایەتی و دروستبوونی دەوڵەتی نەتەوەیی لە ئەوروپا دەبەستێتەوە[٤]، یەكەم بوونی سیاسی عەلمانی پاش شۆڕشی فەڕەنسی ساڵی ١٧٨٩ز بە دروشمی ( ئازادی، برایەتی، یەكسانی) دەركەوت، بەناوی گەلەوە حوكمڕانی

(١) شبلبي العيسمى – العلمانية والدولة الدينية .. المصدرالسابق ص ٢٣..

(٢) شبلي عيسمي .. المصدرالسابق ص٢٤–٢٦.

(٣) أ– موسوعة الأديان العالم، المشرف العام: جميل مدبك ط١ ٢٠٠٠م–كتاب: الدينات القديمة –ص١٤١ ب–ول ديورانت، قصةالحضارة .. المصدرالسابق ج٣ ص٥٣٠–.

(٤) أ–د. عدنان، المسلمون .. المصدرالسابق ص٤٤ ب– موسوعة الميسرة .. المصدرالسابق ص٣٦٨.

دەکرد نەوەك بەناوی خوا، دواتر زۆربەی ئەندامانی پەرلەمانی فەرەنسی لە عەلمانیەکان بوون. ئەوانیش وەك مافی خۆیان یاسا عەلمانیەکانیان دەرکرد، دەسەڵاتی کەنیسەیان لە حوکمڕانی دوورخستەوە، لە کۆتایی سەدەی نۆزدەم فەرەنسا پەیوەندی خۆی لەگەڵ کەنیسە و دواتر دەوڵەتی فاتیکان ساڵی ١٩٠٤ز پچڕاند[١]، دوای ئەویش ئیسپانیا دەستی کرد بەجێبەجێکردنی عەلمانیەت لە نێوان ساڵانی (١٨٦٨ _ ١٨٧٦ز)، دواتر مەکسیك لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەم[٢]، دوای ئەمە باقی ئەوروپا دەوڵەتی نوێی لەسەر ئەم بناغەیە دروستکرد، بەم شێوەیە بە کۆتایی هاتنی سەدەی نۆزدەهەم عەلمانیەت لە هەموو ئەوروپا بڵاوبووەوە.

لە ڕووی یاساییەوە دەوڵەتە ئەوروپیەکان دەستیانکرد بە تۆمارکردنی بەندی تایبەت کە باس لە عەلمانیەت دەکات،لەژێر بارو دۆخێکی پاشەکشەی ئاینەکان جیهانی گرتبۆوە، ئاینەکان لەبارودۆخیکی فەرامۆش کرابوون ،ئەو فەرامۆشیە لەهەندێ وولات گەیشتبوە ئاستی دەستوری ، کە ئایین نەیەتە ناو دەولەت یان ئەوەی ئیستا پێی دەووترێ( ئاینی فەرمی وولات فلانە ئاینە )،لە پیش هەموان کۆنگریسی ئەمریکی[٣] ،ئینجا لە مادەی ١١٦ی دەستوری نەمسای سالی ١٩٠١،زۆر وولاتی تریشی بەدوا داهات،لەهەمویان ڕوون تر دەستوری فەرەنسا–مادەی(٢)ی دەستوری فرنسی وا تۆمارکرا: فرنسا جمهورية لا تتجزأ علمانية

(١) أ– الموسوعة العربية .. المصدرالسابقج١٣ ص ٤٢٤ ب–الموسوعة الأديان العالم – .. المصدرالسابق ص١٨٧.

(٢) الموسوعة العربية نفس المصدر والصفحة.

[٣] هەرچی دەستوری ئەمریکایە(کە لە١٧٨٧/٩/١٧ گەواهی کراوە) لەبڕگەی(٣)ی مادەی(٦) وا هاتوە: يكون الشيوخ والنواب المشار إليهم آنفاً، وأعضاء المجالس التشريعية لمختلف الولايات، وجميع الموظفين التنفيذيين والقضائيين التابعين للولايات المتحدة ولمختلف الولايات، ملزمين بموجب قسم أو إقرار بتأييد هذا الدستور. ولكن لا يجوز أبداً اشتراط امتحان ديني كمؤهل لتولي أي منصب رسمي أو مسئولية عامة في الولايات المتحدة.

ديمقراطية اجتماعية وهي تضمن المساواة أمام القانون لجميع المواطنين دون تمييز بسبب الأصل أو الدين وهي تحترم كل[١]، دوای پەرِیەوە بۆ کیشوەرەکانی تریش،مادەی ٢٠ی دەستوری ژاپۆن، دیباجەی دەستوری هندی ١٩٥٠، بەو دواییە گەیشتە وولاتانی کۆنە شیوعی ،لەوانە:مادەی١٦ی دەستوری بیلا روسیاسالی ١٩٩٤،مادەی ١١ی دەستوری ئەسیۆبی ١٩٩٤،مادەی ١٤ ی دەستوری روسیای ١٩٩٣، لەزۆر وولاتی تر بەشێوەی جیا وادەهات ،مادەی ٨ی دەستوری ئەنگۆلیا،مادەی ٧ی دەستوری ئازەربیجان ،مادەی ١ی کازاخستان،مادەی ١ی قرغیزیا،مادەی ١ی مەدگەشکەر،مادەی ١ی وولاتی مالی ، ،مادەی ١ی تاجیکستان، ، لەدەستوری تورکیاش هەر ناگۆترێ.

هەرچی ئیتالیایە _ کە چەقی قورسایی پاپا لەوێیە _ رِێکەوتنێك لەنێوان مۆسۆلۆنی[٢] و پاپا کرا لە١١/فبراير/١٩٢٩ (کە بەرِێکەوتنی لاتران بەناوبانگە) بۆ ئەوەی ئاینی فەرمی دەولّەت ببێتە کاسۆلیکی، لە ماوەی سالّی ١٩٤٧ دەولّەت بووە عەلمانیەت و بابەتی ئاینی فەرمی دەولّەت لادرا ،ئەو کاتە مۆسۆلینی وتی: لەگەلّ پاپا رِێکەوتین لەسەر ئەوەی کە: ((مرۆڤ هەر لە کاتی لەدایکبوونەوە بۆ من بێت و بۆ کەنیسەی جێنەهێلّم تەنها کاتی مردنی نەبێت لەو ساتەوە بۆ پاپا بێت))، ئەو رِێکەوتنە ورِێسایە لەدوای سایکس پیکۆ زیاتر لە جیهانی ئیسلامی بەرِوونی بەرجەستە بوە تائیستاش ئاسەواری ماوە ، هیتلەر و پاشان شیوعیەتیش ئەم کارەیان

---

[١] دەستوری فرنسا لە٤ی ئۆکتۆبەری ١٩٥٨ دەرچوو ٩٢مادە بوو، هەرچی دەستوری ئەمریکایە(کە لە١٧٨٧/٩/١٧ گەواهی کراوە) لاگیری ئاینیە بەلام نەیکردۆتە مەرج وەك لەبرِگەی(٣)ی مادەی(٦) وا هاتوە: يكون الشيوخ والنواب المشار إليهم آنفاً، وأعضاء المجالس التشريعية لمختلف الولايات، وجميع الموظفين التنفيذيين والقضائيين التابعين للولايات المتحدة ولمختلف الولايات، ملزمين بموجب قسم أو إقرار بتأييد هذا الدستور. ولكن لا يجوز أبداً اشتراط امتحان ديني كمؤهل لتولي أي منصب رسمي أو مسئولية عامة في الولايات المتحدة.

[٢] سەرکردنە بزوتنەوەی فاشیزمی و سەرۆکی دەولّەت.

کرد[١]، لە ئیسپانیاش هەر بەم شێوەیە بوو[٢]، پاشان هەموو دەوڵەتانی تری ئەوڕوپا کاری خۆیان کرد لە دەستورەکانی خۆیان ڕاستەوخۆ عەلمانیەتیان تۆمارکرد و نووسیەوە و یاخود لەمیانەی مادە دەستورییەکان بەبێ باسکردنی عەلمانیەت.

پاش ملکەچکردنی ئاین بۆ حوکمی یاسا زەڕوزیانێکی زۆریان لێبینی هاتن جاریکی تر ئەو هەلویستە دەستوریە توندەیان هەموارکردەوە ،دووبارە مادەی تایبەتیان لە دەستوردا نووسی تیایدا دانیاننا بە ڕێزگرتنی ئاینی مەسیحی لە میانەی یاسا نەوەك لە میانەی مافی خوایی (بەگوێرەی وەسفی هۆبز)، لەو دەوڵاتانەش:

یۆنان: لە مادەی (١) و (٤٧)، دانیمارك: هەردوو مادەی (١،٢)، نەرویج: مادە (١٢)، سوید: مادەی (٤)، کۆلۆمبیا: مادەی (٥٤)، کۆرسیکا: مادەی (٦٦)، سلفادۆر: مادەی (١٢)، ئیسپانیا: مادەی (٦)، پورتوگال: مادەی (٢٤)، بارکوای: مادەی (٣)، ئەرجەنتین: مادەی (٢)، هەندێك لە وڵاتان بە مەرجیان گرتووە دەبێ پادشا یاخود سەرۆکی دەوڵەت لەسەر ئاینی مەسیحی بێت، نمونەی ئەمە مادەی (٤)ی دەستوری سویدی، مادەی (٩) دەستوری ئیسپانیا، لە هەموو ئەم مادانە دانراوە بەوەی ئاینی فەرمی دەوڵەت مەسیحیە[٣].

---

(١) موسوعة الأديان في العالم– ج خاص (ديانات قديمة) .. المصدرالسابق ص ٦٩٠.

(٢) المصدر نفسه... ص ٢٦.

(٣) أ.د. وهبة الزحيلي– فقه الإسلامي وأدلته– ط٤ / ٢٠٠٤م ، دار الفكر المعاصر– ج٨ ص٦٣٥٦–٦٣٥٨.

## باسی سێیەم: داینەمۆی عەلمانیەت و پایەکانی

کۆمەڵێك هۆکار و پاساو هەن یارمەتیدەربوون بۆ بڵاوبونەوەی سیستەمی عەلمانیەت لەم خاڵانە کورتیان دەکەینەوە:

١. **خراپ بەکارهێنانی ئاین**:پیاوانی ئاینی لەزۆربەی ئاینەکان ڕۆڵێکی ئیجابیان هەبوبێت ئەوا سەلبیشیان هەبوە ،دەگۆترێ لە کۆمەلگەی ئیسلامی پیاوی ئاینی نیە ،هەیە، لەنێو مەسیحی زیاتر،وادادەنرا کەنیسە نێوانگیری نێوان خوا و بەندەیە[١]، باوەڕ وابوو کە بڕیاری دونیا و دوارۆژ بە دەستی ئەوانە، بەهەشت بە هەرکەسێك دەدەن کە دەیانەوێ، دواتر بەخشندەیی خوا و بەهەشتەکەیان دەفرۆشت بە (پلیتی لێخۆشبوون)[٢]، بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کە دەسەڵاتەکەیان (سیۆکراتییە) واتە دەوڵەتی خوا لەسەر زەوی، واخۆیان دەردەخست کە پیرۆز و پارێزراون لە هەڵە، جێگەی ڕەخنە و هەڵسەنگاندن نینە، بەو جۆرە دەسەلاتانە (لە ڕووی ئەکادیمیەوە )ووتراوە( Devine Right Theory –نڤريەالتفويچ الإلهي ) دەسەلاتیکی پیرۆز وخاك وهەریمەکەی پیرۆزەو بەمیلەتیشەوە مولکی شایە٣ ، جاریش وایە پێی ووتراوە (سیزاریزم–ceasrism)نەك سیۆکراتی ، ،بەلام لەهەردوو بارداسزای لادان وسەرپیچی لەو جۆرە حوکمانە زۆر توند بوەبریتی بوە لە یاخی بوون لە خودا ، لە پەیامەکانی (پۆلسی ژ:١٣) بۆ میلەتی ڕۆمان هاتوە دەسەلات تەنها بۆ خودایە هەرچی ڕووبەڕووی دەسەلات ببیتەوە لە خوایاخی بوە–دەقەکەی:(١لتخضع كل

---

(١) رئيس الكهنة هو الوسيط بين الله والناس . (انظر جدول وشروح فی – كتاب المقدس – .. المصدرالسابق ص٧١٦).

(٢) نص الصك فی الكتاب: سيدقطب –المستقبل لهذا الدين –دار الشروق\بيروت ص٤٤–٤٥

3 Devine Right Theory –Haq,1969,p٦٣

نفس للسلاطين الفائقة، لانه ليس سلطان الا من الله، والسلاطين الكائنة هي مرتبة من الله، 2حتى ان من يقاوم السلطان يقاوم ترتيب الله، والمقاومون سياخذون لانفسهم دينونة 3 .فان الحكام ليسوا خوفا للاعمال الصالحة بل للشريرة. افتريد ان لا تخاف السلطان؟ افعل الصلاح فيكون لك مدح منه، 4لانه خادم الله للصلاح! ولكن ان فعلت الشر فخف، لانه لا يحمل السيف عبثا، اذ هو خادم الله، منتقم للغضب من الذي يفعل الشر 5 .لذلك يلزم ان يخضع له، ليس بسبب الغضب فقط، بل ايضا بسبب الضمير 6 .فانكم لاجل هذا توفون الجزية ايضا، اذ هم خدام الله مواظبون على ذلك بعينه 7 .فاعطوا الجميع حقوقهم :الجزية لمن له الجزية. الجباية لمن له الجباية. والخوف لمن له الخوف. والاكرام لمن له الاكرام) [١] ، دوای ئەوانەش زۆربەی جار پاپا فەرمانی وای داوە کە یاخی بوون لە دەسەلات یاخی بوونە لە مسیح [٢] ، لە ئەزمونی ئیسلامیش هاوشێوەی بەدی دەکرێت لەبارەی حوکمی خوایی لەسەر زەوی دوورترینیان لە سیاسەت ابن تیمیەیە کەدەلێت:(أن السلطان ظل الله في الأرض ) [٣] ، ئەو تێڕوانینانە بوونە گەورەترین لەمپەر لەبەردەم پێشکەوتنی کۆمەڵگە، لەبەر ئەوە کۆمەڵگە پێویستی بە سیستەمێکی تر بوو لە بری ئەو وەك عەلمانیەت بۆ ئەوەی شوێنی دەسەڵاتی کەنیسە بگرێتەوە. لە دەرەنجامی ئەمە عەلمانیەت بە شێوەیەکی خێرا بڵاوبووەوە.

**٢–پێشکەوتنی زانستی**: لەو ماوەیەدا کە ئاماژەمان پێدا، دۆزینەوەی زانستی گەورە دەرکەوتن بە تایبەت لە بواری گەردووناسی، بیروباوەڕی مەسیحی لەبارەی گەردوون لەو هزرانەوە هاتبوون کە لە پەرتوکی (مجستی) [(٤)] ی (بەتلیمۆس) [(١)]

---

[١] كتاب المقدس– رسالة بولس الرسول الى اهل رومية اصحاح ١٣ .

[٢] توماس هوبز–اللفياثان الاصول الطبيعة والسياسة لسلطة الدولة ص٦٥٢

[٣] مجموع الفتاوى ج٢٨ ص٢٩٠-٢٩١ .

[(٤)] مجستى واتة: رِيَكخستن.

هاتوون کە باوەڕی وابوو گەردوون بیٚ سەرەتا و بیٚ کۆتایە وەك کات و شوێن سنووری نییە، زەویش سەنتەرە هەموو پێکهاتەکانی بوون بە دەوری دەخولێنەوە، لەگەڵ هەندیٚ هزری ئەفسانەیی تر، بۆ نمونە (هرکلیتس) پێی وابوو ڕۆژ تەنێکە بەیانیان گڕ دەگرێت و ئێوارانیش دەکوژێتەوە[٢]، دواتر جیاکاریان دەکرد لە نێوان ئەوەی زەمینییە و ئەوەشی ئاسمانیە، یەکەم کەس کە ئەم بیروباوەڕە گەردووناسیە (بەتلیمۆسیە)ی هێنایە ناو بیروباوەڕی مەسیحی (تۆماس ئەکوینی) بوو ساڵی (١٢٢٥ _ ١٢٧٤ز) [٣]،دەگۆتریٚ یەکەم جار لەسەر دەستی موعتەزیلەش ئەو بیروباوەڕە گەردوونیە هاتۆتە نێو عەقیدەی ئیسلامی، بەتەواوی نەبوەبەشێك لە عەقیدەی ئیسلامی بەهۆی قایل نەبوونی بەشیك لە فەیلەسوفان لەوانە (کندی وغزالی وابوعلای معری اخوان الصفاو..)[٤] ،بەلام بالی فقهی بەتەواوی کەوتە نێوبۆچونیکی تری گەردونی ئەویش (چەسپاوی زەوی ) وسوڕانی ئاسمان ،لەوبارەیەوە (ابو حسین بن المنادی ) دەڵێت: (لاخلاف بین العلماءفی ان الارض مثل القبة وان العالم مثل الکرة وانهاتدوربمافیها من الکواکب ثابتین غیرمتحرکین ،احدهما فی ناحیة الشمال والاخر فی ناحیة الجنوب کرو الارض مثبتة وسط السماء کالنقطة من الدائرة)[٥]،زاناياني سەلەفی سعودیە تائەو ساتەش ئەو ڕایانەی مەجەستیان هەیە لەبارەی گەردوون ، لە ناو شیعەش هەندی زانایانیان ئاوا وەك ئەوانەی سعودیە بەهەڵەداچووینە،

---

(١) ینظر أ—الموسوعة العربیة العالمیة... المصدرالسابق ج١٦ص٤١٥ ب—د.علی الأمیر —الکون العمیق —ط١ ١٩٩١، دار الشروق الثقافة العامة، بغدادص٢٨٥.

(٢) جمهوریة افلاتون —تعریب:حنا الخباز، دار القلم —بیروت، ط٢\١٩٨٠ ص١٩٠.

(٣) ینظر: أ— الموسوعة العربیة العالمیة.. المصدر السابق ج١١ ص٤١٥ ب—الموسوعةالفلسفیة.. المصدرالسابق ص٧١.

٤ من رسائل اخوان الصفاء وخلان الوفاء رسالة رقم ٢٦ص٣٠، موفەکیروشاعیریکی وەك ابوالعلا المعری کەناوی بەمولحید ڕۆیشتوە کەچی باوەڕی بە (قدم العالم)نەبوە وەك لەودیرە شیعرەی دەردەکەوی: ولیس اعتقادي خلود النجوم ولا مذهبي قدم العالم

٥ اخبار الدول واثار الدول فی التاریخ- احمدبن یوسف القارمانی ص٢٥

لە(شرح أصول الكافي - مولي محمد صالح المازندراني - ج ١ - ص ١٧) ﴿ شرح المقدمة ﴾ ونصلي على سيد أنبيائك وأشرف أوليائك صلاة دائمة ما دامت الأرض ساكنة والفلك دوارا ...،ئەوە لەکاتێکا بوە زانایانی ئەکادیمی ئاینی ئیسلام ئەو ڕایەیان نەبوە ، بەپێی هەندێ سەرچاوە (قەزوینی ) پیش کۆپەرنیکۆس باسی سوڕانی زەوی کردوە[1]، یاقوت حموی دەلی: (وقال قوم الأرض تهوي إلى ما لا نهاية له والسماء ترتفع إلى ما لا نهاية له. وقال قوم إن الذي يرى من دورانا لكواكب إنما هو دور الأرض لا دور الفلك)٢ ،مەقدیسی هەمان ڕاستی دەلێ ،ئەلبیرۆنی لە٩٧٣ زانیویەتی زەوی خڕەو نیوەتیرەشی دۆزیتەوە، ئەبوبکر رازی زانیویەتی زەوی خڕەو رۆژلە زەوی گەورەترەو مانگیش لەو بچوك ترە ئەلبیرۆنی و زۆری تر پیشی گالیلۆ ووتویانە زەوی خڕەو ئەو دەسوڕێ نەك ئاسمان ،لە هەموان روون تر هەریەکە لە(شریف جرجانی و عبدالرحمن ئیجی))باسی سوڕانی زەویان کردوە ووتویانە سوڕانەوەکەشی بەپیچەوانەیە لە رۆژئاواوە بۆ رۆژهەلاتە[3]...بەلام ئەو زانیاریانە شاردراونەتەوەودژایەتیان کراوە ، دواتر لەرۆژئاواهەر یەکە لە کۆپەرنیکۆ، کالیلۆ، کیلبەر، جۆردانۆ بوونە خاوەنی ئەوداهێنانە...شۆڕشی گەردونیان دەستپیکرد کە دژی بیروباوەڕی مسیحی وعەقیدەی فقهی ئیسلامیش بوو ، سەلماندیان کە زەوی سەنتەری بوون نییە، ئەستێرەش شوێنکەوتەیەکی بچوکە هیچ پیرۆزیەك یاخود جیاوازییەکی تایبەتی لە ئاسمانەوە نییە. یاخود بە پێچەوانەوە، هەر دووکیان لە هەمان ڕەگەز پێکدێن.

بەم شێوەیە زانست دەستکەوتی گرنگی لە فیزیا و کیمیا و بایلۆجی و زانستە مرۆڤایەتی و کۆمەلّایەتیەکان و (ئەنسرۆپۆلۆجیا) و تیۆری زانستی تر

---

[1] بڕوانە: صورة الأرض- احمدعلامة،دارالفتى العربى للنشر ص٣٦

[2] ياقوت حموى –معجم البلدان ج١ ص٢.

[3] الشريف الجرجانى –شرح المواقف ص٤٠٥

بەتایبەت (تیۆری پەرەسەندن) بە دەستهێنا، لە هەر هەنگاوێکی زانستی کەنیسە دژایەتی دەکرد، ململانێکە بە سەرکەوتنی زانست و شکستی کەنیسە کۆتایی هات،بەهەمان شێوە لەجیهانی ئیسلامیش،هەمو ئەوانە پاڵینا بە (هوایهید) بڵێت: (لە هەر بابەتێك کە ئاین و زانست تێیدا ناکۆك بن زانست دەڵێت ئاین بێدەنگبە)) [١]، (ئینگلیس) قسەی لەسەر ئەم دیمەنە کردووە و دەڵێت: ئاینی خوا بە شکستی جەنەڕاڵەکان (فریدریك ولیامی سێیەم) دەچێت کاتێك قەڵا لە دوای قەڵا دەکەوتنە دەستی دوژمنان[٢]، ئەمەش سەری بۆ ئەوە کێشا کە بڵێن عەقڵی ئاینی ناتەواوە هەروەك هەر یەکە لە (ئەرمنست همنغوای) و (ستاندال) و (کارل مارکس) و (فیورباخ) زۆرێکی تر ئەمەیان وت[٣].

بەم شێوەیە کەنیسە دژی سەرکەوتنە عەقڵیو زانستی و سەردەمیەکان بوو، بۆ پشتڕاستکردنەوەی قسەی هەر یەکە لە (ئەبو عەلای مەعەری) و (دانتی) کاتێك وتیان: خەڵکی سەر زەوی دوو جۆرن: یان پیاوێکە خاوەن عەقڵە و هیچ ئاینی نییە، یاخود خاوەن ئاینە هیچ عەقڵی نییە[٤]، عەلمانیەت بووە لایەنی عەقڵی و زانستی (پیاوێکی خاوەن عەقڵ) دژ بە هزرە ئەفسانەییە ئاینیەکان (پیاوێك کە خاوەن عەقڵی نییە)، هەر کاتێك عەقڵی مرۆیی پێشکەوتنێك بە

---

(١) موسوعة الميسرة ... مادة:علمانية .. المصدرالسابق ص٣٧١.

(٢) فريدريك انجلس–ديالكتيك الطبيعة ص٢٣٠.

(٣) للمزيد ينظر: كارل ماركس–بؤس الفلسفة ص٢٥٦. روجيه غارودى–ماركسية قرن عشرين ص١٤٥ ، المثالية والمادية وازمة العصر ص٩٥ كذلك ينظر:كتاب(atheist universe) بالغة الإنكليزية من تأليف: (ديفيدميلين) مكون من ١٢فصل.

(٤) شبلي العيسمى – علمانية .. المصدرالسابق ص٣٧.

دەست هێنا یاسەیەکی دۆزیەوە و ئامرازێکی داهێنا عەلمانیەت فراوان دەبێت و لە بەرامبەردا ئاین لاواز دەبێت[١]. بۆ زیاتر بڕوانە خشتەی ژمارە _ ١ _

**٣-گۆڕانی دەرەبەگایەتی بۆ سەمایەداری:** قۆناغی دەرەبەگایەتی تا ڕادەیەکی دیاریکراو لەگەڵ بیروباوەڕ و ڕێڕەوی کەنیسە دەگونجا، بەڵام شۆڕشی پیشەسازی کە بۆ یەکەم جار لە بەریتانیا سەریهەڵدا دواتر بە هەموو ئەورووپا بڵاوبوەوە، دەرەنجامی ئابوری و کۆمەڵایەتی و شارستانی گرنگی هەبوو، کە بووە هۆی دەرکەوتنی سیستەمی عەلمانی کە گونجاو بوو لەگەڵ بازاڕی ئازاد و بانك و سیستەمی پیشەسازی .. هەموو بابەتەکانی تری نوێگەری ومەدەنی وعەلمانی .

**٤- هۆکاری مێژوویی:** لە میانەی سەرهەڵدان و گەشەکردنی عەلمانیەت باسمان کرد بە تایبەت بۆشایی ئاینی لە مەسیحیەت کە بۆ دوارۆژی وازی لە دونیا هێنا بەگوێرەی باوەڕی خۆیان: (نیشتمانی من ئەم دونیایە نییە) _ دواتر عەلمانیەت بووە پێویستیەکی مێژوویی[٢] .

**٥- گۆڕانی ئیمپراتۆریەکان بۆ دەوڵەتی نیشتمانی و نەتەوەیی نویێ:** ئەمە بووە هۆی دروستبوونی گۆڕانکاری گرنگ، کە دەسەڵاتی کەنیسەی هەڵتەکاند، لەگەڵێشی گۆڕانی هزری و سیاسی و کۆمەڵایەتی و شارستانی و یاسایی هاتن. هەموویان لە بەرژەوەندی عەلمانیەت بوون، وەك ئەمانە:

[١] ئایا تێکەڵی لە تێگەیشتن لە عەلمانیەت لێرەوە هاتووە کە گوایە نوێنەرایەتی بۆچوونی زانستی دەکات بە تایبەت لە جیهانی ئیسلامی.

[٢] پێویستە لە میانەی ئەم چوارچێوەیەی عەلمانیەت تێبینی بکرێ کە پێویستی دۆخی ئاینییە (مەسیحی) و کۆمەڵگەی ئەورۆپی.

أ/ لە ڕووی هزریەوە: لایەنگیری ئایدۆلۆژی لە هەناوی لایەنی ئاینی و کۆمەڵایەتی هاتنە بوون، هەروەك مەزهەبی مادی فەلسەفی لە مەزهەبی میسالی دروستبوو.

ب/ لە ڕووی سیاسیەوە: مەزهەبی میکیافیلی لە سیاسەت دروست بوو، دواتر گۆڕا بۆ لایەنگیری ستوونی کۆمەڵایەتی بۆ ئاسۆیی مەدەنی، سیۆکراتی بۆ دیموکراسی، ئیمپراتۆری بۆ پادشایەتی و کۆماری.

ت/لە ڕووی ئابووریەوە: سەرمایەداری لە هەناوی دەرەبەگایەتی دروستبوو، بەم شێوەیەش پیشەسازی لە کشتوکاڵ کە بووە دەرکەوتنی بەرژەوەندی تاکەکەسی، گۆڕینی سەنتەری قورسایی لە گوندەوە بۆ شار، لە دەشتەکیەوە بۆ نیشتمان و شارستانیەت، لە خاوەندارێتی زەویەکانیەوە بۆ خاوەندارێتی ئامرازەکانی بەرهەمهێنان.

پ/ لە ڕووی کۆمەڵایەتیەوە: سەرهەڵدانی هزری نەتەوەیی لە گۆڕینی لایەنگیری تیرەگەرێتی بۆ لایەنگیری نەتەوەیی، بورجوازی لە دەرەبەگایەتی، ئازادبوونی عەقڵی تاك لە عەقڵی دەستە کۆمەڵی، گۆڕانی چینی جوتیاران بە پلەبەندی بۆ کرێکاران.

ت/ لە ڕووی یاساییەوە: گۆڕانی عورف و نەریت بۆ یاساکان، یاسا ئاینیەکان بۆ دەستور، ئەنجومەنی کەنیسە بۆ پەرلەمانەکان، لە دەسەڵاتی ئاینی بۆ دەسەڵاتی یاساییە، لە گەورەیی بۆ سەروەری[١]. پەیوەندی یاسایی لە نێوان هەرێم (نیشتمان) و گەل (نەتەوە) و دەسەڵاتی سیاسی دروستبوو.

ج/ لە ڕووی ئاینییەوە: دەسەڵاتی ئاینی گۆڕا بۆ دەسەڵاتی عەلمانی.

---

(١) لە پرۆتۆکۆلەکانی دەسەڵاتدارەکانی سەهیۆنیەت لە پرۆتۆکۆلی (١) تا (٥) لێچووی ئەم گۆڕانکاریانەی باسکردووە.

بەم شێوەیە ڕووداوی گۆڕانکاری ڕەگ و ڕیشەیی لە جیهان دروستبوو، دەوڵەتی نویێ دەرکەوتن، عەقڵ بوژایەوە، سیاسەت و کۆمەڵگە وەك تەقینەوەیەك بەرەو عەلمانیەت دەرکەوتن.

| | عەلمانیەت | دەسەڵاتی ئاینی |
|---|---|---|
| ١ | عەقڵانی و زانستی | نا عەقڵانی و نەزانی |
| ٢ | پێشکەوتن | دواکەوتوویی |
| ٣ | لێهاتوویی | پشتاوپشتی |
| ٤ | دیموکراسی | سیۆکراتی |
| ٥ | کۆماری یاخود (پادشایەتی دەستوری) | ئیمپراتۆری |
| ٦ | مرۆیی، زەمینی، دونیایی | ئاینی، ئاسمانی، دوارۆژی، چاوەڕوانکراو |
| ٧ | نوێگەری | دەمارگیری |
| ٨ | یاسایی دەستکردی پێشکەوتوو | یاساگەلێکی دەشتەکی |
| ٩ | مەدەنی | تیرەگەرێتی |
| ١٠ | گرنگیدان بە ئێستا | پیرۆزکردنی ڕابردوو یاخود گرنگیدان بە دوارۆژ |
| ١١ | نوێگەری و عەلمانیەت لەگەڵ ڕۆژگار | مانەوە و دورەپەرێزی لەگەڵ سەردەم |
| ١٢ | ڕۆیشتن لەگەڵ مێژوو | پێچەوانەی ئەم ئاراستەیە |

خشتەی ژمارە _١_ بەگوێرەی تێگەیشتنی عەلمانیەت

## مقەوەمات وگەشەی عەلمانی

ئەگەر بەووردی سەرنج بدەینە هەورازونشێوی عەلمانی ودەهری وپەیوەندیدارەکانی دەبینین لەکۆنەوە تا ئەو ساتە مقەوەماتی وپاساوی مانەوەو گەشەی زۆر ناوەستێتە سەر هۆکارە ناوەکیەکانی خۆی،بەلکو دەکەوێتە سەر ستاندەر نەبوونی پیادەی ئاین لەناوکۆمەلگە ، هەلە بکە عەلمانی ئامادەیە بەدروستی ودادگەری ئاین پیادە بکە

عەلمانی ئۆتۆماتیکی نەماوە ،زیاترلە پاساوو مقەوەماتی عەلمانی لە مێژوو ولە ئێستا دەردەکەوێ بەو شێوەیەی خوارەوە :

لە مێژوودا: ناکرێ ئەوهەموو زانیاری و ڕێبازە دوور و درێژەی عەلمانی ودەهری بە سادەیی و نەزانی و (ئارەزوو بە زولم) پۆلین بکەین، دەتوانین بلێین بەلای کەمی ئەو واقیعەی ئیستای جیهان لە پیشکەوتن وخۆشگوزەرانی وپەیوەندیە نیودەولەتی ومافەکان ومەدەنیەت ودیموکراسی وسەروەری یاسا وبنەمای هاوولاتی بوون..لەلای فەلسەفەی نائاینی هاتوە، بابزانین گرنگترین ئەو هۆکارانە چین کە یارمەتی عەلمانی دەدا، زۆر بە کورتی ئەوانەن:

١- لە دوای دورکەوتنەوەی (زەمانی ومەکانی) پەیامی ئایینەکان لەسەرچاوەکانی (واتە دوای نەمانی پێغەمبەرەکان) ئەوا کۆمەلێك گۆڕانکاری بەسەردێت بەهۆکاری جیاجیای نەریت و ئاستی زانیاری خەلکی و هەندێکیش بە ئەنقەست لەلایەن دەسەلاتدارانەوە، ئایین پەروەریەکە کاڵ و سادە دەبێتەوە، گەلێ جار لە ناوەڕۆك و قورساییە زانستیەکەی دەپچڕێ، دەبێتە نەریت و کاری سۆفیگەرایی و پاککردنەوەی دەرون، ئەوکاتیش هەموو ڕوداوێك دەدرێتە پاڵ خودا، ئەوەیان لەسێ ئایینە خاوەن کتێبە ئاسمانیەکەش بەدی دەکرێ، لەتەورات و ئینجیل بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ، لە ئایینی ئیسلام ئەو خەلەلە لەخودی قورئان و فەرمودەی دروست بەدی ناکرێ بەلام لە فیقهی ئیسلامی و عەقیدە بەدی دەکرێ، دەلێن هەرچی ڕوودەدا لەباران بارینەوە لە بروسك و گرکان و مانگ و ڕۆژگیران تا ڕووداوە کۆمەلایەتیەکان و مردن،.. هەمووی دەلێن بە ئەمری خودایە(تیۆری المشیئه) پشت بەو ئایەتەی (والی الله ترجع الامور)[1] دەبەسترێ،، لە نێو مەسیحیەکانیش نەك قەشەکان بەلکو فەیلەسوفەکانیشیان لە ڕەدی

[1] سورة الحدید ایة٥ .

سپینۆزا دەیان ووت هەرچی ڕوودەدا بە ئیرادەی خوا ڕوودەدا ڕاستەوخۆ[١]، وادێننە بەرچاو کە خودا زۆرسەرقال وماندوو بێت بە سوڕانی ئەستێرەو زەوی ورۆژومانگ ومەخلوقاتی تر ،نەیان زانیە خوای گەورە یاسای بۆ هەمو (خلق) داناوە (الا لە الخلق والامر)واتە خودا خەلقی نەکردوون بە عەبەسی بەلکو (امر)ویاساشی بۆ داناون ،کە پێیان دەلێن یاسای سروشتی ،بەتایبەتی (قانون السببیە) کرۆکی فلسفەی ئاینیە،لێرەوە گەورەترین وەلامی دیزمیەکانیشە کە پێیان وایە خودا تەنها دروستکەرە بەڕێوەبەر نیە ،لێرە کەدەلێ (خالق وئامیر) واتە بەڕێوەبەریشە ، ڕوون نەکردنەوەی ئەو بڕگەیە سەرچاوەی زۆربەی خالەکانی تری خواروودەبێت کەوەك پارادۆکسی دینی دەردەکەوێ .

٢- زاناو بیریارانی عەلمانی لەلای ئاینی گوێیان لێدەبێت دەلێن خودا بۆ خۆی هەمو کارەکانی زەوی وئاسمان دەکا ،کەچی...لەسەرەتای سەرهەلّدانی مرۆڤایەتیەوە تائەو ساتەلەکاتی پێویست وکارەساتی سروشتی و کۆمەلاّیەتیدا، لەکاتی زولّمی بەشەری لەزۆرکاتی تر هەست بەبونی ڕاستەوخۆی دەستی خوایی ناکرێ بۆ کۆتایی هێنان بە مەینەتیەکان.

٣- هەر لەپەیوەست بە خالی (٢) وکارەساتەکان زۆر لە خوا دەپاڕێنەوە کەچی هەر زۆردارە بەسەر هەژار سەردەکەوێ، یەکێ لەعەلمانیە توندەکانی عەرەبی ئەو سەردەمە دەلێ: لەسالی ١٩٤٨ ەوە عەرەب ویەك ملیار موسولّمان دوعا دژ بە ئیسرائیل دەکەن کەچی سەرکەوتن هەر بۆ ئیسرائیلەو شکستیش بۆ عەرەب، لە ئەنفالەکان زولمی ئەوەندەگەورە لە ژن ومندالی کورد بە شیوەیەکی وا کرابە زیندوویی لە ژێر خاك بنرێن..کەچی هەردوعا دەکراو وەلاّمی دەماودەست نەبوو، وەك لائیکێکی کورد دەلّێ هەمو ئەو دوعایانە ناکاتە بەرگریەك کە

---

[١] سپینوزا لە کتیبی (الاخلاق)وەلامی ئەوانەی دایتەوە –دیالکتیك الطبیعة ص٢٣١ .

بەدەستی خۆت دەیکەی، لە زۆربەی هەرە زۆری خانەوادە کۆنەکان (ئیستاش) هەر دوعای (کورٍ) بوون کراوە کەچی ڕێژەی کچ وەك کورە ئەگەر زیاتر نەبیَ[1] ، کەچی کورٍ بوون وکچ بوون یاسای مەندل دیاری دەکا..کاری ڕۆژانەمان وژیان بریتیە لە پەیڕەوی یاسای سروشتی و(هۆوئەنجام)نەك دوعاو تەوەکول، بۆیە (هینزپاچلیز)لەکتێبی(دستور الكون) ئەو یاسایا سروشتیانەی ناونا دەستوری گەردون [2]..ئەوە مانای ئەوە نیە دوعا نەکەی بەلکو دوعا بۆقیامەت و وەك عیبادەت بکە بەلام بۆ دنیا کار بکە بە پێی یاساکان ئەنجامی دەبێت .

٤- لەسەر ئەو بنچینەی ئەو دوو خالەی سەروو هەر هەولدراوە یاسا بدۆزرێتەوە بۆ ڕووداوەکان هۆکار بدۆزرێتەوە ،کە (لاپلاس) کۆمەلیك یاسای سروشتی دۆزراوەی ڕێزکرد ،لە وەلآمی پرسیارێکی ناپلیۆن(کە ووتبووی کوا ڕۆلی خودا لە فەلسەفەی تۆ)  ووتی : پێویستمان بە خوا نەما یاسامان دۆزیتەوە[3]، یان وەك هولباخ لە(نڤام الگبیعە) بلی ئەوەتە یاساکانی سروشت و(هۆوئەنجام)م دۆزیەوە لە سروشت چیتر پێویست ناکا بلین بە تەمای خوا، ئیتر هەرچی دۆزینەوەو پیشکەوتنێك تۆماتیکیانە گورزبوە لە ئاین(لە ژێر ئەوجۆرە فقهە ئاینیە) وسەرکەوتن بوە بۆ عەلمانیەت ،تۆماس هۆبزیش پیش ئەو یەکەم جار بەبیَ پەردە لە سالانی ١٦٥١ ووتی کتێبی موقەدەس وعیساو موسا هیچ پەیوەندیان بەیەکەوە نیە، ئیکۆرن لە١٧٧٩ زۆر بەتوند تر دابەزیە سەر کتێبی موقەدەس وبە خرافیاتی وەسف کرد، سپینوزا لە کتێبی(رسالە فی اللاهوت والفلسفە) بەیەکجاری کتاب المقدسی تەرت و ویران کرد، هەریەکە لە جورج ئەلیوت،

---

[1] لە کتیبی(ئافرەت لە نیوان عەلمانی وئاینیدا)-نوسەر بەدرێژی باسی هۆکارە سروشتیەکانی ڕێژەی زیادی ئافرەت بەرامبەر پیاو کراوە.

[2] بڕوانە: بۆل دیفیز- الإقتراب من اللة- ص٩٨ ئەو کتیبە لە بنچینەدا ناوی(Mind of God) وای بە شیاو زانیوە ئاوای وەرگێڕی.

[3] دیالکتیك الطبیعة ص٢٢٩

جیمس فرود، جون ستوارت مل.. بەو مەنهەجە توندە دژ بە مسیحی و بیری ئاینی بووینە، هەمو ئەوانە وای کرد سەردەمی ئاین بەگشتی بە(سەردەمی تاریکی) وەسف بکەن،سەردەمی عەلمانیەت بە ڕووناکی وەسف بکەن .

٥- ناکۆکی نێوان فەلسەفەو ئاین: لەدوای بانگی پێغەمبەرەکان عادەتەن وا هاتوە ئەوانەی خۆیان بە میراتگری ئاینی زانیوە لەگەڵ عاقلمەندان ڕووبەڕوودەبێتەوە، ئەوەیان لە مێژووی ئیسلامەتیدا زیاتر شێوەی ناکۆکی نێوان فقهو فەلسەفەی وەرگرتوە.. بەو شێوەیە ئەو ناکۆکیە توندە لە نێو ئیسلام بە توومەتی توندی کافرو مولحید دەستی پێکردو لە ناو مسیحیش بە سوتان وئیعدام دەستی پێکرد، لە کتێبە فقهیەکان هەریەکە لە ئیبن سینا وفارابی وتوسی وجاحیزو سیف الدین ئامیدی وزۆری تر بە کافرو دەهری وەسف کراون، هەندێکی بە نمونە وەردەگرین(بڕوانە پەڕاوێز)[1] ابن تیمیە:(کان ابن سینا وأمثالە وهؤلاء وأمثالهم من رءوس الملاحدة الباطنیة إلحادا أعظم من إلحاد الیهود والنصاری)٢ لة(ج١ درء التعارض) لیستیکی دوورو درێژی لەفەیلەسوف ومدرسەکان ڕێز کردوە (جگە لەوانەی سەروو هەریەکە لە: ابن عربی ومبشر بن فاتك، سروردی، سۆفیەکان، ئیخوان سەفا، موعتەزیلە، کلابیە، شیعە، سالمیە، تراقیە..)

٦- لەهەموی گرنگتر زۆربەی ئاینەکان لەدوای پیغمبەرەکان دووچاری دەبوو دووردەکەوتەوە لە پیادەکردنی دادگەری(شەریعەت)وگرنگی دان بە دنیا ،بە خێرایی دیمەنی دنیا وژیان بە ناشرین پیشان دەدرێ ،دنیا بۆگەنیەو هەڵخەڵەتێنەرەو ..بەو شێوە ئاین پەروەری وتەرکی دنیا پێکوە بەسترا، بۆ ئەوەی کۆمەڵگە ئەوەندە سەرقاڵی دژایەتی حوکمی گەندەڵ نەبیت وبڵێن ئەوە دانانی خودایە ئیمە چمان پیناکرێ ، ئەو بۆچوونە لەنگانە یەکەم جار لەسەر ئاستی

---

[1] إغاثة اللهفان ج٢ ص٢٦٧، شفاء العلیل ص١٤، درء التعارض ج1ص٢٨٩ الجواب الصحیح ج٤ ص463 ...

[2] درء التعارض العقل والنقل ج١ ص٢٨٩

**دەق لەلای مسیحی هات،لە ئینجیل هاتوە** : (فلا تهتموا للغد.لأن الغديهتم بما لنفسه.يكفي اليوم شره )[١]،**هەمان فتوا لەلایەن ئیمامی شافیعی بە شیعر هاتوە:**

سهرت أعين ونامت عيون .. . .في أمور تكون أو لا تكون

فادرأ الهم ما استطعت عن النفس . . فحملانك الهموم جنون

إن ربا كفاك بالأمس ما كان .... .سيكفيك في غد ما يكون

**هەرلەوەشەوە ئایین درایە پاڵ چینی چەوسێنەر، بە ڕوون تر قدیس ئۆکستین لە کتێبی (ملکوت الله) دەڵێ (بۆیە خوا عەبدایەتی داهیناوەك سزا بۆیە هەرتەقەلایەك بۆ هەلوەشاندنەوەی سیستەمی عەبدایەتی ئەوە یاخی بوونە لە فەرمانی خودا)[٢]. لەفقهی ئیسلامیش ئەو دۆخە بەدی دەکرێچەندین ئیمام ووتویانە ئەگەر ستەمت لێکرا بەرگری مەکە هەلیگرە بۆ دوا ڕۆژ خوا تۆلەت بۆ دەکاتەوە ،ووتویانە**:( اذا كان الحاكم عادلافله الأجر وعليك الشكر واذاكان ظالما فعليه الوزر وعليك الصبر)٣، ( ونقل عبد الكريم الخطيب قول الحسن البصري :ألا لا تسبوا الولاة فإنهم ان أحسنوا فلهم الأجر وعليكم الشكر، و ان أساؤوا فعليهم الوزر وعليكم الصبر، وإنما هم نقمة ينتقم الله بهم من يشاء فلا تستقبلوا نقمة) ، **لەوەوە (بارون دولباخ )ووتی ئاین هونەری سڕ کردنی میلەتانە تا هەست بە چەوسانەوە نەکەن[٤]، دوای ئەویش ڕێسای(ئاین تلیاکی گەلان**– **الدين افيون الشعوب) لەلای مارکس هات[٥]، ئەوەیان دوای بوە بنچینەی سیستەمی عەلمانی ، تا وای لێهات لە لیکجیاکردنەوە نەوەستا بوە ڕووبەڕووبوونەوەی: عەقڵ ونەقل،**

[١].كتاب المقدس-العهد الجديد مت(٣٤:٦).

[٢]ماركسية قرن عشرين ص١٤٦

[٣]د محمد شحرور–الكتاب والقران ص١٠١ص٦٢٠

[٤]روجيه غارودى –ماركسية قرن عشرين ت:نزيه الحكيم ص١٤٣

[٥]. دەقی ووتەکەی مارکس لە کتێبی (نحو نقد لفلسفة الحق الهيجلية- ١٨٤٤م) وانوسراوة: إن الهم الديني هو في الوقت نفسه تعبير عن هم واقعي واحتجاج علي هم واقعي. إن الدين هو آهة الخليقة المضطهدة، هو قلب عالم لا قلب له، مثلما هو روح وضع بلا روح. إنه أفيون الشعب.

زانست و ئایین، تەکنەلۆژیا ودوعا، موختەبەروفیقەه، مۆدێرن و فکری کۆن...، وەك (ابو علی المعری) و (هوایتهد–لە سەدەی بیست دووبارەی کردەوە) ووتیان: سەرکەوتن بۆ زانست و مۆدێرنەو شکستیش بۆ ئاین[1]، هەرلەوەشەوە (همنکوای) دەڵێ بەسروشتی خۆی هەمو عاقلێك بێئاینی دەبێ، بی عەقلیش ئاینی دەبێ، مارکس پێی وایە بۆ ئەوەی ئایندار بێت پێویستی بە ئەقلێکی لەنگ هەیە ئەقلی دروست ئاینی قەبوول نیە[2]، واتە بۆ جیبوونەوەی ئاینی لەکۆمەڵگە پێویست بە عەقڵی لەنگ هەیە، مەرگی ئاین لەگەڵ پێشکەوتنی عەقلە. زۆربەی موفەکیرانی عەلمانی عەرەبیش ئەو ڕایەیان هەبوە لە نوێیەکەیان عبدالمنعم الحفنی دەڵێت: سەرم سوڕماوە لە هەندی عاقڵمەند چۆن یەکسەر تەسلیمی فەلسەفەی مادی وعەلمانی نابن کە تاکە چارەنوسیانە[3].

ئەوەی ئەو ڕایانە گەواهی دەدا ڕەوتی فکری ئەو جۆرە ئاینپەروەرانەیە ، عەقل و حیکمەت وفلسفە لایان جێگەی ڕێز نیە ،تەنانەت عەقلانیەت توومەتە ،بۆیەش لەگەل هەر داهێنانێك یەکەم جار ڕووبەڕووی بووینە ئینجا تەسلیمی بووینە ، ئەگەر بەورد تر سەرنج بدەین دەبینین ئیمانداران لەسەرەتادا دژی دەزگای چاپ بوونە یەکەم جار لە سالی ١٦١٠دەزگای چاپ هاتە لبنان زانا فقهیەکان یەکەم جار حرامیان کرد گوتیان ئەوە دروستکراوی کافرە، بەرەبەرە شلیان کردو ووتیان تەنها قورئان نابێ چاپ بکرێ دوای ئەویش نەما، دیسان بۆ رادیۆ، دوایی چونە سەرمانگ، بەکورتی دژی خوێندنیش بوونە و بە عیلمی

[1] شبلی عیسمی لە(العلمانیە والدولە الدینیە ص١٠٥) دەلیت شیخ محمد عبدەش ئەو بۆچوونەی هەبوە: ((اذا تعرض العقل والنقل أخذ بما دل علیە العقل)تا رِادةيةك (رازى)يش ئةو بؤضونةى هةبوو.

[111] كارل ماركس–بؤس الفلسفة ص٢٥٦نامةكةى ماركس بؤ ئينينكؤف.

[3] المثالية والمادية وازمة العصر ص٩٥

شەیتان وەسفیان کردووە، دوایی تەسلیمی هەموویان بوون، هەرە دواییەکەی کە زۆر دژی حیزب بوون، ئێستا وا حیزبی ئایینی دروست دەکەن..
ئەوانە هەموو کاریگەریەکەی دەگاتە زەمینەی سایکۆلۆجی (کەگوایە) عەقڵ و کاری مرۆڤ ئەسلە و ئایینیش لاواز و شوێنکەوتەیە وجێی لەسەردەمی مودێرنەو شارستانی نویێ نابێتەوە،ئەوەش گەورەترین مقەوەماتی (مانەوەو گەشەی) عەلمانی پێك دەهێنێ .

## پاساوە نوێیەکانی عەلمانیەت

**لەو سەردەمە کە سیستەمی عەلمانیەت زۆر گەشەی کردوەو زۆربەی جومگە سیاسی ویاسایە دەولی ودەڤەریەکانی گرتۆتەوە ، پەلی ئاویشتوە بۆ بواری کۆمەلایەتی وفکری وزانستی وزۆرلای تر،لەو سەردەمەی کە بلۆکی شیوعیەت شکستی هێنا وبزوتنەوە ئیسلامیە کلاسیکیەکانیش کەوتونەتە قەیران ،هەول دەدرێ سیستەمی عەلمانیەت وا پیشان بدرێ کە دەرمانی هەمو دەردانە ولە سەرووی ناکۆکی وراڕەو مەدرەسەکان بێت ،جاروایە دەلێن بێلایەنەهەتا بەرامبەر ئاینەکان،بەلکو سودبەخشەو نێوانی ئەوانیش ریکدێخی ،بەو شێوەیە تیکەلی دەکەن لەگەل زانست وعەقلانی ودیموکراسی ، بەو وەسفە جوانە ولە ژێر سایەی ئەو دابەشیەی جیهانی ئیسلامی و شەڕی تایفی و خوێن ڕشتنە ..زۆرێك لە زانایانی ئاینی وسەرکردەی حزبی ئیسلامیش تەسلیمی ئەو وەسفانە بووینە ، لەوەش زیاتر هەندێکیان تەنزیریش بۆ ئەو هەلویستەیان دەکەن ،دەلێن خودا گەردوون وسروشتی بۆ ئیمە دروست کردوە (وەك وەبەر هێنەرێك)ئەو زەویەی بە ئێمە داوە خۆمان حوکمی خۆمان جوان بکەین ئەو ئەوەندە هەقی بەسەرمان دانیە .**

**لەو ڕووەوە ( موسا بن میمون) دەڵێ پێش ئەوەی خوا پیغمبەریك هەلبژێری خۆی ئەو قابیلیەتەی هەبوە واتە پیغمبەرایەتیش بەدەست مرۆڤ خۆیتی دەتوانی وابكا خۆی بگەیەنیتە ئەو ئاستە –ئەو ڕایە زیاتر بەلای دیزمیە(ربوبیە) كە تیایدا كەمتر خواوەند دەست لەكاروباری بوونەوەر وەدەدا، فارابیش تا ڕادەیەك وەها ڕایەكی هەیە لەكتیبەكەی (فی السیاسە المدنیە)[1]، لەو سەردەمەش بەشێك ئەو ڕایەیان هەیە لەوانە (زانای ئیرانی عبدالكریم سروش) تێكڕا پێیان وایە لەوانیش سیۆكراتی نیە بەلكو عەقلی بەشەریە ،سپینوزاو دیكارت هەریەكە بە جۆرێك ڕایەكی وایان هەیەو دەلێن پیویست بە پەیامی دەرەكی(لای خودا)ناكا ئێمە پەیامی ناوەكیمان هەیە (كەفكرە)هەمان ڕۆل دەبینی،ئەركی فلسفە دۆزینەوەی ئەو ڕاستیانەیە[2]، بەلام( هۆبز)دەگەڕێتەوەو بەجۆریكی تر وەسفی پیغمبەر موسا بە فراوان تر دەكات ودەلیت خۆی وكاهینەكانی نوینەرایەتی خوا دەكەن[3]...، امام عبدالفتاح امام) لە پێشەكی كتێبی (المعتقدات الدینیە لدی الشعوب) بە ووتەیەكی (فارنكتون) دەست پێ دەكاو دەلێ:** (من أن فكر إذا ظهر في الغرب كان فيلسوفا وإذا ظهر في الشرق كان نبياً!). **هیگلیش ڕایەكی نزیك لەوە هەیەو دەلێ** (الأديان المختلفة ليست إلا مراتب مختلفة من نموا فكر البشری)[4]. **..هەمو ئەوانەزەمینەیەكە بۆ عەلمانیەتی نوێ كە بلێن مرۆڤ ئەوەل وئاخیرە پێویستی بە پەیام وڕێنمایی ئاینی نیە .**

---

[1] معجم المؤلفات السياسية ص١٩

[2] سبينوزا –رسالة فی الاهوت والسياسة ص٣٣٧ وص٣٦٣

[3] توماس هوبز- اللفياثان الاصول الطبيعةوالسياسة لسلطة الدولة ص٤٧٩

[4] ماركسية القرن العشرين ص١٥٣

**ئەگەر پاساوە کۆنەکان زیاتر نەزەری وفلسفی وفکری بووبن ئەوا پاساوە نوێیەکان زیاتر مەیدانین ،لە باشتری ئەزمونی حوکمی عەلمانی دێت لە حوکمی ئاینی ، حوکمیکی ئاینی ڕەسەن نا ، بەلکو جۆرە سیۆکراتیەك ، ستەم وباج ومیراتی ، هەر یاخیبوونێکیش لێیان سزایەکەی زۆر توند بوو وەك ئەوە وابوو لە خودا یاخی بیت، لە پەیامەکانی (پۆلسی ژ:١٣) بۆ میلەتی ڕۆمان هاتوە دەسەلات تەنها بۆ خودایە هەرچی ڕووبەڕووی دەسەلات ببیتەوە لە خوایاخی بوە-دەقەکەی:**(١ لتخضع كل نفس للسلاطين الفائقة، لانه ليس سلطان الا من الله، والسلاطين الكائنة هي مرتبة من الله، 2 حتى ان من يقاوم السلطان يقاوم ترتيب الله، والمقاومون سياخذون لانفسهم دينونة...)[١] ، **سیۆکراتی دەڵێ (ان الحكم الا لله)ئەوەیان لە هەمو ئاینەکانە ، خەلیفە سێبەری خودایە لەسەر زەوی ، ئیبن تەیمیەش وەسفی سولتان وادەکاو دەڵێ**(أن السلطان ظل الله في الأرض)[٢] **زیاتر لەوەش لەلایەن ئیمامەکان ووتراوە ٦٠ سال لە سولتانیکی زالم باشترە لەوەی یەك شەو بێ سولتان بین ، خراتر لەوەش ئۆقرە گرتن بەرامبەر دەسەلاتی ئاواو دەسەلاتی ستەمکار بە عیبادەت هەژمارکراوە ، یان هەلگرتنی ئەو تووڕەییە بۆ ڕۆژی دوای لە ئینجیل واهاتوە :** (( .. ومن أراد أن يخاصمك ليأخذ ثوبك، فاترك له رداءك أيضاً))[٣]، **کاتێ زاناو فەیلەسوف دژ بەو هەنگاوە دەوەستان ناووناتۆرەی کافرو مولحیدو لائیکیان لێنراوە، بۆیە دەبێ ئاگاداربین لەو توومەتانە گەڵێ جار پێچەوانەیە. لیرەوە (ئاین تلیاکی گەلان- الدين افيون الشعوب) لەلای**

---

[١] كتاب المقدس(انجيل)- رسالة بولس الرسول الى اهل رومية اصحاح ١٣

[٢] مجموع الفتاوى ج٢٨/٢٩٠-٢٩١

[٣] - متى ٥ (٣٩ - ٤١) الكتاب المقدس العهد الجديد-

مارکس ه وباروون دولباخ وزانای تر هات،هەرلەوەشەوە  تووەمەتی جیاجیا ڕووبەڕووی ئاین بوویتەوە، تا ڕادەی جیاکردنەوە لە ژیان .

بەو شێوە دەتوانین  بە خێرایی خاڵەکانی هۆی گەشەکردنی عەلمانیەت لە ئەورووپاودوایش لەجیهانی ئیسلامی  کۆ بکەینەوە، کە ئەوانەش هێزن بۆ پاساوی هەمیشەیی:

١-بارودۆخی سەلبی ئاینی بەگشتی وئاینی مەسیحی بەتایبەتیو نەبونی شەریعەت لەو ئاینە.

٢-گەشەی زانست و دۆزینەوە گەردوونیەکان و تیۆری پەرەسەندن.

٣-سەرهەڵدان و گەشەی فەلسەفەی مادی.

٤-گەشەی سەرمایەداری و کەرت و بەرژەوەندی تایبەت، لە بەرامبەر هەموو ئەوانەش ئایین لە کشانەوە بوو، بەشێوەیەك عەقڵ و ئایین کەوتبوونە دوو بەرەی دژ بەیەك.

٥-وەرچەرخانی ئیمپڕاتۆریەت بۆ دەوڵەتی نەتەوەیی و دروست بوونی یەکەم ئەزموونی عەلمانی لە فەڕەنسا.

٦- داڕمانی خەلافەتی عوسمانی و وەستانی بزوتنەوەی وشیاری لەجیهانی ئیسلامی.

بەو شێوەیە عەلمانیەت لە ئەورووپا سەری هەڵدا (یان ڕاستتر بڵێین زیندوو بۆوە بەو ناوە)، ڕاستەوخۆتر لە زەمینەی واقیعی سەلبی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئاینی سەری هەلدا.

## دەروازەی دووەم

# چەمکی ئیســلام

### شکاندنی دۆگما فکریەکانی ئاینی

کۆمەلێك تێگەیشتنی ئاینی بالّی بەسەر کۆمەلگەی موسولمان دا کێشاوە وای کردوە تووشی دواکەوتن ودۆگماو تەنانەت قەیرانی عەقلیش بێت ، بە خێرایی هەندیێلایەنی ڕاست دەکەینەوە بەکورتی :

١) لە ئەسلدا ئاین جیایە لەگەل (مەزهەب و تفسیرو عەقیدەو فقهو میژوو ..) ئاین بریتیە لە پەیام ،باقیەکەی تر ئاین نیە بەلکو تێگەیشتنە لە ئاین ،مەزهەب و تایفەو فقهو عەقیدەو تفسیرو فکری ئیسلامی ... هەمووی تێگەیشتنە لە ئایین نەك خودی ئایین ، دەکریّ ئەو وا لە ئایین گەیشتبیّ دەکریّ ئێستا بە جۆرێکی تر

٢) ئەسلّی ئایین (هەموو ئایینەکان) بۆ خزمەتی مرۆڤایەتی هاتوون ، خودی ئایین (پەیام) پێویستی بە خزمەتی مرۆڤ نیە ، خۆی گەورەیە ، تەواوە ، موتلەقە ، لەوەوە بنەمای تۆبزی نیە لە ئایین ئەگەر تۆبزی هەبوو ئەوا ئایین پێویستی بە مرۆڤە ، بۆیە پێویست ناکات خوێن ڕشتن و ئەزیەت دانی خەلّکی بکەی لەو پێناوە ، بەلّکو ئەو کارە بکە دژی ستەم و زولّم ، خودی ئایینیش کێشەی لەگەلّ زولّم و ستەم هەیە نەك لەگەلّ کافرو موحیدو ... ، کافرێکی باش لە موسلّمانێکی ستەمکار باشترە ، (کافر عادل خیر من مسلم الجائر) ئەوە ڕێسای (ابن تاوس)ە .

٣) هەموو ئەوانەی لە خالّی دوو باس کرا ، بە هەموو مەزهەب و فکرو تەفسیر ناکاتە ٥٪ی ئایین ، ئایین بریتی یە لە هەموو بوونەوەرو گەردوون و سروشت و جهان و کۆمەڵگەو هێشتا زیاتر ، کەچی مەزهەب و تەفسیرو فکرو فلسەفەکانمان دڵۆپێکە لەدەریای ئایین ،،ئاین بریتیە لە تیگەیشتن لە بوونەوەر لە نهێنی نێو گەردیلە تاگەردوون،ئاین ئەوەیە (قل لو كان البحر مدادا لكلمات ربى لنفد البحر قبل ان تنفد كلمات ربى ولو جئنا بمثله مددا ) ، تایفەیی ومەزهەبی بچوکەو ئاینیش گەورە، ئەوانەی دابەش بووینە بۆ مەزهەب وتایفە زیاتر دەمارگیریان بۆ مەزهەب و تایفەکەیان هەیە نەوەك بۆ ئەسڵی ئاینەکەیان کە هەر لەبنچینەدا دەمارگیری تێدانیە ،

٤) زۆربەی مسوڵمانان پابەندن بە مەزهەبی ئیمامێك کە تەمەنی لە ١٠٠٠ ساڵ کەمتر نیە، جا ئەگەر فتوای هەر ئیمامێك ١٠٠٠ ساڵ بخایەنێ ئەوە جێ ی پەیامی گرتۆتەوە، چونکە عەقڵی مرۆڤ کورت بینە جیاوازیەکەی لەگەڵ پەیام ئەوەیە پەیام هەتا هەتاییە و بۆ هەموو کات و شوێنێکە، کەچی داهێنانی مرۆڤ زیاتر بۆ سەردەمەکەی خۆیتی، هەر ئیمام و موفتیەك ئەرکی سەرشانی خۆی جێبەجی کردووە لەسەردەمی خۆیان وبۆ لایەکی بچوکی ئاین، بۆیە وا دانراوە کە فتوا بەگوێرەی کات و شوێن دەگۆڕێت، کەچی دەبینین ئەهلی ئایینی وا دەمارگیرن بەرامبەر پرسی فقهی ئامادەن دان بەوە بنێن ناسخ و مەنسوخ لە پەیام هەبێت بەڵام لە فکری ئیمامەکەیان نەبێت، ئامادەن بڵێن ئەو فەرموودە لاوازە کەچی ناچن بەلای لاوازی و هەڵەی ئیمام و مەزهەب و تایفەکەیان.

٥) زۆر داکۆکی لە (دژ عەقلانی) دەکەنەوە دەڵێن عەقڵ بەرامبەر نەقڵ نرخی نیە، کەچی لەلایەکی تر عەقڵی ئەو ئیمامانەیان خستۆتە پیش نەقلیش بێئەوەی خۆشیان هەستی پێبکەن، لە ئەسڵدا عەقڵ نسیی و گۆڕاوە، نەقل و

پەیام چەسپاون، سروشتی عەقڵیش وایە لەگەڵ زەمەن بەپێشتر دەکەوێ، ئەوە یاسایە، عەقڵی ئێستا پێشکەوتوترە و فراوانتر و تیژترە لە دوێنێ، هی ئەوساڵ لەچاو پار، هی ئێستا لەسەردەمی ئەو ئیمامانە، بۆیە زۆر ئاساییە ئەگەر بڵێ ی سەید قوتب و سەعید نەورەسی مستەفا زەلمی و محمد باقر سەدر زانیاریان فراوانترە لە زانیاریەکانی ئیمامەکانی شیعە وسوننە و موعتەزیلەی ئەوسا، ئەو یاسایە پێچەوانەکەی تەنها بێ ئاگایی و دەمارگیریە.

٦) کیشەی گەورەی فقە(نەك هەمو فقە) ئەوەیە کەمتر ئامانجی ئاینی دێنێتەدی کە بەرپاکردنی شارستانی وئیعمار وپیشکەوتن وتکنیك وگەشەی عەقلی تێدایە ، زۆر جارمنهجیکی عەبەسیە دیارنیە ئامانجی چیە بۆ دونیا ،دونیاو قیامەتی لیکجیاکردۆتەوە گوایە ئاین بۆ قیامەتەو عەقل وزانستیش بۆ دونیا، وای کردوە ئاینی ئیسلامیش بەرەو لاهوتی وسروش وجۆریك لە مەسیحیەت بڕوا کە وەسفی ئەوە هەلگرێ ئاینی ئیسلامیش ئاینی شەخسی بێت.

٧) لە دوای ئەزمونی خەلافەتی راشدین لادانێکی مەترسیدار لە ڕێڕەوی ئاینی ڕاستەقینە بەرەو دەمارگیری خێلەکی ورەگەزی نەفامی بەدی دەکرێ ، ئەوەی لەئەمەویەکان نەبوایە بە موالی ناو دەبرا یان (علوج)، زاراوەی موالی هی سەردەمی پیش هاتنی ئیسلامە ،دەگۆترا(موالی العتق) بە کۆیلە ووتراوە لەسەردەمی نەفامی عربی پیش هاتنی ئیسلام ، ئەو تێڕوانینە زۆر بە ڕوونی لە پانتاییەکی فراوانی فقهی ئیسلامی ڕەنگی داوەتەوە، لە فقهی ئیمامی شافیعی وئیمامی ئەحمەد و ئیمامی مالیك ومیراتگرانی وزۆر بە زەقتر لەفتواکانی ابن تیمیە(فەزلی عەرەب بەسەر عەجەم وکوردکراوە)، هەرچەندە دەقی ئاشکرا دژ بە(فەزل)هەیە لەسەر بنچینەی ڕەگەزوڕەنگ وچینایەتی ،کەچی لەسەردەمی ئەمەوی باوی وەرگرت ، تەقەلایەك لەلایەن نوسەری عەرەبی ئیسلامی هەبوە بۆ

**لاركردنەوەی ئاین بەلای بەهای عربی نەفامی(ايام العرب)، دەیان ووت زمانی ڕەسەن وبەهەشت وفریشتە زمانی عربیە ،بۆ یەكەم جارلەسەردەمی عبدالمليكی كوری مەروان(٦٥-٨٦)ك بۆ تۆماری باج(خراج) زەوی ناوەكان لە هەمو وولات بە عربی تۆماركران ،هەر لەسەردەمی ئەو لە٧٥ك بەرامبەر ٦٩٦ز زمانی عەرەبی كرایە تاكە زمانی فەرمی نەك هەر لەدەولەت بەلكو بۆ تەواوی میلەتی موسولمان ، زۆر كتێب وسەرچاوەی گرنگی تر بە ڕوونی دەری دەخا كە (زۆربەی)ئەهلی سونە وجەماعە پێیان وایە عەرەب فەزلی بەسەر عەجەم هەیەو ئیمام دەبێت لە عرب وقورەیش بێت ،لە مەزهەبی شیعەش ئەو دەردە بە جۆریكی تر هەیە ئیمام دەبێ لە (ئالوبەیت)بێت،كە زۆر تەسك كردنەوەی ئاینە ، هەریەكە لەو ئیمام وپیشەوا فقهیانە زیاتر لەوانی تر ئەو بۆچونەیان هەبوە ،ئیمام:** شافعی –احمد-مالك-ابن تيمية –ابن قيم-ابوقاسم زمشخری –حافظ العراقی - إمام الهيثمي - وإسحاق بن إبراهيم -عبد الله بن الزبير الحميدي وسعيد بن منصور جاحيز و..(ابن قتيبة ) لة كتيبی ( فضل العرب والتنبيه على علومها) ،إمام العراقي (محجة القرب في فضل العرب) مرعي الكرمي ( مسبوك الذهب في فضل العرب) (الشيخ بكر أبو زيد ( خصائص جزيرة العرب ) ... **پێیان وایە زمانی عربی عەقل بەهیز دەكات، بە واجبیش هەژماركردوە لە ریزی فێركردنی قورئان وسونە ، ئیبن تەیمیە دەلێت:** (وإنما الطريق الحسن: اعتياد الخطاب بالعربية، حتى يتلقنها الصغار في الدور والمكاتب، فيظهر شعار الإسلام وأهله، ويكون ذلك أسهل على أهل الإسلام في فقه معاني الكتاب والسنة وكلام السلف. بخلاف من اعتاد لغة ثم أراد أن ينتقل إلى أخرى، فإنه يصعب عليه. واعلم أن اعتياد اللغة، يؤثّر في العقل والخُلُق والدّين تأثيراً قوياً بيناً. ويؤثر أيضاً في مشابهة صدر هذه الأمة من الصحابة والتابعين. ومشابهتهم تزيد العقل والدين والخلق. وأيضاً فإن نفس اللغة العربية من الدين، ومعرفتها فرض واجب. فإن فهم الكتاب والسنة فرض. ولا يُفهم

إلا بفهم اللغة العربية)١، ئةوة رِيَك ثيضةوانةى ئةو فةرموودةية (إنَّ الرب واحد، والأبُ واحد، والدَين واحد، وإنَّ العربيةَ ليست لأحدكم بأبٍ ولا أمّ، إنما هي لسانٌ، فمنْ تكلَّمَ بالعربيةِ فهو عربي) ،

**ئیمام ابن تیمیه بەرەو بەرەیەکی تر دەڕوات پێی وایە عرب زیرەك ترن** : (فغلب على العرب القوة العقلية النطقية، واشتق اسمُها من وصفها فقيل: عرب من الإعراب، وهو البيان والإظهار، وذلك خصوصاً القوة النطقية.. ولهذا كانت العرب أفضل الأمم)٢ ،أبو القاسم محمود الزمخشري (ت٥٣٨ هـ) **لە پێشەکی کتێبەکەی** (المفصل في علم العربية) **دەلێت**: (اللّهَ أحمدُ على أن جعلني من علماء العربية، وجبلني على الغضب للعرب والعصبية، وأبى لي أن أنفرد عن صميم أنصارهم وأمتاز، وأنضوي إلى لفيف الشعوبية وأنحاز، وعصمني من مذهبهم الذي لم يُجْدِ عليهم إلا الرشقَ بألسنةِ اللاعنينَ، والمَشْقَ بأسِنَّة الطاعنين)... **لەوەش مەترسی تر فەزلی عرب بەسەر عەجەم بە کرۆکی سونەو جەماعە دەزانی کەچی پیچەوانەی ئەگەر لەکاردانەوە یەك بلێ عەجەم فەزل ترە لە عرب دەلێ ئەوە نیفاقە، بابێکی بۆ تەرخان کردوە لە کتیبی**(اقتضاء الصراط المستقيم)«باب تفضيل جنس العجم على العرب نفاق) **بۆیە دەبینین ئەو کتێبانەی رەدی ئەو بۆچوونە هەلەیان داوەتەوە نەماون بەکوفر هەژمارکراوە .**

**ئەوە هەمان ترتیبی نەفامی یۆنانیە کە کەمێك لەنەفامی عربی گەشەسەندوو تر بوو ، ڕاستیەکەی لەسەردەمی دادگەری چوار خلیفەی راشدین وانەبوە سەردەمی ئەمەوی وابوە ،دابەشی چینایەتی ونەژادیو رەگەزی و خیلەکی دروست بوو ، بۆیە دەبینین لە**(مسبوك الذهب، في فضل العرب، وشرف العلم على شرف النسب)**–الإمام مرعى بن يوسف الحنبلى الكرمى (١٠٣٣هـ) نزمی نەژادی ئافرەت دەکاتە پێوەر بۆ**

١ابن تيمية -اقتضاء الصراط المستقيم ج٢ ص٢٠٧ .

[٢]ابن تيمية في - مجموع الفتاوى ج١٥ص٤٣١ .

تیگەیشتن لە فەزلی عەرەب بەسەر عەجەم ودەلیت:(أن جنس العرب أفضل من جنس العجم، كما إن جنس الرجل أفضل من جنس المرأة من حيث الطائفة والعموم) ، ئەوانە دەلێن هۆکاری فەزلی عەرەب ناگەڕێتەوە بۆ ئاین وپیغمبەر ،لەوەوە هیچ پاساوێك بۆ پینە کردن نامینیت جگە لەوەی کە تیۆریکی ڕەگەزپەرستیە،ریشەی دەگەڕێتەوە سەر ناشیۆنالیزمی و ئیدیعای شەیتان کە ووتی من فەزلم زیاترە بەسەر ئادەم من لە ئاگرو ئەو لە قوڕ ، لیرەش وادەووتریٚ : واعلم أَنَّهُ ليسَ فَضْلُ العَرَبِ ثمَّ قُرَيْشٍ ثُم بني هَاشِمٍ بمجردِ كَوْنِ النبيي (ص) مِنْهُمْ كما يُتَوهمُ -وإِنْ كانَ هوَ عليه السلام قد زَادَهُمْ فضلاً وشرفاً بلا ريب- بل هُمْ في أنْفُسِهِمْ أفْضَلُ وَأشرفُ وأكْمَلُ).

لەوەش بازدەدا بە ڕوونی دەچیتە سەر فەرهەنگی نەفامی یۆنانی ومیلەتان دەپۆلێنیٚ بەپۆلینیکی غەیرە ئیسلامی ودەلیٚ: (واعلم أن لفظَ الأعراب هوَ في الأصل اسم لسكان باديةِ العَرَبِ، وإلاَّ فكلُّ أمَّةٍ لها حاضرة وبادية، فباديةُ العَرَب الأعراب، وبادية الروم الأرْمَن، وباديةُ الفُرْس الأكْرَاد، وباديةُ التُرْكِ التركُمَان، فسائر سكان البوادي لهم حكم الأعراب سوَاء دخلوا في لفظِ الأعراب أم لم يدخلوَا. فجنسُ الحاضرة أفضل من جنس البادية).

ئەوە ڕای بەشێکی زۆری فەقیهو ئیمامەکان هەولی تەعریبی ئاین وفقهیان داوە ، سەرکەوتووش بووینە ،بۆیە ئەوەی ئیستا لە جیهانی ئیسلامی دەگوزەریٚ زیاتر کەلتوری عەرەبە نەك خودی ئاین ، هەرلەو کەلتوورە وای کردوە تەفسیری ئاینی دوو ڕەهەندی بەسەر زالە (توندوتیژی)ی و(جنسی)کەلەناو عەرەب باوی هەبوە،لەوەش مەترسیدار تر زۆر جار باسی ئیسرائیلیات کراوە لە فقهی ئیسلامیدا بەلام بەدەگمەنیش باسی عروبیات نەکراوە لە فقهدا کەزۆر مەترسیدارترە لە ئیسرائیلیات .

٨) هەندیٚ جار فقه ئافرەتی بە شەیتان وفتنەو زەعیفەو ناقس ..وەسف کردوە ، ئیٚ لە قورئانیش (الفتنە اشد من القتل) کەواتە ئۆتۆماتیکی حوکمی

کوشتنی لەسەر دراوە ،یان بەلای کەمی خودی نەژادی ئافرەت توومەتە، بۆیە دەبینین لە جیهانی ئیسیلامی (بەتایبەتی عربی)کوشتنی ئافرەت ئەوەندە زەحمەت نیەو زۆر ڕێگریش نیە ،هەندی لە فقیهەکان ڕێیان داوە ئافرەت بکوژرێ ئەگەر ناموسی بردی ، یان لەزۆربەی دۆخەکان ئافرەت دەبێتە کالآی مەسلەتی لەجیاتی خوێنی پیاویك جاروایە چوار ئافرەت دراون ، هەر لەو ڕوانگەیەوە لە پۆلینی کۆمەلایەتی ئافرەت دەکەوێتە هەرە خواروە ، وەسفی تری سەرسورهینەر دەکرێ ،بۆنمونە لە کتیبی (مسبوك الذهب فی فضل العرب- امام بن یوسف الحنبلی) دەلێ چۆن ڕەگەزی عەرەب لای خودا فەزلی زیاترە لە عەجەم ئاواش فەزلی پیاو لای خودازیاترە لە ئافرەت .

بەو شێوەیە لە جیهانی ئیسلامی تاڕادەیەك ولەجهانی عربی بەخەستتر پێگەی ئافرەت لە پەیام زۆر جیایە لەوەی فقە ، ئافرەت لە قورئان وپەیام ئادەمیزادێکی تەواو بوە بەلام کەدەهاتە ئاستی فقە(بەتایبەتی ئەو فقهانەی کاریگەربوە بە بەهای ئەعرابی و بەهای بەدەوی ) ئەوە بە ئادەمیزادیکی ناتەواو پاشکۆ حیسابی بۆکراوە ، ئافرەت بە فتنەو حبل الشیگان و..وەسف کراوە، بەشیکی زۆری فقهیش لەو تیڕوانینە چەوتە بەرپرسیارە (نەك دەقی ئاینی) ،لە کاتیکا لە قورئان ئافرەت بە (زینە)وەسف دەکاولە فەرمودە (بە نیوەی ئیمان) کەچی فقە دەلێ فتنەیە ، لە فەرمودە ئافرەت (شقائق الرجال) لە فقە دەلێ مولکی پیاوە ، لە پەیاما بەهەشت لە ژێر پێی ئافرەتە کەچی لە فقهازۆربەی خەلکی جهنم ئافرەتن، لە قورئان دەلێ هاوسەری خۆشەویستی وتەباییە کەچی فقە دەلێ زال بوون وسەرداریە(نزیکە لە فکری مارکسی کە دەلێ هاوسەری پیکهاتوە لەدوو جەمسەری ناکۆکی)، لە قورئان دەلی (بعضهم اولیاء البعض) لە فقە دەلێ عەبدەو عەقلی نوقستانەو زەعیفەیەو ساویلکەیە ، بە خزمەتکار وەسفکراوە

**ونابێت بە ئافرەت بڵێی سەیدە[١]، زیاتر لەوەش بۆ ئافرەتانی کەنیزە هەر کارەساتە ،تەنانەت فتوای جیاش بۆ ئافرەتی (حرة)و ئافرەتی(جارية)دراوە ،ئەوە لە بنچینەدا لە ئیسلام نەهاتوە بەلکو لەسەردەمی یۆنانی کۆن بۆ ئافرەتە خزمەتکارەکان(کەنیزەکان) دەکراگۆرانی ودانس وهونەری تر بکەن[٢] (ئەسلی جیاوازی حورەو جاریە)لێرە دێت نەك لە ئەسلی ئاین.،. لە ئاینی ڕاستەقینە نەکەنیزەو نە کۆیلە جێیان نابێتەوە ،بەگشتی وەسفی ئافرەت لە مەزهەبەکانی سونەو شیعەوهی تریش بە خراپی هاتوە ، جاروایە شیعە ئافرەتی بەشەیتان ودوژمنی خوا وەسف کردوە[٣] ، وەسفی شەیتان بۆ ئافرەت یەکەم جار لەلای ئەگریکیەکان هاتوە ، لەلای سونەش ئافرەت بە فتنە ومەکربازی ودۆزەخی ...،ئەو وەسفانەی شەیتان وفتنە زیاتر لەوە دێت گوایە دەبنە هۆی ئەوەی سەرنجی پیاوان ڕاکیشن بۆ کاری خراپ! ئاوا نیە ئایا خودا شەیتانو فتنە دروست دەکا،کاری هەلەی کردوە،نەخێر، ئەوە ئافرەت نیە شەیتان وفتنەیە بەلکو ئارەزووبازی پیاوە دەبێتە فتنەو شەیتان ،ئەگینا جوانی ئافرەت دروست کراوی خواییە نەك گوزارشی ئافرەت خۆی ،مەیلی مێ بەلای نێر و مەیلی نیر بەلای مێ ڕێسایەکی گەردوونی وخواییە ، تاوان نیە بۆ ئافرەت .ئافرەت چۆن ناقسە کاتێ لە قورئان وەسفی مرۆڤ بە(احسن التقويم) کردوە،..،لەقورئان ئەوە ساغ بوویتەوە کە خودا مرۆڤی بە (ناقص)دروست نەکردوە (لقد خلقنا الانسان فی احسن تقويم ) .**

---

[١] بۆ ئەو جۆرە تێڕوانینانە لەلایەن زۆربەی فەقیهەکان هاتوە بەلام ووردتر سەرنج بدە : شیخ الاسلام ابن التیمیە- مجموع الفتاوی ج٣٤ص٣١٣ ،ج٢٥ص٣١٤،ج٢٩ص١٠٠ .

[٢] **لە ل١٥١ی جمهوریە افلاتون باسی ئەو ڕۆلەی ئافرەت دەکا .**

[٣] بۆ ئەو جۆرە فتوایانە بڕوانە: لاهوت السیاسە ص٤٢ .

بەکورتی کەنیزەوبەندایەتی وهیچ جۆرە عەبدایەتیەکی عەبد بۆعەبد نەهاتوە بەلکوعەبدایەتی تەنها بۆخودا هاتوە ، لە ڕاستیدا هاوکیشەیەك هەیەلە دۆخی کۆیلایەتی : تا مرۆڤ کۆیلەی دەزگایەکی فراوان ترو گەورەتر بێت ئازادی زیاترە ،پیچەوانەشی تا ئەو دەزگایە بچوك ترو بێدەسەلات تربێت ئازادی کەم ترە ،لەوەوە کەمترین ئازادی کۆیلە بوونی مرۆڤە بۆ مرۆڤ کە کەمترین دەسەلاتە،زۆرترین ئازادیش کۆیلە بوونی مرۆڤ بۆ خودایە کەفراوانترین دەسەلاتی هەیە ، ئیتر ئازادی لەو نێوانە دابەش دەبێت ،ئازادی لەدەولەت زیاتر دەبێت نەك لە عەشیرەتیك ،ئازادی لە حکومەتیکی جیهانی زیاترە وەك لە حکومەتیکی نیشتمانی ،ئازادی لەهاوولاتی بوونی گەردوونی لەهەموان زیاترە کە مانای (عەبدایەتی خودا)دەبەخشێت ، (ئەمانۆیل کانت)لەو ڕایە نزیك دەبێتەوە دەلێت ئازادی ڕاستەقینە ئەو کاتە دێتەدی کە کەس بەردەستی کەسێك نەبێت ، هەمولایەك یەکسان بن بۆ یەك یاسا[1] ،کەواتە ئازادی ڕاستەقینە لە سۆشیالیستی ولیبرالی وشیوعیەت وناشیۆنالیزم بەدی ناکرێ لە عەبدایەتی خوای بەدی دەکرێ ،ئەگەر عەبدایەتی خواییت نەکرد ئۆتۆماتیکی بوویە عەبدی دەزگایەکی بچوك تر لێرەوە سەرچاوەی ناعەدالەتی و چەوسانەوەو ستەم دەست پێدەکات ،تا ئەو دەزگایە بچوك تربێت ستەم زیاد دەکات وئازادی کەم دەبێتەوە ،،تا دەگاتە سیستەمی کۆیلایەتی (عەبد مولکی عەبدبیت –یان–عەبدعەبدی عەبدبێت )کەبەتوندی لای هەمو ئاینەکان روتکرایتەوە ( ابتعثنا الله لنخرج العباد من عبادة العباد إلى رب العباد) .

٩) لەکۆتاییدا لە ژێر ئەو بارودۆخە سەقەت وسەختە هەندێ لای بەرامبەر باس لە (چاکسازی ئاینی) (نوێبوونەوەی ئاینی)... دەکەن ،لە ڕاستیدا ئەوەش

[1] فریدریك ئای هایك – الطریق الی الرق ص٥١ .

بەیەکجاری تێکەڵ کردنی کارتەکانە، ئاین چاکساز ناکرێت بەڵکو تێگەیشتنی ئاینی چاکسازی لێدەکرێت ، پەیام چەسپاوو ڕەهایە ئەوە عەقلی ئاینی ریژەیی و گۆڕاوە ، کە بریتین لە فقهو عەقیدەوتەفسیرو ... لەوانە چاکسازی دەکریت نەك لە پەیام کەسەرچاوەی راستەوخۆی ئاینە .

**ئاینی ڕاستەقینە**: ناوەڕۆکی هەمو ئاینەکان یەکە، هەموشی ئیسلامە ،ئومەتی **محمد** و عیساو موساو زەردەشت وئیزیدی و ... هەموی ئیسلامە–یان ووردتر ئەوەندەی ئیسلامە کە دەستکاری نەکراوە ، لە (ح ئادەمەوە )تا (ح **محمد**) ئیسلامە تەنها ئەوەیە (ح ئیبراهیم)ناوی نا ئیسلام کەواتە کە دەڵیت (وَمَنْ يَبْتَغِ غَيْرَ الْإِسْلَامِ دِينًا فَلَنْ يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي الْآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ) هەموی دەگریتەوە ، ئاینەکان یەکتریان نەسخ نەکردۆتەوە بەڵکو یەکتریان تەواو کردوە شاهیدیان بۆ یەکتر داوە ، لەقورئانیش بە (مصدقا) وەسفی کردوون ،قورئان ئەوانی پیشووی خۆی نەسخ نەکردوە بەڵکو تەسدیقی کردوون ،کەواتە قورئان هەموی لەباوەشی خۆی کۆکردۆتەوە ئیتر پیویستت بەوانی تر نامینیت، لەو تویژینەوەش باوەرمان بەوە هەیە هەمو ئاینەکان خواین ، ئەگینا پیی ناووتری ئاین ، نیشانەی ئاینی خودایی ئەوەیە لایەنگرانی دەمینین تا میژوەکی دوورو دریژ ،هەرچی فکری بەشەریە تەنها چەند سالیك دەمینیتەوە ،بۆیە بینیمان مارکسیەت زیاتر لەنیوەی جیهانی گرتبۆوە کەچی نەگەیشتە ١٠٠ سال و لایەنگری وای نەما ،کەواتە مادام لایەنگرانی بوزی وکۆنفۆشیۆسی و ئیزیدی و زەردەشتی وتاوی و .. ماون واتە ئەوانە لەبنەچەدا ئاینی خوایی بووینە نەك بەشەری ، کەواتە ئیسلام گویڕایەڵی و

ملکەچبوونە[١] یاخود (ملکەچبوونە بۆ حەق بە دڵ و دەروون و پێشوازی لێکردن و بەردەوامبوونە لەسەری و دوورکەوتنەوەیە لە شتانەی کە قەدەغەی کردووە)[٢]، ئیسلام لەسەر ئەم پێنج بنەما ناسراوە بونیاتنراوە، بەڵام باوەڕ پلەیەك بەرزتر و فراوانترە لە ئیسلام، شەش پایە ناسراوەکە: لەبەر ئەوە هەندێك پێیانوایە ئیسلام گوێڕایەڵی و ملکەچی ڕووکەشی (زمانی)یە، بەڵام باوەڕ بە ڕاستدانانی دڵە[٣]. خوای گەورە دەفەرموێ: (قَالَتِ الْأَعْرَابُ آمَنَّا قُلْ لَمْ تُؤْمِنُوا وَلَكِنْ قُولُوا أَسْلَمْنَا وَلَمَّا يَدْخُلِ الْإِيمَانُ فِي قُلُوبِكُمْ وَإِنْ تُطِيعُوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ لَا يَلِتْكُمْ مِنْ أَعْمَالِكُمْ شَيْئًا إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ ) الحجرات: ١٤، واتە: (هەندێکك لە بیابان نشینە عەڕەبەکان وتیان: باوەڕمان هێناوە باوەڕدارین، پێیان بڵێ: نەخێر، باوەڕتان نەهێناوە، بەڵام بڵێن بە ناچاری موسڵمان بووین، هێشتا باوەڕ نەچۆتە ناو دڵەکانتانەوە تیایدا جێگیر نەبووە(چاوەڕێ دەکرێت کە باوەڕ بهێنن))، -ئەعراِبی واتە: بیابان نشینە عەڕەبەکان، نەزان، عەڕەب بە تایبەت[٤] واتە باوەڕ لەگەڵ نەزانی کۆنابێتەوە، هەروەك ئیبن روشد و ئیخوان سەفا جەختیان لەوە کردەوە کە باوەڕدار (ئەوانەن کە لە زانست و زانیاریدا ڕووچووینە)[٥]، دەتوانرێت بوترێت: موسڵمان ئەو کەسەیە لەبەر ترس و پارێزکاری ملکەچی خوای گەورەیە، بەڵام باوەڕدار لەبەر خۆشەویستی و ناسینی خوای گەورە ملکەچی خوای گەورەیە.

(١) ابو الحسن الجرجاني-- التعريفات -دار الشؤون الثقافة - بغداد ص٢٠ ب--د.قطب مصطفى سانو، المعجم مصطلحات أصول الفقهية، دارالفكر-دمشق، ط١ ٢٠٠٠م ص٦٢ ج- المعجم الشامل .. المصدرالسابق ص٦٢.

(٢) د. رفيق العجم - موسوعة مصطلحات التصوف الإسلامي -مكتبة لبنان الطبعة الأولى ١٩٩٩ \ص ٥٦.

(٣) -أ- تعريفات .. المصدرالسابق ص٢٠، ب- معجم الشامل .. المصدرالسابق ص ٦٣، ج- معجم مصطلحات أصول الفقه .. المصدرالسابق ص.

(٤) ابن المنظور -لسان العرب المحيط -تصنيف: يوسف الخياط، دار لسان العربى-بيروت مادة: عرب..

(٥) من رسائل اخوان الصفاء..رقم:٣٧ ص١٢٤.

بەم شێوەیەش هەموو باوەڕدارێك موسڵمانە و پێچەوانەکەشی ناڕاستە لە هەندێك دۆخدا، لە مەزهەبی جەعفەریدا پایەی تر هەن وەك: (موسڵمان، باوەڕدار، لاساییکار، کۆشکار، ..) هەر یەکێك لەوەی تر جیاوازە بە ڕێککاری ئاینی، بە پێی هەندێ سەرچاوە مەزهەبی شیعە وادەڕوانیتە مەزهەبەکانی تری (غەیرە شیعە )کە تەنها موسولمانن نەك باوەڕدار ،پێیان وایە تەنها مەزهەبی شیعە باوەڕدار دەبێ ، لە کاتێکدا لە مەزهەبی حەنەفیدا جیاوازی لە نێوان باوەڕدار و موسڵمان هەر نییە[١].

پەیامی ئیسلام بۆ ئەوە هاتووە کە مرۆڤ ڕینوێنی بکات، لە گومڕایی ڕزگاریان بکات بەرەو ڕووناکی و دادگەری ومرۆڤایەتیان ببات[٢]،ئەمەش مانای ئەوەیەکە مرۆڤ و هەموو بونەوەرەکانی (عەبەسی) دروستنەکراون، بەڵکو بۆ جێبەجێ کردنی مەبەستێکی پیرۆز،بەمەبەستی بەرپاکردنی شارستانی ،لەڕێگەی پابەندبوون بە فەرمانەکانی خوای پەروەردگار،بۆ ئەو مەبەستە پێغەمبەرانی لەگەڵ پەرتوکەکانیان ناردووە بۆ ئەوەی ئاینی خوا بۆ خەڵکی ڕوون بکاتەوەو جیبەجێی بکەن لەسەر دونیا، ڕاستی لە ناڕاستی جیاکردۆتەوە،کەواتە ئیسلام زۆر فراوان ترە لەوەی ئێمە لێی تێگەیشتووین ، ئەوەندە تەسك و خۆویست نیە ،زۆر فراوان وکراوەیە .

پێغەمبەر موحەممەدی کوڕی عەبدوڵا (د خ) کۆتا پێغەمبەرە لە (٥٧٠ز) لەدایك بووە [٣] ، قورئان پرۆگرامی ئەوە، ئیسلام ئاینەکەیەتی، ئەوانەی بە پیل بانگەوازەکەی ئەچن ئومەتی ئەون[٤]، هەروەك ئەم وەسفانە بە شێوەیەکی تر لە (المعجم الشامل) هاتوون بەم شێوەیە: (ئاین دەدرێتە پاڵ خوا، ئومەت دەدرێتە پاڵ

(١) التعریفات للجرجاني .. المصدرالسابق ص٢٠.

(٢) (..یخرجهم من الظلمات الی النور). آیة (٢٥٧) سورة(البقرة).

(٣) موسوعة الأدیان . .. المصدرالسابق. ص٢٣.

(٤) لة تعریفات الجرجاني .. المصدرالسابق ص٦٢.

پێغەمبەر، مەزهەب دەدرێتە پاڵ کۆششکار، بەڵام شەریعەت دەدرێتە پاڵ خوا و پێغەمبەر و ئومەت کە گوێڕایەڵی دەکرێت پێی دەوترێت ئومەت)[١]، لەگەل هەلوەستەیەك ،بەتیگەیشتنی خۆم شریعەت تەنها بۆ خودایە نەك خوداو پیغمبەر ،وەك لە(سورەتی نساو) لەدووشوین لە ئایەتی ١٢٧ و ئایەتی ١٧٦ روونی كردۆتەوه:(يستفتونك فى النساو قل الله يفتيكم )– (يستفتونك قل الله يفتيكم) .

هەموو شتێك پێچەوانەی ئایین بوو بە پوچەڵ و لادراو هەژمار دەکرێت،خوای گەورە دەفەرموێ: ( وَمَنْ يَبْتَغِ غَيْرَ الْإِسْلَامِ دِينًا فَلَنْ يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي الْآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ ) آل عمران ﴿٨٥﴾، واتە: (جا ئەوەی بێجگە لە ئاینی ئیسلام پەیڕەوی هەر ڕێبازێکی تر بکات لێی وەرناگیرێت، لە قیامەتیشدا لە خەسارەمەند و زەرەرمەندانە).

پێغەمبەری(د خ) ئەم بناغەیە دەوڵەتی ئیسلامی لە مەدینە دامەزراند، پاشان فراوان بوو ئاسیا و ئەفریقیا و ئەوروپای گرتەوە، کە هەڵگری پەیامی ڕۆشەنبیری و شارستانی مەدەنیەتی جیهانی بوو، ئێستاش ئیسلام بەهێزترین هێزی ڕۆحییە و دووەمین گەورەترین ئاینە لە جیهان و پێغەمبەرەکەشی تا ئێستا کاریگەرترین کەسایەتییە[٢].

(١) معجم الشامل .. المصدرالسابق. ص ٣٥٩.

(٢) أنظر:د.مايل هارد، مئة –١٠٠، ترجمة:أسعد قرداخى ط٢\١٩٩٠ سليماني–بروزه ى هاوسه ر (وقد جاء اسمه فى أول المئة).

## باسی یەكەم

## تێڕوانینی فەلسەفی لەبارەی ئیسلام

خوای گەورە ئەم بوونەوەرە هەرلە (گەردیلەوە تا كەشكەشانەكانەوە)، لە (خانەوە تا گەورەترین مەخلوق).. بە یاساگەلێكی جێگیرەوە پابەندی كردوون، هەروەك لە قورئانی پیرۆز دا هاتووە: (رَبُّنَا الَّذِي أَعْطَى كُلَّ شَيْءٍ خَلْقَهُ ثُمَّ هَدَى ) طه ﴿٥٠﴾، واتە: (پەروەردگارمان ئەو زاتەیە كە هەموو شتێكی بە تایبەتی و ڕێكوپێكی دروست كردووە، پاشان ڕێنوێنی كردووە، تا بە چاكی دەوری خۆی ببینێت و (لە خزمەتی ئادەمیزا دا بێت). (وَأَوْحَى فِي كُلِّ سَمَاءٍ أَمْرَهَا) فصلت (١٢)، واتە: (بۆ ئاسمانەكانیش فەرمان ویاسای نارد)، واتە فەلسەفەی بوون لە دوو كردار خۆی دەبینێتەوە: ١_ بەدیهێنان، بریتییە لە پرۆسەی بەدیهێنان لە نەبوونەوە بۆ بوون. ٢/ ڕێنوێنی: بریتییە لە دانانی بەرنامە بۆ هەموو شتێك، ئەم دووانەش بنەمای فەلسەفی بەڵگە نەویستن مەودایەكی فراوانی فەلسەفەی ئیسلامی لەسەر بنیات دەنرێت... ئەو دوو چەمكە فلسفیە بە زاراوەی ئاینی (امرو خلق)گوزارش دەكریت .

ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە هەموو شتێك لە بوونەوەر ڕامكراوە و ئەركێكی دیاریكراو بەجێدەگەیەنێ، لە دۆخێكی جوڵەی بەردەوام و بازنەیی دایە، داخراو و ناچارییە(مسەیەرە)، هیچ بوارێك بۆ ئاو نییە لەمانە دەرچێت: (شل، گاز، بەستوویی، شل) لەوبازنەیە دەرناچی وەك (تەتەوریەكان بانگیشەی بۆ دەكەن ،ئاو لەوخولەو جولەدا هەرگیز گەشەناكاو بازنادات ببێتە جیوە یان زێڕ، جا جوڵەكەی هەر چەندێك بێت لە ڕووی چۆنیەتی و چەندێتیەوە، هەروەك فەلسەفەی مادی _ پەرەسەندن باوەڕی وایە، كە هەوڵێدا ڕاڤەی بوونی جیهان و سروشت و ژیان و مرۆڤ بكات بەهۆی جوڵەی گەشە و پەرەسەندنەوە، فەلسەفەی ماددی باوەڕی وایە هەموو شتێك لە دۆخی بەرەو پێشچوون و گەشەدایە لە

چوارچێوەی یاسای (دژوناکۆکەکان) ، بەم شێوەیە جۆرەکان پەیدادەبن، لەبەر ئەوە دەڵێن بوون هیچ نییە تەنها مادەی جوڵاو نەبێت، ئەمەش فراوانترین چەمکە[1]، بەڵام ڕەخنەی یەکەم لەسەری ئەوەیە کە هەموو (جوڵە)یەك نابێتە هۆی (گەشەکردن و پەرەسەندن)، خوای گەورە مرۆڤی وەك تاکە بوونەوەری سەرپشککراو دروست کردوە کە مسەیەر نەبێت وتوانای گەشەی هەبێت[2]، کە لە توانایدا هەیە یاخی بێت و ببێتە هۆکاری خراپە و ستەم، بە هەمان شێوەیەش لەباریدا هەیە ببێتە ڕەگەزێکی چاك و ڕێنوێنیکار لەم ژیانەدا وەك ئەوەی خوای گەورە دەفەرموێ: (فَمَنْ شَاءَ فَلْيُؤْمِنْ وَمَنْ شَاءَ فَلْيَكْفُر) الكهف (٢٩). واتە: (ئەوەی دەیەوێ با باوەڕ بهێنێت و ئەوەی دەیەوێ با کافر و بێباوەڕ بێت)، ئەمە بنچینەی فەلسەفیە بۆ مانای جێنشینی لەسەر زەوی،جینشینیەك هەمو مرۆڤەکان بە نیرومێ ،بەڕەش وسپی بە ئەورووپی وئاسیایی ...وەك یەکن، هەموو ئەمە لەگەڵ مەودای ئەو ئازادیە پێدراوەی مرۆڤ گونجاوە، کەواتە چەندین بوار و ئەگەر هەیە لەبەردەم مرۆڤدا لە پەیوەندییە ئاسۆییەکەی (مرۆڤ لەگەڵ مرۆڤ) و ستونیەکەی (مرۆڤ لەگەڵ سروشت) ..، زۆر ئەستەمە دادگەری لەو بوار و پەیوەندیانە بە سیستەمێکی ڕێکخراو و ورد (ستاندار)بێتەدی ، لە دابەشکردنی ماف و ئەرك کە خاڵی بێت لە ستەم و نەنگی مادام عەقڵی مرۆڤ لایەنی خودپەرستی تێدایە، لێرەوە مرۆڤ پێویستی بە ئاین و بەرنامەیەکی نێردراو هەیە لە لایەن ئەو بەدیهێنەرەی کە بوونەوەر و مرۆڤی بەدیهێناوە، بۆ ئەوەی بەرەو ڕێگەی ڕاست ڕێنوێنی بکات، بۆ ڕێگەی ڕاستی و دادگەری، ڕزگارکردنی لە گومڕایی (لە هەموو بوارەکانی ژیان) بۆ ڕووناکی و نوور، لە نەزانییەوە بۆ زانین، لە ستەمەوە بۆ دادگەری، لە

---

(١) بودوستنيك وياخود–عرض موجز للمادية الدياليكتيكية–دار التقدم\موسكو ص٣٢.

(٢) ئێمە باسی جیهانی مادی بەرهەست دەکەین ئەگەر نا شارستانیەتێکی تر هاوشێوەی مرۆڤ لە ئازادی بوونی هەیە کە جنۆکەیە .

خەراپەوە بۆ چاکە، .. لێرەوە چەمکە ئەخلاقیەکان (وەك: دادگەری، چاکە، مرۆڤایەتی، هاوکاری) لە ڕێگەی ئاینە ئاسمانییەکان هاتنە ناو زانستی مرۆییەوە، دواتر بە شێوەی فەلسەفە و ئایدۆلۆجیا و سیاسەتەوە گوزارشتیان لێکردووە، پاشان هەندێك خەڵك هەوڵیانداوە سیستەمێکی دەستکرد بۆ ژیان دروست بکەن لە ڕێگەی پەراوێزی ئەم زانستەوە وەك جێگرەوەیەك بۆ ئاین، کە ئێستا لایەن و قوتابخانەی هزری و سیاسی دەستکرد نوێنەرایەتی دەکەن، ئیسلامیەکانی سەردەم بەوانە دەڵێن (عەلمانی) یاخود زۆرجار تەوژمی عەقڵی[١]کە ئەوەیان زۆر گونجاو نیە،هەرچەندە تەوژمی عەقڵی پەتی بەبێ پاڵپشتی ئاینی دەناڵێنێت بەدەست: هەنووکەییبوون و تاك لایەنی و ڕووکەشی و لاوەکی و ڕووکەشی لە تێگەیشتن لە دونیا و دوارۆژ، هەروەها خاڵی نییە لە ستەم (هەتا ئەگەر مەبەستیشی ستەم نەبێت) کە پەیوەست نەبووە بە پەیامی دابەزێنراو، خوای گەورە دەفەرموێت: (وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ ) المائدة ﴿٤٥﴾، واتە: (بێگومان ئەوەی حوکم و دادوەری نەکات بەو بەرنامەیەی کە خوا دایبەزاندووە ئا ئەوانە ستەمکارن)، بەڵام ئیسلام ئاین و پەیڕەو و پرۆگرامێکی کاملە بە گشگیری وەسف دەکرێت بۆ ئەم سێ ڕەهەندە:

١ _ هەموو لایەنەکانی ژیان دەگرێتەوە.

٢ _ هەموو کات و شوێنێك دەگرێتەوە و هەموو خەڵکی لە نەوە یەك لەدوای یەکەکان.

٣ _ هەر دوو جیهانی دیار و نادیار و دونیا و دوارۆژ دەگرێتەوە[٢].

(١) لەگەڵ ئەوەش عەقڵی دروست لەگەڵ نەقڵی ڕاشکاو تێکناگیرێ .

(٢) بەم شێوەیە ئیسلام ڕەهەندی ڕۆحی و مادی مرۆڤ دەگرێت، پەیوەندی هاوسەنگی نێوان مرۆڤ و مرۆڤ دیاریدەکات لەلایەکەوە لەگەڵ کۆمەڵگە لە لایەکی ترەوە، دواتر لە نێوان دەستەڵاتدار و گەلەکەیەوە، ... لە مەسیحیەت و زۆرێك لە ئینەکانی تر جیادەکرێتەوە بەوەی ئاینی کۆمەڵە (نەوەك ئاینی تاکە کەسی بێت لە

تاکە پەیڕەو و پرۆگرامە کە لە هەموو قۆناغەکانی لەگەڵ مرۆڤایەتی دەگونجێت و هاوسەنگی دروست دەکات لە نێوان پێدراوەکانی سروشت و پێداویستیەکانی مرۆڤایەتی، لەنێوان بەرژەوەندی گشتی و تایبەتی، خواست و شتە شیاوەکان، ئازادی و بێسەروبەری، مادیەت و ڕۆحی، لەنێوان دونیا و دواڕۆژ، .. واتە جێبەجێ کردنی شەریعەتی ئیسلامی دادگەری لەسەر زەوی و بەهەشت لە ئاسمان بۆ مرۆڤ فەراهەم دەکات، ئیسلام هەڵگری شەریعەتی گەردوونییە و پیربوون ڕووی تێناکات[١]، چونکە لەناوناچێت و ناگۆڕێت، بەڵکو نوێببوونەوە هەڵدەگرێت: چاکسازی هزری مرۆیی و ڕێگەی تێگەیشتنی لەم ئاینە، لە لایەکی ترەوە چاکسازی کۆمەڵگە بەگوێرەی شەریعەتی خوا، بۆ هەموو سەردەمێك شێوە و گوزارشتی تایبەت بۆ نوێبوونەوە چاکسازی هەیە .. لەم سەردەمەدا بزوتنەوە و بانگەوازەکان کە پێی دەڵێن ڕابوونی ئیسلامی گوزارشتی لێدەکەن، بەرنامەی خۆی بۆ کێشەکانی کۆمەڵگەی سەردەم دەخاتەڕوو، لەنێویشیان "تیۆری دەوڵەت" ( دواتر باسی دەکەین)، بەم شێوەیەش ئیسلام پێچەوانەی هەندێ ڕێبازی تر لەگەڵ عەقڵی دروست تێکناگیرێ، ئەم تێکگیرانە لە ئەورووپا بووە هۆی دەرکەوتنی عەلمانیەت، بەڵکو بە پێچەوانەوە دەستکەوتە زانستی و عەقڵیە دروستەکان دەبێتە هۆی پتەوکردنی ڕاستیەکانی ئیسلام .

□

---

نێوان تاك و خوا) دەیانبەستێتەوە بە گرێبەستە کۆمەڵایەتی و سیاسی و یاساییەوە، واتە نە سیۆکراتی و نە لاهوتییە، پیاوی ئاینی نییە کە نێوەندگیری لە نێوان خەڵکی و خوا بکات .

(١) یاسا حەقیقیەکان (جا ئەگەر گەردوونی یاخود سروشتی یاخود کۆمەڵایەتی)، وەك (حەقیقەت) بەم خەسڵەتانە وەسف دەکرێتەوە: ١ـ وەك بابەت بوونی هەیە پشت بە بارودۆخ و ئاستی زانیاریمان ناترسێت. ٢ـ هەموو کات نوێیە. ٣ـ جێگیرە و گۆڕانکاری و پێشکەوتن و پیربوون لەخۆناگرێت.

## باسی دووەم

# ئیسلام و ئیسلامی

ئیسلام بەرنامەیەکە لە بنەڕەتدا لە قورئان و سونەت(پەیام)پیکهاتوە ،بەرنامەی ئیسلامی لەگەل ئیسلام جیایە ئەولە سەرچاوەکانی تری ئەزمونی بەشەریش سود وەردەگری، بە شێوەیەکی گشتی لە شەریعەت و بیروباوەڕ پێکدێت، بەڵام ئیسلامی (لەم ڕۆژگارە) ئەو کەسەیە کاردەکات لە پێناو بەدیهێنان ئەم بەرنامەیە، خەبات دەکات (لە ڕووی یاساییەوە) لە پێناو ئەوەی دەستورەکەی تەنها لە شەریعەتی ئیسلامی بێت، بە هەموو کەسێك یاخود کۆمەڵێك دەوترێت (ئیسلامی) یاخود (ئیسلامی سیاسی) کە لەم پێناوە کاردەکات، (بە گوێرەی تێگەیشتنی ئیسلامی) زاراوەی (ئیسلامی) هەڵەیە، لەبەر ئەوەی ئیسلام بە سروشتی خۆی لە سیاسەت و و حوکمڕانی و سیستەمی ئابووری پێکدێت .. تاد. ئیسلام بەبێ سیاسەت و حومکڕانی هەروەك لەم فەرموودەیە هاتووە: (پایەکانی ئیسلام یەك بە یەك هەڵدەوەشێنەوە هەر کاتێك یەکێکیان هەڵوەشایەوە خەڵکی دەست بەوەی دواترەوە دەگرن یەکەمیان هەڵوەشانەوەی حوکمڕانیە و کۆتاییەکەشی نوێژە)[1] موحەممەدی کوڕی عەبدوڵا پێغەمبەر بوو لە هەمان کاتدا سەرۆکی سیاسی دەوڵەت بوو لە مەدینە، ئەم دابەشکردنە ڕەتدەکاتەوە لە نێوان ئیسلامی سیاسی و نا سیاسی.

ئەگەر ئیسلامی سیاسی تاوانبار بێت بە تێکەڵکردنی ئاین بە سیاسەت، ئەوا ئیسلامی ناسیاسی تاوانبارە بە سڕکردنی گەلان و چەقبەستوویی و پاڵکەوتن، لەبەر ئەوە پێیان وتووە (تلیاکی گەلان)، ئەمەش واتا ئیسلام لە هەموو دۆخێك تاوانبارە سیاسی یاخود نا سیاسی.

---

(١) مسند الإمام أحمد –حديث أبى امامةالباهلى، مجمع الزواهد –كتاب الفتن، رقم الحديث:١١٧٤٤.

زاراوەی (ئیسلامی سیاسی) لە کۆتایی سەدەی ڕابردوو دوای بەرەو پێشچوونی ڕابوونی ئیسلامی بڵاوبووەوە بۆ جیاکردنەوەی ئیسلامیە بزاڤیەکان و موسڵمانە ئاساییەکان، وەك ئەوەی ئیسلامی سیاسی تەنها بۆ دونیا کاردەکات، ئیسلامی نا سیاسی تەنها بۆ دوارۆژە، لەگەڵ ئەوەی لە سیستەمی ئیسلامی هیچ تێکگیرانێك لەنێوان دونیا و دواڕۆژ بوونی نییە، گوایە عەلمانیەت هات بۆ ئەوەی ئەم تێکگیرانە چارەسەر بکات، د. موحەمەد موحەڕەم دەڵێت: ((خەریکبوون تەنها بە کاروباری دونیا و ژیانکردن واتا عەلمانی))، دواتر وتویەتی (هەموو موسڵمانان عەلمانین)، (خەڵکی بە سروشت عەلمانین) [١]، بۆچوونی تر هاوشێوەی بۆچوونی ئەو دەربارەی ئەم بابەتە هەن ... ئەم بۆچوونانە لەو گۆشە نیگایانەوە دێن کە هەموو ئاینێك شتێکی دوارۆژییە نەوەك دونیایی [٢]، ئەمەش بە هەموو شێوەیەك لە ئیسلام ڕەتکراوەیە.

لەبەر ئەوەی خەریکبوون بە دونیا حەلاڵێکی واجبە [٣] بە مەرجێك ڕەچاوی حەلال و حەرام و سنورەکان بکات [٤]، یەکێك لە گرینگترین ئەرکەکانی ڕابوونی ئیسلامی ڕاستکردنەوەی ئەم چەمکانەیە.

هزری ئیسلامی (یاخود ڕابوونی ئیسلامی) لە دوای ڕووخانی خەلافەتی ئیسلامی هات کە لە کودەتای (١٩٠٨ _ ١٩٠٩ز) عەلمانی نەتەوەیی، لە ٣/٣/ ١٩٢٤ بە هەڵوەشاندنەوەی یەکجارەکی خەلافەت لەلایەن ئەنجومەنی نیشتمانی گەورەی تورکیەوە بە سەرکردایەتی مستەفا کەمال، لەو ماوەیەدا هزری

---

(١) علمانية تحت المجهر .. المصدرالسابق. ص٦٨.

(٢) دەرەنجامی ئەم تێگەیشتنە هەڵەیە بۆ ئاین، پاپا لەگەڵ مۆسۆلینی ڕێککەوتن کە مۆسۆلینی هەموو کاروباری مرۆڤ بگرێتە دەست لە کاتی لە دایکبوونەوە تا مردن، پاش مردنیش ڕۆڵی پاپا دێت .

(٣) لاتنسى نصيبك من الدنيا \سورة قصص، اية٧٧.

(٤) بەم شێوەیە خەریکبوون بە دونیا بەگوێرەی تێڕوانینی ئیسلامی جیاوازە لە لیبراڵیەت و شیوعیەت هەروەك لە بابەتی (قوتابخانەکان و خشتەی بەراورد) ڕوونمانکردەوە.

(کۆمکاری ئیسلامی) دەرکەوت لەلایەن سولتان عەبدولحەمید و کۆمەلێك زانا لەوانە: (شێخ سەعیدی نورسی، جەمالەدین ئەفغانی، موحەممەد ڕەشید ڕەزا ..)، بە دروشمی ( ئەی موسلمانانی جیهان یەکگرن) [١]، دواتر ژمارەیەك کۆمەلەی ئاینی (لاواز) دروستبوون، لە باشوری ئاسیا بۆ باکوری ئەفریقیا لە ئاسیای ناوەڕاست بۆ ناوەڕاستی ئەفریقیا. دیارترینیان (یەکێتی موحەممەدی) بوو کە سەعیدی نورسی دایمەزراند سالی ١٩٠٨ز[٢]، لە عێراقیش (حزبی ئیسلامی) دروستبوو لە پلەی دووەم هات لە ڕووی کاتەوە کە (موحەممەد فازل داغستانی) دروستیکرد لە سالی ١٩٠٨ز کە دژی چالاکی ئیتحاد و تەرەقی بوو[٣]، حزبی نەهزەی ئیسلامیش سالی ١٩١٨م دامەزرا کە لە هەموویان زیاتر بلاوبووەوە و چالاکیان زیاتر بوون لە کاتی داگیرکردنی عێراق لەلایەن بەریتانیاوە، بە تایبەت لە کاتی ڕووداوەکانی شۆڕشی بیست، حزبی ئیسلامیش کە نزیك بوو لە شێخ مەحمود و دژی بەریتانیا لە سلێمانی بوونی هەبوو[٤]، لە زۆرێك لە ویلایەتەکان ڕێکخستنی هاوشێوە دەرکەوتن تا ئەوەی ئیخوان موسلمین بە سەرۆکایەتی حەسەن بەننا لە سالی ١٩٢٨ز پەیدابوو، پاشان حزبی کۆمەلی ئیسلامی لە نیمچە کیشوەری هیندی لە سالی ١٩٤١ز بە سەرۆکایەتی ئەبو ئەعلای مەودودی .. حزبی تەحریر لە سالی

---

(١) ئەم دروشمە پێش دروشمی شیوعیەت هەبوو (ئەی کرێکارانی جیهان یەکگرن).

(٢) کۆمەلەی تر هەبوون وەك (عروة الوثقى) کە شوێنکەوتەی ئەفغانی بوون، بەلام زۆرێك لە مێژوونووسان گومانیان لێی هەیە، تەنانەت هەندێك دوورتر لەمە ڕۆیشتوون بە هەولەکانی ماسۆنیەت وەسفی دەکەن، کۆمەلەی تر نزیك لە ئیسلام بوونیان هەبوو، بەلام دواتر گۆڕان، لەوانەیە ئەمە لە ڕاستی نزیکتر بێت.

(٣) د محمد سيد نوري البازياني – مستقبل الحركة الإسلامية في كردستان العراق – الطبعة الأولى ٢٠٠٦ مكتب تفسير– أربيل ص ٢١..

(٤) سروة احمد– كوردستان من بداية الحرب العالمية الأولى الى نهاية مشكلة الموصل –ط١\\٢٠٠١، وزارة التربية – أربيل ص ١٦٩.

١٩٥٢ز لەسەر دەستی (تەقیەدین نەبەهانی)[١]، بەڵام هزری ئیسلامی سیاسی لای دەستەبژێری ڕۆشەنبیران مایەوە بەبیّ بوونی ئەزموونی سەرکەوتوو، تا ئەوەی شۆڕشی ئیرانی لە ساڵی ١٩٧٩ز بە سەرۆکایەتی (خومەینی) بەرپابوو دواتر شۆڕشی ئازادکردنی ئەفغانستان دژی داگیرکەری سۆفێتی، لە سنووری دەستەبژێر و زانکۆکان گواسترایەوە بۆ شەقام دواتر بۆ گۆڕەپانی تری ژیان کە پێشتر لێی دوورخرابویەوە، ڕەهەندێکی تری بۆ گۆڕانکارییەکانی جیهان زیادکرد، دواتر لایەنە ئیسلامیەکان جەماوەری زیاتریان پەیدابوو بە بەراورد لەگەل عەلمانیەکان، هەروەك ئەمە بە ڕوونی لە هەڵبژاردنە دیموکراسیەکان لەدوای نەوەدەکان دەرکەوت لە سەدەی بیستەم، لە هەریەکە لە جەزائیر، تاجیکستان، تورکیا، بەحرەین، پاکستان، فەڵەستین، عێراق[٢] ...، بەم شێوەیەی ئیسلامیەکان دەڵێن ڕابوونی ئیسلامی وەلامی هەمو ئەو دابڕانەی (موسوڵمانە لە ئیسلام) کە هێدی هێدی لە ئیسلام دووردەخرانەوە لە سەردەمی موعاویە تا ڕۆژی ١٩٢٤/٣/٣ز کۆتایی هات ئەمەش ئەو ڕۆژەیە کە بە تەواوی لەسەر دەستی ئەتاتورك هەڵوەشێندرایەوە، بزوتنەوە ئیسلامیەکانیش تەنها بۆ نێوەندگیری نێوان خوا و موسڵمانان نەهاتوون[٣]، بەڵکو بۆ نێوەندگیری نێوان ئیسلام و موسڵمانان و ئاشتکردنەوە و دواتر یەکخستنەوەیان هاتن ..، یەکخستن لەنێوان ئەم چەمکە

---

(١) ینظر: کتاب (مسعود عبدالخالق– هە لبزاردن لە نیوان ئیسلامی و عە لماني ، ج١\٢٠٠٥ز–هە ولیر ل١٠–١١).

(٢) لە هەڵبژاردنی ساڵی ٢٠٠٥ز لە عێڕاق ئیسلامیەکان لە پلەی یەکەم هاتن هەروەها لە تورکیا و فەڵەستینیش لە پلەی یەکەم دابوون.

(٣) ئەم جۆرە لە نێوەندگیری زیاتر تایبەت بە سۆفیەکان بوو، ئەم پایەیەکی گرنگە بۆ هەموو لاوازێك بە تەنها، ئەمەش هەمان ڕۆڵە کە پیاوانی ئاینی لە مەسیحیەت دەیگێڕن، هەر دوکیشیان لە سیستەمی نوێی جیهانی و عەلمانی پەسەندن، بە مەرجێك ئاین هەر لە دڵەکان و پەروەردگار بمێنێتەوە و نەچێتە سەر هزر و تیۆر و سیاسی و بزوتنەوە.

دولایەنانە: دەسەڵاتی زەوی و دەسەڵاتی ئاسمان، دونیا و دوارۆژ، شەریعەتی ئاسمان و شەریعەتی زەوی، زانایان و دەسەڵاتداران، ئاین و دەوڵەت، سیاسەت و ئیسلام، بەم شێوە گۆڕانکاری گشتگیر لە بەرنامەی ئیسلامی سیاسی دەبێت، تێکگیرانی گشتگیر لەگەڵ عەلمانیەت تا ڕادەی دوانەیی، لەبەر ئەوەی بوونی عەلمانیەت پەیوەستە بە جیاکردنەوەی ئیسلام و موسڵمانان، ئەمەش گۆڕەپانی حەقیقی بەیەکدادانەکەیە لەنێوانیاندا.

چەندین هۆکار تا ئێستا یارمەتیدەر بوون لە بەرەوپێشچوونی ڕابوونی ئیسلامی و پاشەکشەی عەلمانیەت، بەتایبەت لە کۆتایی سەدەی بیست، بەڵام ئەمە لە دەرەوەی پلانی ئەم توێژینەوەیە.

# باسی سێیەم

# عەلمانیەت[١] لە جیهانی ئیسلامی:

## لقی یەکەم _ هاتنی عەلمانیەت بۆ جیهانی ئیسلامی:

ڕێساکانی مەسیحیەت لە ئنجیل شەریعەت لەخۆناگرێ، لە پەرتوکی پیرۆز بەشی خشتە و ڕوونکردنەوە بەخۆی دانیناوە بەمە، لەبارەی ئەم مانایەوە لە ئنجیل هاتووە: ((گرنگترین کارەکان و وتەکانی مەسیحی تێدان ...)) [٢] واتە پێکدێت لە کار و وتەکانی مەسیح نەوەك شەریعەتی خودا، ئەمەش تەنها لە چوار ئنجیلەکە (مەرقەس، یوحەنا، لۆقا، پۆلس) کورت نەبۆتەوە، بەڵکو ئنجیلی بەرناباش هەمان شتە، لەبەر ئەوە ئنجیل بۆشاییەکی گرنگی بەجێهێشتووە بۆ هەر یەکێك کە بیەوێ پڕی بکاتەوە، پیاوانی ئاینی بە کۆششەکانی خۆیان پڕیانکردۆتەوە بەگوێرەی بەرژەوەندی خۆیان، ئەو شەریعەتەی کە لە کۆششی ئەوان سەرچاوەی گرتووە لە خودی خۆیدا زیادە و بیدعەیەکە لە مەسیحیەت، لە ڕاستیدا ئەوەی لە ئەوروپا ڕوویدا شۆڕش نەبوو بەسەر مەسیحیەتدا بە تەواوی، بەڵکو شۆڕش بوو بەسەر ئەم زیادەیە، پاش شۆڕش بەسەر کەنیسە و ڕووداوەکانی گۆڕانکاری لە مەسیحیەت وازیان لە ململانێ هێنا و گەڕانەوە بۆ یەکێتی و کارلێککردن لە نێوان عەلمانیەت و مەسیحیەت و کەلتور، هەر یەکێك لە شوێنی خۆی، ئەمەش بووە هۆی بونیاتنانێکی نوێ و پێشکەوتوو، بەم

---

(١) تێبینی: زۆرجار باسی بە ڕۆژئاواییکردنم کردووە، کە نزیکە لە عەلمانیەت جا ئەگەر کتومت وەك ئەویش نەبێت، لە (علمانیە تحت المجهر ل ٤٩) هاتووە بە ڕۆژئاواییکردن واتا: سەپاندنی شێواز و ڕیتمی ڕۆژئاواییە کە سەپاندیان بۆ ڕیتم و شێواز و پێوەری عەلمانیەت .. (عەلمانیەت لە زۆربەی کاتدا سەردەکێشێ بۆ بە ڕۆژئاواییکردن، بەڵام هەموو عەلمانیەتێك بە ڕۆژئاواییکردن نەبوو بە عەلمانیکردنیش لەسەر ڕیتمی ڕۆژئاوایی هەیە وەك نمونە..

(٢) ئنجیل وشەیەکی یۆنانیە واتا مژدە، بەڵام تەوڕات واتا شەریعەت، زەند _ ئافێستا واتا ڕاڤە _ یاخود قانون(جدول شروح ... العهد الجدید –کتاب المقدس .. المصدرالسابق .

شێوەیەش عەلمانیەت بە زەحمەت چووە ناو کۆمەڵگەی ئەورووپی، بەڵام زۆر بە ئاسانی جێگەی خۆی گرت.

بۆیە عەلمانیەت بەسانایی لە رۆژئاوا سەری هەڵدا ئینجا پەڕیەوە بۆ جیهانی ئیسلامی ،بەلام نەك بەئاسانی،بەلكو پێویستی بە جەنگ وئاگروئاسن ورووخانی ئیمپراتۆریەتیك وجەنگیکی جیهانی بوە ، ئینجا نۆرە عەلمانی لەجیهان دێت وەك سیستەمیکی نوێی ژیان ... لە کۆمەڵگەی ئیسلامی چونکە قورئانێکی زیندوو بوونی هەیە و خوای گەورە فەرمویەتی: (( إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ ) الحجر ﴿٩﴾، واتە:(بەڕاستی هەر ئێمە قورئانمان دابەزاندووە و بێگومان هەر ئێمەش پارێزگاری دەکەین (نایەڵین دەستی خیانەتکار هیچ جۆرە دەستێکی تێبخات و هەموو هەوڵێك بۆ دەستکاری نەزۆکە) بیروباوەڕ و شەریعەت تێیدا کرۆکی ئاینن، بەبێ جیاکردنەوەیان، لەگەڵ ئەوەی زۆرێك لە لایەنەکانی فقهی ئیسلامی پێویستی بە وردبینی زانستییە، بەڵام لە کۆتاییدا هیچ بۆشاییەکی بەجێنەهێشتووە لە دوتووێی خۆیدا تاکو عەلمانیەت بێت پڕی کاتەوە، لەبەر ئەوە چوونی عەلمانیەت بۆ ناو جیهانی ئیسلامی بەشێوەیەکی سروشتی زەحمەتە لەژێر سایەی بوونی یاسا و حوکمی قورئان، لەوانەیە پرۆسەی (بە عەلمانیکردن) پێویستی بە هێزێکی دەرەکی بێت بۆ سەپاندنی، جێلەقکردنی قورئان لە دڵی موسڵمانان ..، لەبەر ئەوە زۆرێك لە توێژەران بۆ ئەوە چوون کە پەیوەندی لە نێوان عەلمانیەت و پرۆژە داگیرکاریەکان و سەهیۆنیەت هەیە[(١)]، بەڵگەش لەسەر ئەوە وتەی سەرکردەکانی ڕۆژئاوایە دەربارەی ئیسلام و قورئان و کەعبە و قودسە، دوودڵ نین لەوەی کە دەڵێن ئیسلام ڕێگری سەرەکییە بۆ داگیرنەکردنی جیهانی ئیسلامی، ئەمە سەرکردەی هەڵمەتی بورتوگالی دژی موسڵمانان ساڵی ١٥١٥ز کە دروشمی: ((دەرکردنی موسڵمانان و کوژاندنەوەی

---

(١) زیاد لەوەش لە مادەی (٢ _ ٥) لە پرتۆکۆلەکانی سەرکردەکانی سەهیۆنی هاتووە پێشبینی ئەوە کراوە کە لەوە دەچێت، وەك ئەوەی لە جیهانی ئیسلامی ڕوودەدات پێشتر بەرنامە بۆ داڕێژراو بووە.

ئاگری موحەممەدی تا کۆتایی))[١]، بەم شێوەیەش وتەی جەنەڕاڵ بە پێغەمبەر کاتی چوونە ناو قودس ساڵی ١٩١٨ز: ((ئێستا جەنگی خاج هەڵگرەکان کۆتایی هاتووە))[٢]، گلادسۆن _ سەرۆك وەزیرانی بەریتانیا _ لە ناو وەزیرەکان قورئانی بە دەستەکەی هەڵگرت و وتی: (مادام ئەم قورئانە لەبەر دەستی موسڵمانانە دەیخوێنن و گرنگی پێدەدەن، ئێمە ناتوانین هیچ بکەین، پێویستە کاربکەین بۆ نەهێشتنی و هەڵکێشانی قورئان لە دڵ و عەقڵی موسڵمانان))[٣]، لە چەند لایەکی جەنگی جیهانی یەکەم درك بە گرنگی قورئان کرا وەك ئامرازێك بۆ تێکۆشان لە گۆڕەپانی جەنگ لەبەر ئەوە ئامادەکاری تەواو کرا دژی[٤].

بەم شێوەیە بە عەلمانیکردن لە جیهانی ئیسلامی پێویستی بە نەخشە و پلانی ئاڵۆز و درێژ مەودا هەیە زۆر جا پێویستی بە هەڵمەتی سەربازی داگیرکاری هەیە و جەنگی هزری و شارستانی و ڕۆشەنبیری زۆر جاری تریش تەبشیری.. لەبەر ئەوە هۆکار و ئامراز و پاساوەکانی عەلمانیەت لە ڕۆژئاوا تەواو جیاوازە لەو دۆخەی کە جیهانی ئیسلامی هەیەتی، عەلمانیەت لە سەرەتای سەدەی بیست لەگەڵ هەڵمەتە سەربازییەکان هاتنە ناو جیهانی ئیسلامی، لە سایەی ئەو دۆخە

(١) د.عدنان – المسلمون .. المصدرالسابق ص١٠

(٢) الموسوعة الميسرة .. المصدرالسابق ص١٥٠.

(٣) بني مرجة–صحوة .. المصدرالسابق ص١٩٩

(٤) للتوسع نرجوالنظر الى كتب التالي : عباس محمود عقاد– مايقال عن الإسلام ص٩١ ، جورج كامبل–الأفرقا الإستوائية ج٢ص٢٧٦، مايكل ريبون–النار السوداءحرب العصابات فى روديسيا ص٧٦–، ص١١٧ ، معذبو الأرض– ص٦ ، عبدالكريم العبيدى – تصفية المصالح الإمبريالية الأمريكية ص٤٨ ، المعتقدات الدينية لدى الشعوب ص٧ ، إدوارد سعيد (الاستشراق والثقافة والإمبريالية – Orientalism 1978، Culture & Imperialism ,new york 1993)، روجيه غارودى–ماركسية قرن عشرين ص١٤٩ وص١٩٥ ،هارى ماجدؤف– الإمبريالية من عصرالإستعمار الى اليوم ص٦٧ التبشير والاستعمار ص ١٠٤.

خەراپەی جیهانی ئیسلامی لە ڕووی سیاسی و کۆمەڵایەتی و شارستانی و سەربازییەوە تێکەوت بەم شێوەیەی خوارەوە:

١ _ ڕووخانی خەلافەتی ئیسلامی و سەرکەوتنی هاوپەیمانان لە جەنگی جیانی یەکەم لە ساڵی ١٩١٤ _ ١٩١٨ز.

٢ _ داگیرکردنی جیهانی ئیسلامی و دابەشکردنی لە لایەن ئەو دەوڵەتانەی کە مەشخەڵی عەلمانیەتیان بەرزکردبووەوە.

٣ _ لە ناوەخۆ، ئومەتی ئیسلامی بەدەست دابەشبوونی نەتەوەیی و مەزهەبی و ڕەگەزپەرستیەوە دەیناڵاند، ئەمەش بووە هۆی بەش بەشکردنی خانەی ئیسلامی (نیشتمانی ئیسلامی) بۆ چەندین دەوڵەتۆکە و نیشتمانی جیاواز.

٤ _ باڵادەستی شارستانی ڕۆژئاوایی بەسەر شارستانی ئیسلامی بەشێوەیەکی بەرچاو.

بەپێی ڕێساکەی ئیبن خەلدون (ژێردەستە هەموو کات شوێنکەوتەی سەردەستە)[1]، لەم دۆخەشدا (کە ناسروشتیە) دۆخی باڵادەستی ڕۆژئاوایە بەسەر جیهانی ئیسلامی لە ڕووی سەربازی و سیاسی و ڕۆشەنبیری و زانستی کە عەلمانیەت تێیدا پێشەنگە ... پێشتر کە ئیسلام سەردەست و باڵادەست بوو، نمونەیەك بوو بۆ پێشکەوتن و شارستانی و پێشەنگی سەردەمی خۆی بوو، لەم بارەیەوە (شبلی عیسمی)دەڵیت: ((یەکەم شەپۆلێ ڕۆشەنگیری کە ئەورووپای ڕووناك کردەوە پەرتوکەکانی ئیبن ڕوشد بوون لەبەر ئەوە کەنیسە خوێندنەوەی پەرتوکەکانی ئیبن ڕوشدی حەرام کرد))[2]، بە پێی هەندی تویژینەوە لە ئیتالیاش کاریگەریەکانی بیری روشدی بوە کە بە (روشدی لاتینی–مەبەستی ئیبن روشدە)ناوی دەبرا ،دەشگۆترێ (پادوا)مەلبەندی سەرەکی بلاو بوونەوەی

---

(١) ابن خلدون –مقدمة تحقيق:د.حامد أحمد الطاهر، دار الفجر–القاهرة ص١٩٢

(٢) شبلي العيسمي – العلمانية .. المصدرالسابق ص٣٦

شارستانی روشدی بوه بۆ ئیتالیاو لەویش بۆ هەمو ئەوروپا[١] ، لە بەلّگەنامە مێژووییەکان هاتووە کە پادشای بەریتانیا (جۆرج) بۆ (هیشامی سێیەم)ی خەلیفەی ئەندەلوس نووسیویەتی و داوای لێکردووە یارمەتی قوتابیە بەریتانیەکان بدەن لە خوێندن لە زانکۆکانی ئەندەلوس[٢].

ئەستێرەی ئیسلامی بەردەوام بوولە پێشکەوتن تا نزیك سەدەی(١٧_١٩ز)[٣]،ئامرازە سەربازییەکانی عوسمانیەکان بەهێزتر بوون[٤]، دوای ئەمە دواکەوتنی ڕۆشەنبیری و ئاینی و شارستانی بالّی بەسەر جیهانی ئیسلامیدا کێشا، لەو کاتەی ئەوروپا بە قۆناغەکانی پێشکەوتن گوزەری دەکرد: لە سەردەمی تاریکی (سەدەکانی ناوەڕاست) بۆ سەردەمی ڕابوون و سەردەمی ڕۆشەنگەری دواتر سەردەمی نویێ (عەلمانی)، بە پێچەوانەی جیهانی ئیسلامی کە دەستی بە پاشەکشە و دابەزین کرد. دووبارە کلتور و ڕۆشەنبیری ڕۆژئاوایی و ڕۆژهەلّاتی هی کۆن و نوێی، لە هەموو لایەك دەوری عەقلّی موسلّمانیان دا وەك پێشەکیەك بۆ بلّاوبوونەوەی عەلمانیەت.

---

١ لەبارەی کاریگەری روشدی بروانە:د علیان جارودی- التحولات الفکریە فی العالم الاسلامی ص٦١٦-

(٢) مەوسوعەی جودی ،مادة:شورا .

(٣) د.عدنان – المسلمون .. المصدرالسابق. ص ٨٥

(٤) مەدفەعی و هاوەنی هەبوون کە بەکاریهێنان بۆ رزگارکردنی قوستەنتنیە، لە بەشەکانی تر باسی دەکەین

## وێستگە مێژووییەکانی بەعەلمانی کردنی جیهانی ئیسلامی

له ڕووی مێژوویی: یەکەم هەڵمەتی داگیرکاری کە جەنگی هزری و ڕۆشەنبیری لەگەڵ بوو هەڵمەتی ئەسکەندەری مەقدۆنی بوو بۆ سەر ڕۆژهەڵات سەدەی (٤ _ ٣ پ.ز) کە دەستەی زانایانی لەگەڵ بوو، دوای ئەمە بزوتنەوەیە هێلنستی لیّ بەرهەم هات[١]، کە بنەماکانی (فرق تسد )و(پراگماتیك) و (سیکولاریزم)ی بەڕوونی لێبەدی دەکرێت ،بەتایبەتی لە نامە وەلامی ئەرستۆ بۆ ئەسکەندەر ، نامەی ئەسکەندەر: أنّه شاهد بإيرانشهر رجالا ذوي أصالة في الرأي، وجمال في الوجوه، لهم مع ذلك صرامة وشجاعة، وأنه رأي لهم هيآت وخلقا، لو كان عرف حقيقتها، لما غزاهم، وأنه إنّما ملكهم بحسن الاتفاق والبخت، وأنّه لا يأمن - إن ظعن عنهم - وثوبهم، ولا تسكن نفسه إلّا ببوارهم. وەلاّمی ئەرستۆ: « فهمت كتابك في رجال فارس. فأما قتلهم فهو من الفساد في الأرض ولو قتلتهم لأنبت البلد أمثالهم لأنّ إقليم بابل يولّد أمثال هؤلاء الرجال، من أهل العقول والسداد في الرأي، والاعتدال في التركيب، فصاروا أعداءك وأعداء عقبك بالطبع، لأنّك تكون قد وترت القوم، وكثرت الأحقاد على أرض الروم منهم وممن بعدهم، وإخراجك إياهم في عسكرك مخاطرة بنفسك وأصحابك. ولكنى أشير عليك برأى هو أبلغ لك في كلّ ما تريد من القتل، وهو أن تستدعى أولاد الملوك منهم، ومن يستصلح للملك ويترشح له، فتقلّدهم البلدان، ويتوليهم الولايات، ليصير كل واحد منهم ملكا برأسه، فتتفرّق كلمتهم، ويجتمعوا على الطاعة لك، ولا يؤدّى بعضهم إلى بعض طاعة، ولا يتّفقوا على أمر واحد، ولا تجتمع كلمتهم. »[٢] ،بەو شێوەیە یەکەم بنەمای (ئایدیۆلۆجیای داگیرکاری) لێرە دێت ، هەر لەو هەلمەتەی ئەسکەندەر ولەپیناو لاوازکردنی بەرگری میلەتان بۆ داگیرکاریەکەی ئەوا دوو قوتابی

(١) زاراوەکە لە دوو وێژە پێکدێت (هێلین= باب و باپیران + ئیست= ڕۆژهەڵات) واتا ئاوێتە کردنی کلتوری ڕۆشەنبیری یۆنانی و ڕۆژهەڵاتی، ئیغریقە کۆنەکان بە بێئاینەکانیان دەوت (هیلاس) بڕوانە: ویل دیورانت – أبطال فی التاريخ – ص٩٦

[٢] دەقی ئەو نامانە لە کتیبی ابن مسکويه(ج١ تجارب الأمم ص٢٣) وەرگیراوە.

فیساگۆرسی هێنابوو لەگەل خۆی، لە (الملل والنحل) هاتووە: ((فیساگۆڕس دوو قوتابی هەبوون، یەکێك ناوی (ملتسکس) بوو بە (مرزنوس) دەناسرا چووە ناو فارسەکان لە نێو خەڵکی بانگەوازی بۆ (حیکمەتی فیساگۆڕس دەکرد) حیکمەتی ئەوی بۆ ئایینی (مەجوسیەت)ی گەلەکە زیاد کرد، ئەوی تریان ناوی (فلانۆس) بوو چووە هند لەنێو خەڵکی بانگەوازی بۆ (حیکمەتی فیساگۆڕس دەکرد) حیکمەتەکەی بۆ ئاینی (بەرهەمی) ئەو گەلە زیادکرد .. (مەجوسیەت لایەنە جەستەییەکەیان وەرگرت، بەڵام هندیەکان لایەنە رۆحیەکەی ئەویان وەرگرت))[1]، ئەم بزوتنەوەیە لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست بۆ زەریای هندی کاریگەری خۆی بەجێهێشت، لە دەرەنجامی ئەوەش دەبینن زۆربەی ئاین و بیروباوەڕە کۆنەکان جۆرێك لە جیاکردنەوەی نێوان دەسەڵاتی ئاسمانی زەوی تێدایە وەك ڕەنگدانەوەیەك بۆ فەلسەفەی یۆنانی، ئەم جیاکردنەوەیە دووبارە گەڕایەوە و هاتە نێو جیهانی ئیسلامی پاش خەلافەتی سەرڕاستەکان لەگەڵ ئەزموون و هزر و نەریتە نائیسلامیەکانی تر، هەندێکیان ئەرێنین و بە ئەزموونە مرۆییە زانستیەکان هەژمار دەکرێن، هەندێکی تریان نەرێنین زیادکراون بۆ بەرنامەکە، بەڵام لە کۆتاییدا دەرگاکان بۆ هاوردەکردنی ئەم ئەزمونانە کرانەوە لەسەر حسابی بەرنامە و پەیامی ئیسلامی، لێرەدا هەندێکیان دێنینەوە:

_ یەکەم لادان لەسەر دەستی معاویە دەستپێیکرد کاتێك خەلافەتی داگیرکرد و گۆڕی بۆ پشتاوپشتی.

(١) ابي الفتح الشهرستاني– الملل والنحل – تحققت محمد عبدالقادر الفضل، بيروت، طبعة الأولى ج٣ ص٧٩ –{ كذلك يورد قصة الحضارة – ج١٣ قصة فرار كثير من الفلاسفة اليونانين في ٥٢٩ م عندما غلق مدارس أثينا } .

_ بۆ یەکەم جارلەسەردەمی عبدالمليکی کوری مەروان(٦٥-٨٦)ك بۆ تۆماری باج(خراج) زەوی ناوەکان لە هەمو وولات بە عربی تۆمارکران ،هەر لەسەردەمی ئەو لە٧٥ك بەرامبەر ٦٩٦ز زمانی عەرەبی کرایە تاکە زمانی فەرمی نەك هەر لەدەولەت بەلکو بۆ تەواوی میلەتی موسولمان[1]،

لە دوای ئەزمونی خەلافەتی راشدین لادانیکی مەترسیدار لە رێڕەوی ئاینی راستەقینە بەرەو دەمارگیری خیلەکی ورەگەزی نەفامی بەدی دەکرێ ، ئەوەی لەئەمەویەکان نەبوایە بە موالی ناو دەبرا یان (علوج)، ،ئەو تێڕوانینە زۆر بە ڕوونی لە پانتاییەکی فراوانی فقهی ئیسلامی ڕەنگی داوەتەوە، لە فقهی ئیمامی شافیعی وئیمامی ئەحمەد و ئیمامی مالیك ومیراتگرانی وزۆر بە زەقتر لەفتواکانی ابن تیمیەوعەرەب بەسەر عەجەم وکورد(فەزل)کراوە، هەرچەندە دەقی ئاشکرا دژ بە(فەزل)هەیە لەسەر بنچینەی ڕەگەزوڕەنگ وچینایەتی .

-گەیشتە ڕادەیەك خەلیفەی ئەمەوی باوەڕی بە خودا نەبوو،(ولید بن یزید٨٨-١٢٦ه) ئەو خەلیفەیە ئیبن قوتەیبەو زۆربەی شارەزایان بە بێ باوەڕی وەسفی دەکەن[2]، شیعری هەیە گالتەجاڕی بە خواو قورئان دەکا کاتێ لە قورئان بینیویەتی باسی (سزاو پاداش)دەکا دەڵێ:

تذکرنی الحساب ولست ادری احقاماتقول من الحساب

فقل لله یمنعنی طعامی وقل لله یمنعنی شرابی٣

[1] ايران تاريخ والحضارة ص٥٣ .

[2] ابن قتيبة الدينوری- المعارف –تحقيق: ثروة عكاشة ص٣٦٦، د محمد عمارة لة(المعتزلة والثورة ص٧٢) بة زةنديقى وةسف دةكا

[3] د محمد عمارة-المعتزلة والثورة ص٧٢

-بەرگری فەقیهو زانایان ئەوەندە لاواز بووبەرامبەر دەسەلات كە دەلێن نابێت لەدەسەلات یاخی ببیت تا (كوفریكی بەواح)ی لێدەبینی ،ئێ ئەو خەلیفەیە هەر باوەڕی نەبوە كەچی لە فەرمانی ئەو خەلیفەیە یاخی نەبوون ..بەلام ئامادەبوون زانایەكی فكری وفلسفی لەسەر كوفر بسوتێنن .

-لە سەردەمی ئەمەوی وعەباسی ڕا هەردوو زاراوەی ئەهلی قەلەم (زانایان)وئەهلی سەیف(دەسەڵاتداران) لێك جیا بوویەوە، ئیترپرسی تەسەوف و تەركی دنیا..ئەو ڕیشانەی هەیە، بەرە بەرەئاینی ڕاستەقینە لە دەسەڵات و سیاسەت دوور خرایەوە لەجیاتی فقهێكی خزمەت بە دەسەلات هێشترایەوە، ئەهلی عەقل وقەلەم بەرەبەرە پەراوێز خران ،بوە هۆی زیادبوونی كاریگەری فەلسەفەی یۆنانی لە سنوری خۆی زیاتر كاری لە هەندێ زانای ئیسلامی كرد، لەوانە دروشمی (إخوان الصفاو-كە بریتی بو لە : (فەلسەفەی یۆنان و شەریعەتی ئیسلامی یەكتر تەواو دەكەن)[1]،

_ لە سەردەمی عەباسیەكان نەریتی نائیسلامی هاتە كۆمەڵگە ... هەروەك فەلسەفەی ئیغریقی باڵی بەسەر ژیانی هزری كێشا[2].

_ یەكەم ئەزموونی وەزاری لە سەردەمی عەباسیەكان لەماوەی ١٣٢ _ ٢٣٢ك كە لە فارسەكان وەرگیرا هاتە نێو حوكمڕانی ئیسلامیەوە[3].

[1] مسعودعبدالخالق-رەوشی فلسفی سەدەی٢١ ل٨١

(٢) الموسوعة الأديان في العالم – المشرف العام: جميل مريك، طبعة الأصلية ٢٠٠٠، بيروت، ، ج: الإسلام – ص١٥.

(٣) أ.د.محمد الحرب- موسوعةسفيرالتاريخ –طبعة القاهرة ج٣ص١٤٣ .

_ سەنتەرەکانی خەلافەت زۆر بوون، بۆ نمونە لە یەك کاتدا سێ خەلافەت بەناوی ئیسلام هەبوون: ١) عەباسیەکان لە عێراق. ٢)ئەمەویەکان لە ئەندەلوس.٣) فاتمیەکان لە ئەفریقیا و سەقلیە و باکوری ئیتالیا، دواتر مسر و بەشێکی گەورەی شام[١].

_ هارِوون رەشید دەستی بە هاوکاریکردن کرد لەگەڵ مورابیتە مەسیحیەکان لە ئەندەلوس دژی خەلافەتی ئیسلامی لەبەشی ئەندەلوس کرد، گفتوگۆیەکی مێژوویی هەیە دەربارەی پەیوەندی گوماناوی نێوان هارِوونە رەشید لەگەڵ شارلمان[٢]، راستەوخۆ یاخود لە رێگەی بازرگانی نهێنی[٣].

## بە رۆژئاواییکردن لە سەردەمی عوسمانیەکان:

بەشێك پێیان وایە نەك بە رۆژئاوایی کردن بەلکو خودی عەلمانیەت لەجیهانی ئیسلامی بۆسەردەمی سولتان سەلیم دەگەریتەوە ،سلیمان قانونی (قانون نامە) بلاوکردەوە سودی لە یاساکانی جیهانی (نا ئیسلامی) وەرگرت، دوایش هاوسەری لەگەل رۆکسیلا کرد کە خانمێکی یەهودی زۆر ژیر بوو ،لەوەوە هەندێك پێیان وایە ریشەی عەلمانی لە جیهانی ئیسلامی بۆ ئەو خانمە دەگەرێتەوە..ئیتر لەدوای ئەوە ویستگەکان دەست پێدەکات بەو شێوەیەی خوارەوە :

١-لە سەردەمی (سولتان مەحمودی دووەم) ئینکشاریەکانی لەناوبرد بۆ یەکەم جاریش لەساڵی ١٨٢٦ز بەرگی سوپای خەلافەت بووە ئەورووپیانە .

(١) د.وهبة الزحيلي –الفقه الأسلامي وأدلته، مؤسسةالأبحاث العربية –بيروت، ط٤ ٢٠٠٤م ص٦٣٠٧ .

(٢) شارلمان بە دامەزرێنەری دەوڵەتی فەرەنسی دادەنرێت و هاوسەردەمی هارِوونە رەشید بوو.

(٣) ينظر:أ– حامد غضبان الراوي –العروبة بين الشعوبية والأستعمار، مطبعة دار التضامن –بغداد ١٩٦٣م ص٢٢ ب–الموسوعة العربية .. المصدرالسابق ج١١ ٢٠٠٥–.

٢- سولّتان عەبدولمەجید سالّی ١٨٣٩ز بۆ دەستورێکی تێکەڵ لەنێوان شەریعەتی ئیسلامی و بنەماکانی شۆڕشی فەڕەنسی دەستی هەڵگرت، لەو کاتەوە بۆ یەکەم جار ڕاستەخۆ هاوبەشێك لە یاسا بۆ شەریعەت هاتە ئاراوە – (سەرچاوەی بەتاقی تەنها شەریعەتی ئیسلام نەبێ).

٣- هەر لە ١٨٣٠ز کۆمەلێك خویندکار چوونە ئەورووپا بە وەرگێڕانی پەرتوکەکانی فۆلتێر و ڕۆسۆ و مونتسیکۆ گەڕانەوە، وەك هەولێك بۆ ئەوەی هزری ئەورووپی بلاّوبکەنەوە، کە لە سەدەی هەژدەم دژی ئاینی مەسیحی شۆڕشی کرد.

٤- لە سالّی ١٨٥٦ عوسمانیەکان چوونە نێو (خێزانی ئەورووپی) کە پاش ئاشتەوایی ویستفالیا سالّی ١٦٤٨ز هاتە ئاراوە لەسەر بناغەی عەلمانیەت[١].

٥_ لە میسرِ (کە ولایەتێکی عوسمانی بوو) موحەمەد عەلی (والی مسرِ– کەلەسالّی ١٨٠٥ز دەسەلاّتی گرتە دەست)دەستی کرد بە دروستکردنی سوپا لەسەر سیستەمی فەڕەنسی[٢]، هەر لەم سالّەدا چاکسازییەکانی موحەمەد عەلی بە ڕەگ و ڕیشەی عەلمانیەت دادەنرێت، هەروەك پشتی بەست بە هەناردنی دەرچووانی ئەزهەر لەپێناو پسپۆڕی وەرگرتن لە ئەورووپا.

(١) الزحیلی .. المصدرالسابق ص ٦٣٠٥.

(٢) موحەمەد عەلی زۆر نزیکتر بوو لە فەڕەنسا هەروەك دواتر دەردەکەوێ، لە کاتی ململانێ لەگەڵ خەلافەت و دەست بەسەرداگرتنی شام، بە بڕیارێك لە کۆنگرەی لەندەن سالّی ١٨٦٠ز بۆ ئەو شتە گەڕایەوە کە لێوەی هاتبوو، فەڕەنساش بەشداری نەکرد بەهۆی ڕازینەبوون بە بڕیارەکانی دژی موحەمەد عەلی.

٦- لە تونس (ئەحمەد پاشا بای یەکەم )سوپایەکی ڕێکخراوی دروستکرد و قوتابخانەی زانستە سەربازییەکانی کردەوە و کە ئەفسەر و مامۆستا فەرەنسی و ئیتاڵیا و ئینگلیزەکان تێدابوون.

٧_ لە ئێران _ کە لە چوارچێوەی دەوڵەتی عوسمانی نەبوو بەڵام بەشێکە لە جیهانی ئیسلامی _ ساڵی ١٨٥٢ز کۆلیژی زانست و هونەرە سەربازیەکانی لەسەر بناغەی ڕۆژئاوایی کردەوە.

٨_ لە لوبنان هەر لە ساڵی ١٨٦٠ز بزوتنەوەی بەرۆژئاواییکردن لە ڕێگەی نێردراوەکان دەستی پێکرد، لەوێوە بۆ مسرِ لە سایەی حوکمی خدێوی ئیسماعیل کە ئامانجی ئەوەبوو مسرِ بکاتە بەشێك لە ئەوروپا، لە ساڵی ١٧٦٧ز خدێوی سەردانی پاریسی کرد کە هاوکات بوو لەگەڵ سەردانی سوڵتان عەبدولعەزیز، ئەو کاتەی بە پیل داخوازی ئیمپراتۆرِ ناپلیۆنی سێیەم چوو بۆ ئامادەبوون لە پیشانگای گشتی فەرەنسی، هەر دووکیان بەرەو تەوژمی شارستانیەتی ڕۆژئاوایی دەچوون.

٩_ نەسرِانیەکان شام یەکەم کەس بوون پەیوەندیان بە نێردراو و تەبشیریەکان کرد، کلتور و ڕۆشەنبیری فەرەنسی و ئینگلیزیان وەرگرت، هەروەك هانی عەلمانیەتی ئازادیخوازیان دەدا، ئەمەش لەبەر ئەوەی بەرامبەر دەوڵەتی عوسمانی خۆشەویست و دڵسۆزیان نەبوو، ئەوەیان لیَ دەرکەوت کە بەڵگە بوو لەسەر سەرسامبوون بە ڕۆژئاوایی و بانگەشەکردن بۆ شوێنکەوتنی، ئەمەش لەو ڕۆژنامە و گۆڤارانە دەرکەوت کە دایانمەزراند و کاریان تێداکرد _ لەوانە: ناسیف یازجی ١٨٠٠ _ ١٨٧١، بەترِس بستانی ١٨١٩ _ ١٨٨٣)، ئەوانە یەکەم مەسیحی بوون بانگەشەی بۆ عەرەبچێتی و نەتەوایەتی دەکرد، کە

دروشمی بریتی بوو لە (خۆشەویستی نیشتمان لە باوەڕ دایە)، بەشدار بوو لە وەرگێڕانی پڕۆتستانتی بۆ تەوراتی لەگەڵ ئەمریکیەکان (سمیس و کاندیك)[(١)].

لە ڕووی سەربازییەوە: لێرە زیاتر گوزارشتە لە شکستە سەربازیەکان بەرامبەر ڕۆژهەڵات، سەرەتا لە ئەندەلوس دواتر ئەفریقیا تا دەگاتە هند، بەڵام ئەوەی کاریگەریەکی گەورەی هەبوو لە لەدەستدانی پلەبەندی ویلایەتە عوسمانیەکان لە سەدەی هەژدەمەوە بەگوێرەی زنجیرەیەکی کاتی، بەم شێوەیەی خوارەوە:

مەجەر ١٧٧٤ز، مصر ١٨٠٨ز، سربیا ١٨٧٠ز، ڕۆمانیا ١٨٧٨ز، یۆنان ١٨٨٢ز، بولگاریا ١٩٠٨ز، تەڕابلوس (لیبیا) ١٩١١، ئەلبانیا ١٩١٣ز[(٢)].
کاریگەری ئەم شکستانە بەهێز و ڕاستەخۆ بوون لە بەهێز کردنی هزری عەلمانیەت و پاشەکشەکردنی هزری ئیسلامی، بەڵام لە بەرەی ڕووسی جەنگ لە دژی عوسمانیەکان لە ساڵی ١٨٧٥ز بووە هۆی لادانی سوڵتان بەهۆی قەرزداری جەنگ و بەڕێوەبەرایەتی نێودەوڵەتی سەرپەرشتیکردنی بابەتی ئەم قەرزە و کاری دانەوەی کرد[(٣)].

یەکەم تەحەدای مەترسیدار دەرکەوتنی بابەتی سەربەخۆیی لوبنان بوون لە سەنتەری خەلافەت، چیرۆکەکە بەم شێوەیە بوو: پێگەی فەڕەنسا و

(١) ئەم زانیاریان لەم پەرتوکانە وەرگیراون: أ- الموسوعة الميسرة .. المصدرالسابق ص١٤٥–١٤٧، ب– محمد مهدي الشمس الدين– العلمانية .. المصدرالسابق ص ٩١–٩٢ ج– بنى مرجة –صحوة رجل المريض .. المصدرالسابق .ص١٦٥–، ٢٦١–.

(٢) د. وميض جمال عمر النظمى واخرين –التطور السياسى المعاصر فى العراق، وزارة التعليم العالى والبحث العلمى–جامعة البغداد ص٣١–

(٣) د.عدنان على –المسلمون .. المصدرالسابق ص١١٢

ئینگلیزەکان لە نێوان مارۆنیەکان و درووزەکان دابەش ببوو، کە بووە هۆی ئاشوبی مەزهەبی لە نێوانیان، لە کۆتاییدا سولتان دەستیهەلگرت بۆ دەولەتە ئەوروپیەکان کە سیستەمێکی بەڕێوەبەری تایبەت بە جەبەل لوبنان بدات و نەسرانیەکان حوکمداری بکەن، بەم شێوەیە لێرە و لەویَ ویلایەتەکانی لەدەستدەدا، بەڵام بە هۆی بزوتنەوە ناوەخۆییەکان یاخود سەرەنجامی جەنگی داگیرکاری، لە زەریای هندی و ئەفغانستانەوە .. بۆ مەغریب و دووورگەی عەرەبی و مسرِ و باکوری ئەفریقیا و شام کە لە کۆتاییدا دەولەتی عوسمانی کەوتە تەڵەی جەنگی جیهانی یەکەم و دوا جار توشی شکستی گەورە هات پاشان رِووخا[١].

لە رِووی هزریەوە: گرنگیەکەی لە گۆرِەپانی سەربازی کەمتر نییە، بەهۆی ململانێی بالی فقهي وبالی فکری فلسفی و شکستی فکری ووشیاری لەجیهانی ئیسلامی زۆر سست بوو ،هزری ئیسلامی دەستەوەستان بوو لە رِوبەرِوبونەوەی پێشهات و پرسە هەنوکەییەکان، لە لایەکی ترەوە تێککگیرانە هزریە ناوەخۆیەکان (لە نێوان قوتابخانە ئیسلامیەکان) بەردەوام بوو بەبیَ چارەسەر، دواتر پەنایان بردە بەر فەلسەفەی یۆنانی بۆ دۆزینەوەی چارەسەر، رِەگ و رِیشەی ئەم قەیرانانە لە ناوەخۆی هزری ئیسلامی سەریانهەلدا کە نەیتوانی رِاڤەی هەندیَ دیاردەی سیاسی رِۆژئاوایی بکات، بەتایبەت ململانیَ سیاسیەکان لەسەر دەسەڵات، کە بووە هۆی دروستبوونی ناکۆکی و بەکارهێنانی خراپی ئاینی ئیسلام لەپێناو پەردەپۆشکردنی پاڵنەرە سیاسیەکان، بەتایبەت پاش یاخی بوونی معاویە و داگیرکردنی خەلافەت، کە بووە هۆی ئەوەی هێدی هێدی زانایان لە دەسەڵاتی سیاسی دوورخەنەوە، ئەمەش

(١) مقتبس من الكتاب د.عدنان –المسلمون .. المصدرالسابق ص ١١١ – ١٢٨

سەرەتای درزی نێوان: ئاین و سیاسەت، قورئان و سوڵتان، زانایان کاربەدەستان (پێنوس بەدەست و شمشێر بەدەست) ..، ئەم درزە یارمەتیدەر بوو بۆ خراپ تێگەیشتن لە هەندێ فەرموودە وەك: (رۆژێك دێت قورئان و سوڵتان لێك جیا دەبنەوە ئێوە لە قورئان جیا مەبنەوە[١][٢])، (( ئەگەر دەسەڵاتداران لەبەر دەرگای زانایان بینران ...) بەم شێوەیەش (وا كار بۆ دونیاکەت بکە وەك ئەوەی هەرگیز نامری ...) وەك ئەوەی لەلایەك باسی قورئان و زانایان و دوارۆژ و لەلایەکی باسی دەسەڵات و دەسەڵاتداران و دونیا دەکات، ئەمەش بە کردار بەرجەستە بوو دوای ئەوەی معاویە بە هێز و فێڵ دەستی بەسەر خەلافەت داگرت، سیستەمەکەی بۆ پشتاوپشتی و ستەم گۆڕی کە بووە هۆی دوورکەوتنەوەی کۆمەڵێك سەرکردە و زانایان وەك (سەعدی کوڕی ئەبی وەقاس، ئەبو موسای ئەشعەری، ئەبو ئەیوبی ئەنساری ...) بۆ دوورە پەرێزی لە سیاسەت، ئەمەش وای لە عەلی کوڕی ئەبی تالیب کرد باسی ئەوانە بکات کە دوورە پەرێزیان لە سیاسەت هەڵبژارد و وتی: (ئەمانە حەقیان شەرمەزار کرد و ناحەقیان سەرنەخست)، ئەم دوورکەوتنەوەیە لەسیاسەت بووە هۆی جیاکردنەوەی پلەبەندی نێوان چەمکە یەکانیەکان: دونیا و دوارۆژ، زانا و کاربەدەست، عەقڵ و نەقڵ، شەریعەت و یاسا یاخود ئاینی ئاسمانی یاسای زەمینی (دەستکرد)، دەسەڵاتی ئاسمانی و دەسەڵاتی زەوی، ئاین و نیشتمان، دواتر جیاکردنەوەی ئیسلام و موسڵمانان ... ئەم جیاکردنەوەیە بەردەوام بوو تا زۆربەی ڕەهەندەکانی ژیانی ئاسایی و ئاڵۆزی گرتەوە، چ ڕۆژانەیی چ ئەوەی دوورە، .. لە کۆتاییدا زانایان ڕوویان کردە

---

(١) هزری ئیسلامی هاوشێوەی فقهی ئیسلامیە، فقه ئەو زانستەیە کە مرۆڤ لە شەریعەت تێیدەگات، بەڵام هزری ئیسلامی ئەو زانستەیە کە مرۆڤ لە عەقیدە و باوەڕی ئیسلامی تێیدەگات.

(٢) أخرجه الطبراني في الكبير (٢٠\٩٠)والصغير (١\٢٦٤)، وذكره إبن الحجر في المطالب العالية (٤٣٤٨)

پێنووس و مینبەر و بابەتە ڕۆحی و دوارۆژییەکانی ئومەت و پیاوە سیاسیەکانیش (دەسەڵاتداران) بۆ کورسی دەسەڵات و چەك و کاروبارە دونیاییەکان چوون، لەبەر ئەوە لە پاشماوە و کلتوری ئیسلامی پەرتوکی زۆر کەم لەبارەی سیاسەت هەیە، جگە لە هەندێ سەرچاوەی دەگمەنی وەك (سیاسة الشرعیة- ابن تیمیة)،طرق الحکمیة، احکام السلطانیة،...بەشێکی زۆریش لەو جۆرە کتێبە بەدەستنووس ماونەتەوە بە هۆی مقەسی سانسۆر یان لە بەر ترسی خۆی[١] ،پێگەی سیاسەت لە (باشترین زانست) بۆ (پەنا دەگرم بە خوا لە شەیتان و سیاسەت) دابەزی، لە جیهانی ئیسلامی ئەو ڕێکەوتنەی کە پێشتر باسکرا (لە نێوان پاپا _ مۆسۆلینی) بەرجەستە بوو، موسڵمانان بە درێژایی ژیانیان بۆ دەسەڵاتداران بوون لەدوای مردن ڕۆڵی ئاین دێت.

لەلایەکی ترەوە لە کاتی بەیەکگەیشتنی کلتور و ڕۆشەنبیری نێوان هەر دوو شارستانیەتی ڕۆژئاوایی و ئیسلامی هەروەك نەریت وایە دەبێتە هۆی کارلێککردنی هەر دوو کلتورەکە، لە سەرەتادا ڕۆژئاوا سودمەندی یەکەم بوو[٢]، ئەمەش شتێکی سروشتیە بۆ ڕۆژئاوا، لە مانا و ناوەڕۆکی عەلمانیەت ناگۆڕێ (کە ئاین ڕەتناکاتەوە و وەك تاکە سەرچاوەش وەرناگرێ)، بەڵام پێچەوانەی ڕاستە، واتا ئەم شێوازە بۆ ئیسلام کارێکی ئاسایی نییە، هەر دەستکارییەك لە بەرنامە و پرۆگرامی ئیسلامی بکرێ بە زیادکراو هەژمار دەکرێت، چونکە شەریعەتی ئیسلامی هاوبەش قبوڵ ناکات، ئەمەش مانای ئەوە نییە کە کۆمەڵگەی ئیسلامی بونیاتی مەعریفی و شارستانیەکەی داخراوە،

---

[١] بۆ زیاتر بڕوانەپاشکۆی کتێبی (ئیسلام وسیاسەت- ئارام قادر)تیایدا ئەو لیستە دوورو درێژەی ئەو کتابە سیاسیانەی لەلایەن زانایانی ئیسلامی نووسراوەتەوەو بلاّو نەکرایتەوە .

(٢) سەرچاوەکانی ئەوان جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە یەکەم مەشخەڵ کە ئەوڕوپای ڕۆشنکردەوە پەرتوکەکانی ئیبن ڕوشد بوو.

بەڵکو دەروازەکانی زانست کراوەن تا ئەوەی بەرنامەی ئیسلام دەستی لێنەدرێ[(١)]، بە تایبەت لە ماوەی لاوازی مەعریفی کە جیاکاری لەنێوان ئەوەی زانستی و ئەوەی بەرنامەییە نەدەکرا، هەروەك لە کۆتاییەکانی لاوازی خەلافەت و باڵادەستی ئەوروپی، بەم شێوەیەش ئاسانە ڕێزی هەر یەکێك لەمانە بگرن: ئیبن ڕوشد، ئیبن خەلدون، غەزالی و زۆرێکی تر ... لەلایەن ڕۆژئاواوە ئەمەش لەبەر ئەو خزمەتەی کە پێشکەشی مرۆڤایەتیان کردووە و ڕیزبەندکردنی بە عەلمانیەت وەك ڕێزێك، بەڵام باڵادەستی فەلسەفەی یۆنانی بەسەر کلتور و ڕۆشەنبیری ئیسلامی واتا شەریعەتی ئیسلامی کەموکوڕی تێدایە و پێویستی بە ڕێکخستن و تەواوکردنە .. ئەمە بە دەقی ئایەت ڕەتکراوەیە، وەك ئەوەی خوای گەورە دەفەرموێ: (( أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ أُوتُوا نَصِيبًا مِنَ الْكِتَابِ يُدْعَوْنَ إِلَى كِتَابِ اللَّهِ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ يَتَوَلَّى فَرِيقٌ مِنْهُمْ وَهُمْ مُعْرِضُونَ ) آل عمران ﴿٢٣﴾، واتە: (ئایا نابینی ئەو کەسانەی بەشێك لە ئاسمانیان پێدراوە کاتێك بانگ دەکرێن بۆ لای کتێبی خوا (تەورات) تا فەرمانڕەوایی بکات لە نێوانیاندا، پاشان دەستەیەکیان پشت هەڵدەکەن و لە کاتێکدا ئەوان سەرپێچیکەرن)، لەگەڵ ئەوەش فەلسەفەی یۆنانی و ئەزمونی ڕۆژئاوایی هەر لە سەردەمی عەباسیەکانەوە لە دەرگاکانی کلتور و ڕۆشەنبیریەتی ئیسلامیان داوە بە شێوەیەکی فراوان، .. هەتاکو لە (پەیامەکانی ئیخوانی سەفا) [(٢)] دەبینین دروشمیان ئەمە بوو کە دەیانوت: (کەی فەلسەفەی یۆنانی و شەریعەتی ئیسلامی لەگەڵ یەك ڕێکخران ئەوکات دەگاتە پلەی کامڵ بوون)، بەو

---

(١) في سبيل توضيح ذلك انظر الى فرق بين المذهب والعلم:— محمد باقر صدر في كتابه (إقتصادنا..)

(٢) پەنجاو یەك پەیامی هەڵگرتبوو، سەنتەریان بەسرە بوو، سەرسام بوون بە هزرە یۆنانیەکان بە تایبەت فیساگۆرس زۆر گرنگیان بە ماتماتیك دەدا، بەڵام پەیامی ئیخوان سەفا لە فەلسەفە لەمانە پێکهاتبوو: (ماتماتیك، لۆژیك، سروشت، دەروونناسی، ئەخلاق، ..) بڕوانە: المصدرالسابق ص٣٣. ومنجد اللغة والإعلام — ص٢٨إعلام.

بەڵگەیەی شەریعەت لاوازی و نەزانی تێکەوتووە بە فەلسەفە نەبێت پاك نابێتەوە[١]، بۆ موعتەزیلەکانیش بە هەمان شێوە بوو، زۆری تریش. کارەکە تەنها لەسەر تەوژمە هزریەکان کورت نەکراوەتەوە، بەڵکو بە تەوژمە کۆمەڵایەتی و مەزهەبیەکان گەیشت، وەك دروزەکان[٢]، یاخود سۆفیەکان[٣] و جیا لەمانەش، پشتبەستنی فراوانی جیهانی ئیسلامی بە ئەزموونە ڕۆژئاواییەکان لە لایەنەکانی تری زانستی و تەکنیکی و سیاسی بەردەوام بوو ... بەتایبەت لە ماوەی خەلافەت (پیاوە پیرەکە)، بەڕۆژئاواییکردن بووە دەرمانی هەموو دەردێکی خەلافەت ..

ناوەخۆیی: دیاردەی هاوشێوەی ئەو ڕووداوانەی کە لە نێوان عەلمانیەت و لاهوتی لە ئەوڕوپا ڕوویدا لە جیهانی ئیسلامیش ڕوویاندا، بۆ نمونە لە ساڵی ١٧٣٧ز ڕێکەوتنێك لە نێوان زانای ئاینی موحەمەدی کوڕی عەبدولوەهاب لەگەڵ حەمەدی کوڕی سعود کرا لەسەر ئەوەی کە موحەمەدی کوڕی عەبدولوەهاب پێشەوای ئاینی بگرێتە ئەستۆ و بن سعودیش سەرۆکایەتی دەوڵەت[٤]، بە شێوەیەکی فەرمی ڕێکەوتنەکە هەر بەردەوام بوو پاش ئەوەی لە ساڵی **١٩٢٩**ز لەلایەن سعودیەوە هەڵوەشێندرایەوە[٥]، ئەمەش یەکەم دانپێدانانی خۆڕایی بوو بە حوکمی عەلمانیەت و دانینا بە جیاکردنەوەی: ئاین لە سیاسەتی دەوڵەت، زانایان لە دەسەڵاتداران ...، دەوڵەتی سعودیەی لەسەر

---

(١) موسوعة الأديان في العالم–ج: الفرق الإسلامية .. المصدرالسابق ص٧٨

(٢) انظر الموسوعة الأديان .. المصدر نفسه، ج: دروز الموحدون ص ٧٤–٧٦.

(٣) د.صالح العابد –حركة الأستقلال العربي، رسالة الماجستر –جامعة المستنصرية، بغداد١٩٨٨ ص١٢–١٣(هذه الأتفاقية مشهورة بتحالف الوهابى السعودى)

(٤) د أحمد طحان –حتمية التغير فى الشرق الأوسط –دار المعرفة–بيرووت ،ط١ ٢٠٠٦م ص٣٨٥

(٥) د.صالح .. الحركة الأسقلال العربية .. المصدرالسابق ص ٢٨ – ٢٩.

ئەم بناغەیە دامەزراند، کردنەوەی دەرگا داخراوەکان لە دوای ئەمە بۆ بانگەشەی مەترسیدار لەلایەن هەندێ زانای ئاینی کراوە، بۆ نمونە لە میانەی شیکردنەوەی _ هۆکارەکانی دارووخانی موسڵمانان _ کە (عەبدولرەحمان کەواکیی) پێشکەشی کرد کە تێیدا (٨٦) هۆکاری تۆمار کرد[١] لە کۆتاییدا بە راشکاوی دانینا بەوەی شەریعەت بۆ هەموو کات و شوێنێك و رەگەزە جیاوازەکان شیاو نییە، لە پەرتوکەکەی (أم القرى) عەرەبچێتی بە ئیسلامەوە بەستۆتەوە .. لە هەندێ جار زیادەرەوی کردووە و دەڵێت: عەرەب شیاوترین نەتەوەن بۆ ئەوەی ببنە پێشەنگ[٢]، بانگەشەی بۆ پەیرەوی عەلمانیەت دەکرد بۆ بەرێوەبردنی دەوڵەت[٣]، موحەمەد عەبدە دەڵێت: ((لە ئیسلام دەسەڵاتی ئاینی نییە تەنها دەستەڵاتی ئامۆژگاریکردنی چاك نەبێت بۆ بانگەوازکردن بۆ چاکە و دورکەوتنەوە لە خەراپە)) [٤]، ئەم تێروانینە زۆر نزیکن لە تێروانینی هەر یەکە لە (سپۆنزا) و فۆڵتێر) و جیا لەمانەش لەوانە شۆرشیان دژی ئاین کرد لە ئەوروپا، لەم بارەیەوە شبلی عسمی دەڵێت: ((بزوتنەوەی چاکسازی ئاینی لە سەدەی ١٩ کە پیاوە ئاینە ئازادەکان پێشەواییتان دەکرد دژی ئەو شێخ و زانایانەی کە پاڵپشتی دەسەڵاتی ستەمکاری عوسمانیان دەکرد وەك ئەفغانی و کەواکیی و موحەمەد عەبدە، بۆ بڵاوبونەوەی رەوتە سیاسیە هاوچەرخەکان لە دایك بوو وەك سۆشیالیستی و دیموکراسی و عەلمانیەت)) [٥]، زۆر جار هەمان دروشمیان بەرزدەکردەوە لە

(١) وەك بنچینە هاوشێوەی بانگەشەی فاشیزم و نازی و تورانیە .. پاشان هەندێك حزبی نەتەوەیی عەرەبی وەك (حزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکیە).

(٢) شبلي عيسمى – العلمانية.. المصدرالسابق. ص٣٨

(٣) المصدر نفسه. ص٢٨

(٤) المصدر نفسه. ص٣٤ .

(٥) المصدر نفسه ص٣٩..

کاتی کودەتا کردن دژی ئاین و وەرچەرخانی بۆ عەلمانیەت لە ئەوروپا، بۆ نمونە کاتێك سەعد زەغلول دروشمی (هیلال خاچی لە باوەش گرت) بەرزکردەوە ئەم دروشمەشی لەگەڵ دەوەتەوە (ئاین بۆ خوا و نیشتمانیش بۆ هەموان) [١]، وتەیەکیش هەیە دەدرێتە پاڵ موحەمەد عەبدە، تێیدا هاتووە: (ئەگەر عەقڵ و نەقڵ تێکگیران ئەوا ئەوە وەردەگرین کە لەگەڵ عەقڵ دەگونجێ) [٢]، ئەمانەش نزیکن لە بۆچوونەکانی: هوئایتهد[٣]، ئەبوو عەلای مەعەری[٤]، ئیخوان سەفا، ئیبن روشدی گونجاندن خاوەنی وتەی ((هیچ تێکگیرانێك لە نێوان بیروباوەڕی ئاینی و عەقڵ دا نییە، بەڵام لەسەرمانە ئاین بەگوێرەی داخوازیەکانی عەقڵ لێکبدەینەوە))[٥]، لە کۆتاییدا شێخ عەلی عەبدولڕەزاق شێخی ئەزهەر پەرتوکێکی بەناوی (ئیسلام و سیستەمی حوکم) دەرکرد تێیدا ڕەتیکردەوە کە لە ئیسلام دەوڵەت بوونی هەبێت، لەبەر ئەوە هەندێ نووسەر دوو دڵ نەبووینە لەوەی ئەمانە بە ماسۆنی هەژمار بکەن[٦].

---

(١) المصدر نفسه ص١٠٥.

(٢) ئەوەی دەڵێت ئەگەر عەقڵ و ئاین تێکگیران با زانست قسە بکات و ئاین بێدەنگ بێت..

(٣) پیچشتر لێمان وەرگرتوون..

(٤) ( شبلي عيسمى) المصدر نفسه ص ١٠٥ . جاء في موسوعة الأديان العالم: ج الدروز الموحدون ص ٤٠-٤١.ڕەگ و ریشەی بابەتی عەقڵی زیادەڕەوە لە چیرۆکەی خوارەوە هاتووە: هاتووە کە خوا لەسەر شێوەی (العلى الأعلى) دەرکەوتووە ... بە عەقڵی وتووە: هیچ کەسێك ناچێتە بەهەشتی منە _ مەبەست لێی ئاینی دروستە _ تەنها ئەوەی پەیمانی لەگەڵ تۆ و خۆشەویستی تۆ نەبێت ئەوەی گوێڕایەڵی تۆ بکات گوێڕایەڵی منی کردووە، ئەوەی سەرپێچی تۆ بکات سەرپێچی من دەکات).

(٥) انظر: الموسوعة الميسرة .. المصدرالسابق ص١٤٧

(٦) الموسوعة العربية .. المصدرالسابق. ج٦ص٣٦١ هەروەها ئەم جۆرە ململانێیە ڕوویدا، لە ساڵی ١٨٣١ز کونسوڵی بەریتانی هەوڵی لەگەڵ والی بەغداد دا بۆ ئەوەی ڕێوشوێنی پێویست بگرێتە بەر بۆ خۆپارێزی لە نەخۆسی تاعون، بەڵام پیاوانی ئاینی ڕێگریان لێکرد بەوەی ئەمە پێچەوانەی حوکمەکانی قورئانە بە پاساوی: ڕزگاربوون لە قەدەری خوا نییە، زۆر نمونەی تریش هەیە، لەوانە نکۆڵی کردن لە پەیوەندی نێوان باران و هەڵم،

دیاردەی هاوشێوەی ئەوەی لە ئەورِوپا رِوویاندا لە نێوان ئاین و نوێگەری لە ناوچەی ئەستانبۆڵ رِوویاندا، بۆ نمونە چاپخانە ئامرازێکی پێویستە، بەڵام فەتوا درا کە ئەم ئامرازە حەرِامە[١]، چونکە ئەم ئامرازە بۆ یەکەم جار لەلایەن مەسیحیەکانەوە لە لوبنان هات ساڵی (١٧٣٢ز)[٢]، بەم شێوە پیاوانی ئاینی لەبەردەم زۆرێك لە پرۆژە نوێیەکان وەستان، لە کۆتاییدا هەموو کات نمونەکەی وەك نمونەی ئەورِوپایە کە سەرکەوتن بۆ دەستکەوتە زانستیەکانە و پاشەکشە بۆ فەتوای ئاینیەکانە، بۆ بەرجەستەکردنی حوکمی هوایتد، ئەمە بووە هۆی دواکەوتن و دورکەوتنەوە لە واقیع، دواتر ئەفەندیەکان (یاخود عەلمانیەتی نویٚ) لە جیهانی ئیسلامی بوێری ئەوەی پەیداکرد کە ئاین و پیاوانی ئاینی وەك لەمپەر و رِێگر دابنیٚ لەبەردەم پێشکەوتن و نوێگەری[٣] ، هەرلە سەردەمی خەلافەتی عوسمانیش بەرەبەرە ئەزموونەکانی دوای (ویستڤالیا-١٦٤٨) وشۆرِشی فەرِەنسا١٧٨٩ هاتە نێو خەلافەت لە رێکخستنی سوپا و ئیدارە و دەستوور و.. ،تا کۆتای سەدەی ١٩ بارودۆخ زۆر گۆرِا، چەندین نووسەر و فەرهەنگ نووس و رِێبازی عەلمانی لەگەڵ بزوتنەوەی مەشروتیەت (دەستوری) لە نێو عوسمانی دروست بوو ،

بەم شێوەیە بانگەوازی نوێگەری و گۆرِانکاری لە دڵی خەلافەتەوە هات و بووە

---

پەرتوکێك لەلایەن پیاوانی ئاینیەوە دەچوو بە ناونیشانی: –السیف البتار علی رقاب کل من یقول المطر من البخار– المصدر:د.علی الوردی –طبیعة .. المصدرالسابق ص٣٠٥ .

(١) موفق بنی مرجة –الصحوة .. المصدرالسابق ص١٩٥

(٢) نوێگەری: modernism: لە بنچیینەدا لەگەڵ شۆرِشی فەرِەنسی دەرکەوت، دواتر پەیوەست بوو بە پێشکەوتنەکانی دەوڵەتی سەرمایەداری، چینی بورجوازی، رەوتی تاکگەرایی و رۆشەنگەری تر پێچەوانەی لاساییکردنەوە و پارێزکاری، نوێگەری لە ئەوروپا بە نوێگەری دووەم دادەنرێت، پێیانوایە نوێگەر یەکەم لە یۆنانی کۆن سەریهەڵدا، کە لە نوێسازی فراوان ترە، بەڵام ئەوانەی کە رەخنە لە نوێگەری دەگرن پێیان دەوترێت (دوای نوێگەری _ post modern) کە لە نزیك ساڵی ١٩٧٠ز سەریهەڵدا بروانە: الموسوعة العربیة .. ج ٨ ص ٨٢ وکذلك.

(٣) الموسوعة العربیة .. المصدرالسابق ج٦ص٣٦١.

بزوتنەوەیەکی جەماوەری و سیاسی و دواتر ئایدۆلۆژی بەناوی (عوسمانیەتی لاو _ تورکیای لاو _ جوان تورك) وەك لاساییکردنەوەی بەریتانیای لاو و ئەڵمانیای لاو و ئیتاڵیای لاو، دیارترین کەسایەتیان (نامق کەمال پاشا _ مدحت پاشا) زۆر جار ناوی تریان دەوت وەك سوڵتان موراد، مێژووی دامەزراندنی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٨٦٤ یاخود ١٨٦٥ز [١] لە هەندێ سەرچاوەی تر دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٨٦٠ یاخود ١٨٥٩ز، لە سەرەتادا بزوتنەوە چاکسازییەکە لەناو نەگۆڕەکانی عوسمانیەت دابوو، هەموو ئەوانەی دەگرتەوە کە چاکسازیان دەویست، لەساڵی ١٨٧٦ عوسمانیەی لاو دروست بوو، هەر زوو گۆڕا بۆ کۆمەڵەی نەتەوەیی تورکی بەناوی (ئیتیحاد و تەرەقی) لەسەر دەستی هەر یەکە لە: (ئیبڕاهیم تیمۆ، موحەمەد ڕەشید جەرکیس، د. عەبدوڵا جەودەت، د. ئیسحاق سکوتلی) لە ساڵی ١٨٨٩ز بەبۆنەی یادی ١٠٠ساڵەی شۆڕشی فرنسا جاڕدرا، ڕەگ و ڕیشەی نەتەوەیی سیاسی تورکی (تۆرانی)[٢] دەگەڕێتەوە بۆ نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەم، نکین ئەلب (٥) بەرگی (توران)ی نووسی وەك تیۆری نەتەوەی تورك لە جیاتی شەریعەت، چەندین ناوەند و سەنتەر و حیزبی تری عەلمانی لە سەرانسەری سنووری خەلافەت دروست بوو، چەندین ڕەوشەنبیری عەلمانیش لە تورکەکان وەك نەوەی یەکەمی عەلمانی هەژمار دەکرێن لەوانە: مدحت پاشا، نامق پاشا، تکیلن ئەلب، زیا ئەلب کۆك، أنور پاشا، .. یەکەم کۆنگرەی (ئیتحاد و تەرەقی) لە ساڵی ١٩٠٧ز لە پاریس بەسترا (ئەحمەد ڕەزا بەگ) وەك سەرۆك هەڵبژێردرا، چالاکیەکانیان فراوان بوو تا ئەوەی

(١) ینظر: أورخان محمد علی –السلطان عبد الحمید الثانی –ط١\١٩٨٧م، دار مکتبة الأنبار–العراق، الرمادی ص٢٧٠–٣٠٠

(٢) ئەو بۆچوونە هەیە کە ڕەچەڵەکی تورکەکان دەگەڕێتەوە بۆ تۆرانیەکان، شوێنێکە دەکەوێتە ناوەڕاستی ئاسیا و ڕۆژئاوای چین، ناوی تورکی لە تۆکیۆی چینیەوە هاتووە کە ناوی تیرەی ستبسە هەروەك لە (دائرة معارف الإسلامیة)دا هاتوە..

کودەتایان کرد و مەشرٍوتیەتی دووەمیان سەپاند لە سالّی ١٣/ ٧/ ١٩٠٨، پاش سالێك سولّتان عەبدولحەمیدیان لاداو دووریانخستەوە بۆ سەلانیك، دواتر سیيانەی ناسراو (ئەنوەر، تەلعەت، جەمال) دەرکەوتن لە حوکمڕانی عوسمانی نویێ[1]، چەمکی نەتەوەیی تورکی لەجیاتی گەلی عوسمانی بەکارهات، مێژوویان دووبارە لەسەر بناغەی نەتەوەی تورکی لە جیاتی ئیسلامی دارٍشتەوە، ئەوەیان نیشاندا کە تەیمورلەنگ و هۆلاکۆ و جەنگیزخان خەراپ نەبوون وەك ئەوەی لە فەرهەنگی عوسمانیەکان دا هاتووە .. بەلّکو پالّەوان بوون لە فەرهەنگی تۆرانیەکان ...ئاڕستەی کۆمەلّەی ئیتحاد و تەرٍەقی گۆرٍا بۆ بزوتنەوەیەکی تۆرانی لە سالّی ١٩١٣ز بەناوی ( ینی تۆران[2] _ واتە تۆرانی نویێ)، دەستیان کرد بە جێبەجێکردنی ئەزمونە ئەورٍوپیەکان بە سەرسامی لە دەستور و فرە حزبی و نامەرکەزی ...، دەرەنجامی ئەو سەرسامیەش چوونە پالّ ئەلّمانیا بوو لە جەنگی جیهانی یەکەم وایان ئەزانی سەرکەوتوو ئەوە، ئەم سەرکێشیە بووە هۆی داگیرکردنی زۆربەی ناوچەکانی دەولّەتی عوسمانی لەنێوشیاندا ئەستەنبۆلّ تێیدا (مستەفا کەمال ئەتاتورك) دەرکەوت[3] یاخود بەگوێرەی هەندێ مێژوونووسان هەندێك وەك _ عەبدولقەدیر زەلووم[4] _ و بەنی مورجە[5] ... تاد ئەوا ئەتاتورك دەرخراو بەرزکرایەوە !! بۆ ئازادکردنی ناوچە تورکیەکان، یەکەم کۆماری عەلمانیەت لە سالّی

---

(١) ڕەوتی هەر یەکێك لەمانە بەم شێوەیە دەستنیشان دەکرێت: ئەنوەر بۆ ئیسلامی، تەلعەت بۆ عوسمانلی، جەمال بۆ تورکچێتی.

(٢) بنی مرجة.. الصحوة.. المصدرالسابق ص١٨٨.

(٣) موسوعة العربية... المصدرالسابق المادة: مستەفا کەمال، لە ڕەچەلّەك لە خێزانێکی ڕەبیسی یۆنانیە _ (ئەفسەرێکی لێهاتوو بوو، سەرکردایەتی بەریگریکردنی کرد لە ئەنادۆل، بووە یەکەم سەرۆك کۆمای تورکیای نویێ (عەلمانی) نازناوی غازی بوو، دواتر مللی جییف و پاشان ئەتاتورك.

(٤) عبد القدير زلوم –كيف هدم الخلافة –دارالأمة للطباعة للنشر والتوزيع\١٩٦٢ ص٧٨.

(٥) بنی مرجة–صحوة رجل المريض .. المصدرالسابق ص٢٦٥.

١٩٢٣ز دروستکرا کە پایتەختەکەی ئەنقەرە بوو، لە ساڵی ٣/٣/ ١٩٢٤ خەلافەتی ئیسلامی بە یەکجاری هەڵوەشێندرایەوە بەگوێرەی بنەمای (١٢) لە بنەماکانی ویلسۆن هەروەها بەپێی مەرجەکانی لۆزان، بەم شێوەیە بووە یەکەم دەوڵەتی عەلمانی لە جیهانی ئیسلامی[1]، دواتر عەلمانیەت لە زۆربەی دەوڵەتە عەرەبی و ئیسلامیەکان بڵاوبووەوە هەر لە ئەندونیسیاوە تا دەگاتە مەغریب بەم شێوەیەی خوارەوە:

_ لەولاترەوە دووەم دەوڵەتی ئیسلامی پاش دەوڵەتی عوسمانی کە ئێران بوو، هێدی هێدی عەلمانیەتی دزەی دەکردە ناوی یەکەم لە ڕێگەی چاکسازیەکانی سوپا کە پاش شکستەکانی لەگەڵ ڕووسیا ناچار بوو، هەریەکە لە قەوقاز و قیرغیزیا و ئەرمینیا لە کۆتایی ساڵی ١٨١٣ز[2] لە دەستدا.

_ لەگەڵ ڕووداوەکان لە نیمچە زەریای هیندی ڕەشەبای گۆڕانکای هەڵیکرد، لە هیند پاش کوژرانی سوڵتان بیتۆی موسڵمان لە کاتی بەرگری لە ٤/ مایۆ/ ١٧٩٩[3] داگیرکردنی لەلایەن بەریتانیاوە عەلمانیەت دەستی بە جولە کرد، لە ئەفغانستان لە سەردەمی حەبیبوڵا خان (١٩٠١ _ ١٩١٩) گۆڕانکای و عەلمانیەت دەستی بە جولە کرد، ئەم گۆڕانکاییە (بە عەلمانیکردن) بۆ سەردەمی نادر خان و زاهیر شا درێژبووەوە، زاهیر شا لە کۆنگرەی نەتەوەیی حیجابی ئافرەتی خستە بەرپێی خۆی و ڕایگەیاند کە تاریکی کۆتایی هات[4].

---

(١) لە ڕاستیدا سعودیە یەکەم بوو، بەڵام پێکهێنانی فەرمی دەوڵەتی سعودیە درەنگ کەوت، لەبەر ئەوە تورکیا بووە یەکەم.

(٢) – د.عدنان –المسلمون .. .. المصدرالسابق ص١٢٥.

(٣) المصدر نفسه.. ص ١٢٧.

(٤) المصدر نفسه..ص ١٢٦.

_ عەلمانیەت بە هەر شێوێنێك دەگەیشت کە داگیرکەری پێگەیشتبا، لە میسر لە ساڵی ١٨٨٣ز، لە هیند پاش ساڵی ١٧٩١، لە جەزائیر ١٨٣٠، تونس لە ساڵی ١٩٠٦، مەغریب لە ساڵی ١٩١٣ز، عێراق و شام پاش جەنگی جیهانی یەکەم، لە هەریەکە لە ئەفریقیا و باشوری ئاسیا کارە بە هەمان شێوە بوو[١]، یاسا دەستکردەکانی ڕۆژئاوایان وەردەگرت، لە سوریا هەموو یاسای مەدەنی مسریان پێکەوە وەرگرت[٢]، ڕیزبەندی یاسایی بەم شێوەیە بوو: یاسای دەستکرد و دواتر نەریت دواتر فقهی ئیسلامی و پاشان ڕێسا و دادگەری .. شەریعەت بووە سەرچاوەیەکە یەدەگ بۆ یاسا[٣]، بەم شێوەیە دەوڵەتە عەرەبیە نوێکان لەسەر بناغەی عەلمانی دروست بوون، بە دەستوری عەلمانی هاوشێوەی دەستوری فەرەنسی ساڵی ١٩٥٨ز لە پێکهاتە دا، لە مادەی (٢)دا هاتووە: ( فەرەنسا کۆمارێکە بەش بەش ناکرێت، وڵاتێکی عەلمانی دیموکراسی و کۆمەڵایەتیە یەکسانی بەرامبەر یاسا بۆ هەموو هاوڵاتیان فەراهەم دەکات بەبێ جیاوازی بەهۆکاری ڕەچەڵەك و ڕەگەز یاخود ئاین ...)[٤]، تا ڕادەیەکی زۆر هاوشێوەی دەستورە عەرەبیەکانە بە هەڵاوێردنی وشەی عەلمانیەت نەبێت، لە دەوڵەتە عەرەبیەکان ناوەڕۆکی عەلمانیەتیان وەرگرتووە بەبێ ئاماژەدان پێی، شەرعناسی یاسایی (بە فەرەنسی کراو) عەبدولڕەزاق سەنهوری مسری ڕۆڵێکی گرنگی گێڕا لە بەهێزکردنی عەلمانیەت لە میانەی پێکهاتەی دەستورەکان و بەندەکانی.

---

(١) الموسوعة الميسرة في الأديان والمذاهب المعاصرة .. المصدرالسابق ج١ ص ٣٦٩ — ٣٧٠.
(٢) محد مهدي شمس الدين — العلمانية .. المصدرالسابق ص ٩٤.
(٣) المصدر نفسه... ص ٩٤.
(٤) ينظر: نص دستور الفرنسي الصادر عام ١٩٥٨.

ئەم پرۆسەیە لە جیهانی ئیسلامی خالّی نەبوو لە تەبشیر، بۆ نمونە لە ئەندەنوسیا بەگوێرەی بنەمای عەلمانیەت (بانتشاسیلا _ یاخود پێنج بنەما بەدواییەك هاتووەکان) کە سالّی ١٩٤٥ز سەربەخۆیی ڕاگەیاند پێش سۆکارنۆ ئەمە بووە هۆی ئەوەی ٢٠ ملیۆن موسلّمان واز لە ئاینی خۆیان بێنن و ببنە مەسیحی کاسۆلیکی[١]، ئەمەش مانای وایە جیهانی ئیسلامی پاش ئەوەی بناغەی ئاینیان لەدەست دا ئەو کات کرۆکی بیروباوەڕ و شارستانیەت و کلتور و ڕۆشەنبیریەت لەدەست دەدەن ... دواتر دەبێتە شوێنکەوتە و لاساییکەرەوە و دواکەوتوو، هێرشی کلتور و ڕۆشەنبیریەتی ڕۆژئاوایی هەموو ژیانی ڕۆژانەی موسلّمانی گرتەوە، بەپێی داخوازی ژیانی تاکەکەسی موسلّمانان لە جلوبەرگ و کارکردن و پشوو (هەندێکیان ڕۆژی پشوویان کردە ڕۆژی یەکشەممە، پیتە ئیسلامیەکانیان کردە پیتە لاتینیەکان وەك تورکیا) [٢] گۆڕانکاری بەسەردا هات، پێوەر و پێودانگ و مێژوو گۆڕان ... تاد.

(١) الموسوعة الميسرة في الأديان والمذاهب والأحزاب المعاصرة –اشراف:د.نافع بن حماد الجهني – ط٤، دار الندوة العالمية للطباعة والنشروالتوزيع .... ص٤٦٧ (هذه الموسوعة تختلف عن الموسوعة الميسرة ..السابقة، بأضافة كلمة–الأحزاب–للتنويه).

(٢) د. عەبدولّا جەودەت بۆ یەکەم جار بە نووسینەکانی خۆی پیتی لاتینی بەکارهێنا، کە یەکێك بوو لە دامەزرێنەرانی ئیتحاد و تەرەقی، بە ڕەچەڵەك کوردە،·المصدر: مالميسانز... المصدر السابق ص٤ .

## نەوەکانی یەکەمی عەلمانی لە جیهانی ئیسلامی

ناتوانین هەمو جیهانی ئیسلامی بەسەردێر باس بکەین ،جگە لە باسێکی گشتی نەوەکانی یەکەمی عەلمانی تورکی وعەرەبی وکوردی بە ووردتر باس دەکەین ، بۆ کورد کەمێك بەدرێژ تر .

### نەوەی یەکەمی تورکی

سەربردەی سەرهەلدانی عەلمانیەت ونەوەی یەکەمیان بە درێژی لەسەروو باس کرا ، لە ڕاستیدا ئەوە باسی نەوەی یەکەمی عەلمانی لە دەولەتی عوسمانیە نەك نەوەی تورکی ،بەمانای سەربردەیەکە بۆ نەوەی یەکەمی تورکی وعەرەبی وکوردیش ، دەمێنێ زۆر بە کورتی ناوەکانیان تۆماربکەین ، بەلام دوای سۆراغکردنێکی سەرەتایی دەردەکەوێ ئەوانەی لەسەر نەوەی یەکەمی عەلمانی تورك هەژمار دەکرێن زۆربەی غەیرە تورکن ، وادیارە ڕەگەزی تورك بەو ئەندازە پێشکەووتوو نەبووینە زیاترر بە بارودۆخی کۆمەلایەتی عەرەب چووینە، ، لەنێو دام و دەزگای عوسمانی ڕەگەزی تورك جێی شانازی نەبوو، جار وایە مانای تورك گوزارش بوە لە گێلایەتی و بێ ئیدراکی (بڕوانە: محاچرات فی نشوو القو میە ـ ساگع العصری، هەروەها دراسات فی الحرکە الکوردیە المعاصرە – د.عپمان علی) یاقوت حموی لە(معجم البلدان ج١–اقلیم السبع) دەلێت تورك وەك دڕندە بوە بە(وحش الجبال )وەسفیان دەکا،کلیمنسۆری سەرۆکی فرنسا لەکۆنگرەی ئاشتی باسی لەوە کرد کەتورك (نقص الکفاوە)ی هەیە ناتوانێ میللەتی تری لەژێردەست دابێ، ئەوە بوە بنچینەی یاسایی ڕێکەوتنی سیڤەر بەتایبەتی مادەی(١٣٢)ی ئەو ڕێکەوتنە ،لە ڕاپۆرتی ویلایەتی موسلێش باس لە ڕەچەلەکی تورك دەکا بە کرێگرتەی عەباسیەکان وئیتر ئەوەی هاتوە وەك جەرمانەکان بەکرێی گرتون، دەلێت: بۆیە لە نێو عوسمانی کە ناوی تورك دەهات وەك گەمژەو غەشیم سەیر دەکرا تا ١٩٠٠لەسەر دەستی

(بزوتنەوەی عموم الترك[*] ) بونە جێی شانازی[١]، بۆیە کەمتر تورك لە پایەی دەوڵەتی عوسمانی بو زیاتر سەربازو فەرمانبەری سادە بووە ،گومتر ڕەوشەنبیرو لائیکی و ئیکولاری لێدروست بوە ،ئەوەی دروستیش بوە زیاتر لەدەرەوەی وولات وەری گرتوە ،یان هەر لە بنەچەدا تورك نەبووینە ،لە نێو ئەو ناوانەی خوارەوە (کە لەهەمان کات بەنەوەی یەکەمی عەلمانیش هەژمار دەکرێن) بەشێی زۆریان تورك نین (نامق کمال پاشا ،ئایەتولا بەك ، ئەحمەد ڕەزا، محمد رشید چەرکەس، ئیبراهیم تەمۆ ،د.عبداللە جووت، د.ئیسحاق سکوتلی، زیا ئەلب کۆك، حسین جاهد، چاوید بەگ، عصمت ئینینۆ، ئەنوەر پاشا، گلعت پاشا، جمال پاشا، تکینی ئەلب، زیا ئەلب کۆك، ...)، تەنانەت بەشێکی گرنگی دامەزرێنەری بیری تورکایەتی تۆرانی کورد بووینە، (٢)لە (٤)دامەزرێنەرەکەی (اتحاد الترقی) کورد بوینە[٢]. د.عبداللە جووت، د.ئیسحاق سکوتلی، دوەکەی تریش (محمد رشید چەرکەس، ئیبراهیم تەمۆ)یەکەمیان چەرکەسی بوە دوەمیان ئەرنائووتی ، زیا ئەلب کۆك، عصمت ئینینۆ...زۆری تریش کوردبووینە، بە پێی هەندێك سەرچاوە ئەوەی بناغەی پەیوەندی نێوان ئەلمانیاو عوسمانی ڕێکخست ولەدوایدا پێکەوە کەوتنە بەرەیەکی جەنگ شریف پاشای کورد بوە، ئەوەی پیتی لاتینی هێنا ناو عوسمانی هەر کورد بوو (د.عبداللە جودت) بوو- لە ڕاستیدا ئەو پیاوە مونەزیری تورکیای نوێ بوە نەك مستەفا کمال،مدحت باشا لەوانە:مصگفی کمال – کە لە بنەچەدا سەر بە خێزانێکی یۆنانی ناوچەی ڕیسە ، حسین جاهد، چاوید بەگ، ... لەبەنەچەدا زۆربەی سەرانی ئەو بزووتنەوە وەك : ئەنوەر پاشا، گلعت پاشا، جمال پاشا، تکینی ئەلب، زیا ئەلب کۆك، .. ڕەچەڵەك و ڕەوتیان لێڵ بوو، تورك نەبوون، ...

[*] عموم الترك نەبوە ڕەنگە لەگەل ئیتحادوالترقی بێت .

[١]ـ تقریر ولایة الموصل١٢٧، ص١٢٩، ص١٣٢

[٢]ـ دامەزرینەرەکان بریتی بوون لە:دعبالله جودت لە عربگیر لەدایك بوە، ئیسحاق سکوتلی لە دیاربەکر، ئیبراهیم تەمۆ- ئەرنائوتی، محمدرشید چەرکەسی.

## نەوەی یەکەمی عربی

لە ناو عەرەبیش نەوەی یەکەمی عەلمانیەت بریتین لە:(نجیب عازوری، احمد لطفي سيد، ساطح الحصری،جۆرج ئونتۆنیۆس ،اسماعيل مظهر، قاسم أمين، طه حسين، محمد عزة دروزە، سەلامە موسی، انطوان سعادە، میشیل عفلق،علی عبدالرزاق، بطرس بستانی، شبلی شمیل، فرج أنطوان، میشێل عفلق، ، بنەماڵەی بستانی، سلیم یازچی ، ناسیف یازجی.. ) ئەوانەی لەسەر تەوەری عروبی ئیشیان کرد بەشی هەرە زۆری مەسیحی بووینە لەوانە: محمد عزە دروزە، بنەماڵەی بستانی، سلیم یازچی، جۆرج ئونتۆنیۆس، نجیب عازوری، ناسیف یازجی، میشیل عفلق،شوبلی شمیل، سلامە موسی...لە هەموان ڕاشکاوە تر لەساڵی ١٩١٨ لەمیسر ڕاستەوخۆ حزب دروست بوو بەناوی (حزبی عەلمانی )دوای ناوی گۆڕا بۆ حزبی وەفد(ئیستاش ماوە) ، پیشووتر خدێوی ئیسماعیل لە ١٨٨٣ یاسای فەڕەنسی هێنا ناو میسر، هەندێ وڵاتیش لەگەڵ داگیرکردنی لەلایەن ڕۆژئاوا عەلمانیەتیان هێنا جێی شەریعەت، لەوانە جەزائیر ١٨٣٠، عێراق و وڵاتی شامیش لەگەڵ دروستکردن و داگیرکردنی، تونس یاسای فەڕەنسی لە ١٩٠٦ پەیڕەوکرد. مەغریب لە ١٩١٣، نەوەی یەکەمی حزبەکانی عربی دروست بوون ،یەکەمیان الجمعیە السوریە لە ١٨٥٧ دروست بوو، دوای جمعیە العربیە لە ١٨٧٥، دوای ئەوانەی خوارەوەش دروست بون:

١ـ جمعیە العربیە، ١٨٧٥م لە دمشق وتەرابلس. ٢ـ جمعیە بیروت ـ ساڵی ١٨٨٠م.٣ـ جمعیە حقوق المرأە، ١٨٨٠م. ٤ـ جمعیەالسوریە الفتاە ـ ١٨٨٩، سەرۆکەکەی جمیل معلوف ٥ـ جمعیە الوطن العربی دامەزرێنەری خیرالله، ١٨٩٥م لەباریس.٦ـ جمعية رابطة (الوطن العربي)، نجيب عازوري دایمەزراند لە ١٩٠٤م لە باریس.٧ـ جمعية الشورى العثمانية، مصر ـ ١٩٠٧ ـ ١٩٠٨م.٨ـ جمعية الأخاء العثماني ـ ١٩٠٨م لة استانة.٩ـ جمعية القحطانية، خليل حمادة دایمەزراند

لە ١٩٠٩م١٠ـ جمعیه العربیه فتاة لەپاریس، ١٩١١م.١١ـ حزب اللامرکزیه، ١٩١٢مم.١٢ـ جمعیه بیروت الإصلاحیه، ١٩١٢م، لقەکانی چوە: دمشق، بیروت، حلب، بغداد، البصره، الموصل.١٣ـ حزب العهد، ١٩١٢م لە نێو ئەفسەرانی عراقییەکان.١٤ـ جمعیه العلم الّخچر، د.فائق شاکر ـ ١٩١٣م. ١٥ـ جمعیه العلم ـ ١٩١٤م[1].

## نەوەی یەکەمی عەلمانی کورد

کوردیش وەك باقی میلەتانی ناوچەکە لە کۆتایی سەدەی ١٩ بیری عەلمانی پێگەیشت ،لە سەرەتای سەدەی بیستەم ئەو بیرە بەرجەستە بوو لە هەندێ جم وجۆلی سیاسی وفکری وئیداری ویاسای تا گەیشتە دروست کردنی کۆمەڵەو دەستەو حزب ، هەروەك لەسەروو باس کرا بۆ هەر میلەتێك هۆکارو زەمینەی گشتی هەبوە بۆهاتنی عەلمانیەت لەهەمان کات هەندێ هۆکاری تایبەتیش هەبوە ،بۆ کوردستانیش هەمان شێوازی وەرگرتوە ، بەشەگشتیەکەی هاوبەش بوە لەگەل میلەتانی ناوچەکە لە تورك وعەرەب وفارس وئەوانی تر ،وا دەردەکەوێ یەکەم جار تورك پێشڕەو بوویێت یان عرب یان فارس ..ئاوا نیە ، زۆربەی پیشڕەوانی عەلمانی نێو دەولەتی عوسمانی تورك نەبووینە ،زۆربەی عەلمانی نێو عربیش مسیحی بووینە ، گۆتەی(تا ئەورووپا لە کۆت و زنجیری ئایین ڕزگاری نەبوو پێش نەکەوت، ئاواش ئێمەی جیهانی ئیسلامی تا لە ئایینەکەمان ڕزگار نەبین پێش ناکەوین ) زۆر باوی هەبوو، لەنێو تورك لەلایەن ئیتیحاد تەرەقی و کەمالی وتۆرانیەکان دەگۆترا سیستەمی ئیسلامی و

[1]ـ لەو سەرچاوانەی خوارەوە وەرگیراوە: أـ الموسوعة المیسرة.. ص٤٤٤-٤٤٥، ب- دراسات في الوطن العربي.... ص٦٠-٦٤. ج ـ الصحوةالرجل المریض.. ص٣١١ دـ الاسلام والعلمانیة... ص٨١

عوسمانی زیانی بەیەکرێزی جیهانی تورك هێنا و شكستیشی لەجەنگی جیهانی یەکەم (١٩١٤-١٩١٨) زیاتر توندی کردوون، بەتایبەتی دوای سەردانەکەی شای ئەلّمانیا (ڤلهالم دوەم) لە پیش جەنگ کە ئامۆژگاری کردبوون تورك گرنگی بە ئاسیای ناوەڕاست بدا کە هەمووی تورکن باشترە لەرۆژهەڵاتی ناوەڕاست.

لە نێوعەرەبیش دەڵێن عەرەب بوە قوربانی ئیسلام، ساتیع حصری دەڵێ عەرەبایەتی ڕەسەن ترە لە ئایین، لەکاتێکدا سێ ئایین گۆڕا بەڵام عەرەب هەر عەرەبە، مەلیك فەیسەڵیش لە وتارێکی وتبووی (ئێمە عەرەبین پێش محمد و عیسا و موسا)[1]، (ئیبراهیم احمد)ی شاعیر و بیریاری کوردیش بەهۆنراوە دەڵێ: ئێمە کوردین و هەرکورد دەبین،..پیشی ئەدیان هەر کورد بووینە... .لەبنەچەدا ئەو بۆچونە لای(فیختە) بۆ میللەتی مەزنی ئەلمانیا هاتوە،دەلێ ئیوەی ئاری پێش ئاینەکان پێشرەوی جیهانن[2] ،دەیەوێ بلێ ناسنامەی ئاریەتی لەسەرووی هەمو ناسنامەیەکی تری وەختیە ، یەهودو عەرەب وزۆر میلەتی تر هەریەکە بە جۆرێك پاگندەی ئەو بۆچوونەی فیختەی بۆ خۆی کرد، یەکەم جارلە رۆژهەلات (جمال الدین ئەفغانی) ووتویەتی(الامة العربیة هی عرب قبل کل دین ومذهب)٣.

هەردوو لای عەلمانی تورك و عەرەب پێیان وایە ئیسلام هۆکاری دواکەوتن و پارچەپارپەبونیانە ،لەهەموان خەست تر شبلی شمیل لەکتیبی(فلسفە النشوو والإرتقاو) بانگیشەی ئەوەی دەکرد کە (ئاین فاکتەری پەرتەوازەی ئومەی عربیە)،کەچی (دورکایم) پێیوایە ئاین کۆمەلگە یەکدەخا ، هەرچی ڕیشەی عەلمانیە

---

[1] العلمانیە والدولە الدینیە ص٣٩.

[2] جان ماري بيلت- عودةالوفاق بين الإنسان والطبيعة—ت:محمدعثمان ص٢٣٢ .

[3] د محمد عمارة-جمال الدین الافغانی اعمال کاملة ج١ص٨٣ .

لە کوردستان لەمێژوودا لە دوای ئیسلام سەریهەڵنەداوە، ئەو تومەتەی دەهری کەدراوەتە هەندێ زانای گەورەی کوردی وەك سیف الدین ئامدی ئەوا لەچوارچێوەی ململانێی نێوان فقهو فلسەفە بوە، شۆڕش و شەڕ لەگەڵ سوڵتانی ئایینی کراوە، بەڵام دەهری وئیلحادی لێ دروست نەبووە، باسێکی تریش ڕەنگە لە داهاتوەکی نزیك بێتە پێش وبڵێن ئەوەتا ڕیشەی عەلمانی لە کوردستان قووڵە وەك چۆن پاپاو مۆسۆلینی کردیان وعەرەبیش لە ڕێکەوتنی محمدی کوڕی ئالسعودو محمدی کوڕی عبدالوهاب لە ١٧٣٧ز دەستی پێکردوە بەهەمان شێوە ڕێکەوتنی وا لە نێوان مەرجەعی بالای کورد(ئیبن ئادەم )و (میری سۆران)کراوە(لەسەرەتای سەدەی نۆزدەهەم) کە هیچ لایەکیان دەست نەخەنە کاروباری لاکەی تر ،واتە ئاین وفتوا بۆ ئیبن ئادەم ودەسەلاتیش بۆ میری سۆران[1] ،ڕاستی وادەرنەچوو ، ئبین ئادەم کاری نادادگەری دەبینی نەیتوانێ ئۆقرە بگرێ بەو شێوەیە ئەو نیمچە ڕێکەوتنە تێك دەچێ و لێکجیادەبنەوە ، لەجیاتی خۆی مەلای خەتێ دەخاتە ئەو پۆستە ،واتە لێرە ئاین ودەسەلات لێکجیانەکراوە(کەلەزیانی ئاینیە) بەلکو ئایندارو دەسەلاتدار لێکجیابونەوە(لەقازانجی ئاینی)، بەپێچەوانەی عەلمانیەتی عربی وئەورووپی کە ئایین جیاکرایەوە لەزیانی ئاینی ، بۆیە ئەو عەلمانیەتەی نەوەی نوێی کوردی بۆ ئەو سەردەم ناگەڕێتەوە .

ئەگەر سەرنج بدەینە نەوەی یەکەمی ڕۆژنامەوانی کوردی هەر ئاینی و دوور لە عەلمانی بوە ،جگە لە گۆڤاری مەشروتیە(کە شریف پاشاسەرپەرشتی دەکرد )جارجاربەلای لائیگی وعەلمانی دەچوو ،سەرنج بدە لە بلاوکراوەی (مەشروتیەت) بە پێنووسی (شەریف پاشا)ی کورد لە (ژ:٤٠ی ساڵی ١٩٠٣) چۆن نووسیویەتی:

[1] ئەو بابەتە بەو شێوەیە باس نەکراوە بەلام لەلایەن مسعودمحمد کەمێك باسکراوە لە ص٥٢ (من هموم الحیاه) ، بەپێی هەندێ توێژینەوەی تریش سروشتی میری سۆران وابوو دەیووت کەس دەست نەخاتە ناوکاروباری دەولەتم هەتا لەباوکی خۆشی قەدەغە کرد .

(ئەوەی دەیسەلمێنێ کورد ئازاد بووینە و ئازادیخوازن ئەوەیە کە ئافرەتانیان هەرگیز پەچە ناپۆشن) ، ئەوەی پێی دەووترێ تاك وتەرای عەلمانی کورد دروست ببوو زۆربەیان لە ژینگەیەکی بیانی ، لەلایەن ئەوانەوە هەمان بەلێنی پێشکەوتنی تەکنۆلۆجی و سەربەخۆیی بە کورد درا. ئەوە مانای پێش کەوتنی وەرگرتبوو، بە هەمان ڕووکار هەندێ لایەنی هونەر و ویژەی کوردی بەرە بەرە ناوەڕۆکێکی عەلمانی وەرگرت .

بەو شێوەیە لەناو کوردستانیش لە سەرەتا بیری عەلمانی لاواز بوو ،زەمینەی مێژووی کەمتر گونجاوە ، بۆیە نەوەی یەکەمی عەلمانی نەوەیەکی خۆمالی نابێت ، عەلمانیەکەیان لە هۆکارو زەمینەی کوردستانی نەشونمای نەکردوە ، بەلکو لەزەمینە گشتیەکەی عوسمانی سەری هەلداوە ، دوای ئەوەی پرسی نەتەوەیی بۆ کورد دروست دەبێت لەدوای سالانی ١٩٠٨ ئینجا بەرەبەرە ئەو بیرە لەکوردستانیش لەگەل بیری نەتەوەیی وکوردایەتی تێکەل دەبێت ، عەلمانیەتی کورد لە ڕێی دۆزی نەتەوەیی هاتۆتە ناو کوردستان ، یەکەم جار وەك بالێك لە ناو نەوەی یەکەمی حزبە کوردیەکان سەریان هەلدا بۆیە نەوەی یەکەمی عەلمانیەتی کوردهەر هەمانن نەوەی یەکەمی حزبەکوردیەکانن .

## ئەو نەوەیە ونەوەی یەکەمی حزبەکوردیەکان

لەسەرەتادا سیستەمی عوسمانی دژی دامەزراندنی حزب بوو ،فتوای شیخ الاسلامی عوسمانیش هەبوو ،بەلام لە ١٩٠٩/٨/٣ یاسای (الجمعیات)ی عوسمانی دەرچوو،ڕێدرا حزب وکۆمەل دروست بکرێت ، ئیتر حزبەکان لە نهێنیەوە هاتنە مەیدانی ئاشکرا ، یەکەم جار بیری عەلمانیەت نەهاتە ناو کوردستان ،یەکەم جزبی عەلمانی لەناو کوردستان دروست نەبوو بەلکو لەناو تورك دروست بوو، بریتی بوو لە ئیتحادو تەرەقی کەلە سالی ١٩٨٩ دروست بوو ، (٢)لە (٤)دامەزرێنەرەکەی (اتحاد الترقی) کورد بوینە. دامەزرینەرەکان بریتی بوون لە:دعبالله جودت لە عربگیر لەدایك بوەو کورد بوە، ئیسحاق سکوتلی لە دیاربەکرکوردبوە، ئەوانەی ڕۆلی گرنگیان بینی لە تەغریبی عوسمانی ووەرچەرخانە گەورەکانی کۆتایی عوسمانی بەشێکی زۆریان کورد بووینە ،ئەوانە بەشێکن لەنەوەی یەکەمی عەلمانی کوردیش ،بریتین لە : د.عبداللە جووت، د.ئیسحاق سکوتلی، فکری لوتفی، زیا ئەلب کۆك، عصمت ئینینۆ، بەشێك لە بەدرخانیەکان،شریف پاشا..زۆری تریش، ئەوەی بناغەی پەیوەندی نێوان ئەلمانیاو عوسمانی ڕێکخست ولەدوایدا پێکەوە کەوتنە بەرەیەکی جەنگ شریف پاشای کورد بوە، ئەوەی پیتی لاتینی هێنا ناو عوسمانی هەر کورد بوو (د.عبداللە جودت) بوو۔ لە ڕاستیدا ئەو پیاوە مونەزیری تورکیای نوێ بوە نەك مستەفا کمال، زیا کۆك ئەلبیش هەر کوردبوە خاوەنی تەنزیری تۆرانی بوە ، بەو شێوەیە نەوەیەکی ئەفەندی کاریگەر بە ئاڕستەی پیچەوانەی عوسمانی لە نێو جەرگەی عوسمانی دروست بوو زۆربەی کوردبوون ، هیشتا ئەو جم وجۆلە نەگەیشتبوە ناو کوردستان ، دوای ئینقلابی ئیتحادوتەرەقی لە ١٩٠٨ و دوای لادانی سولتان عبدالحمید ئینجا ناسنامەی ئیتحادیەکان دەرکەوت و کوردایەتی و حزبی کوردیش دروست دەبێت .

لەبارەی یەکەم حزب لە کوردستان ڕای جیاجیا هەیە،لەهەمان کاتدا مەرج نیە هەموی عەلمانی بن ، بەپێی چەند سەرچاوەیەك (یەکێتی محمد)ی کە لە سالی ١٩٠٨دروست بوە یان ١٩٠٩) بەسەرۆکایەتی سعید نورسی یەکەم بووە، بەڵام بەپێی بەڵگەنامەکانی ئەرمەنی (یەکێتی کورد) بە ڕابەرایەتی (شێخ عبیداللە نهری)لە سالی ١٨٨٠دروست بووە[**] ، بەپێی چەند سەرچاوەیەکی تریش (کۆمەڵەی عەزم–عزم قوی جمعیتلر) لەساڵی ١٩٠٠ دروست بووە بریتیە لە یەکەم حزب[١]،لەلایەکی تریش لەسالی ١٩٠٧لەشاری دهۆك لەمالی شێخ محمد بریفکانی لەکۆبونەوەیەکی فراوان (پەیوەندی کورد)بەسەرۆکایەتی شێخ عبدالسلام بارزانی ڕاگەیەنراو، لە بەلگەنامەکانی بەریتانی وفرنسی ناوی دەستەیەك لە کۆمەل و ڕێکخراوی سیاسی ونا سیاسی تر بەو شێوە هاتوە :دەلێ کۆمەڵەی عەزم لە سالی ١٩٠٠ز دروست بووە لە ئەستەمبۆل بەسەرۆکایەتی ئەحمەد رامز، جەمعیەتی نەشری مەعاریفی کوردلە١٧\٧\١٩١٢لەئەستەمبۆل– عبد الرحمان بدرخان، جەمعیەتی هێڤی کورد، جەمعیەتی موحیبی کورد ، (یان کوردستان محبی جمعیتلر ـ د نوری دەرسیمی) ، کۆمەڵەی جیهانزانی، کورد ئیستقلال قومیەتی، کۆمەڵەی ئیرشاد لەئەرزەرۆم، کۆمەڵەی دیفاع لەهەژاران، کۆمەڵەی برسیان، کۆمەڵەی دۆستایەتی کورد،...ناوی زۆر دەستەو تاقم هاتوون ، بەلام بەشی زۆری مێژووناسانی کوردو بەلگەنامەکان یەکەم حزبی گەورە (تعالی وترقی کورد جمعیتلەر) دروست بوە لە ٢/تشرین یەکەم/ ١٩٠٨ ، دامەزرێنەرانی بریتین لە : زو الکفل، ئەمین عالی بەدرخان شێخ عبد القادر ئەمین، ...) ، خەڵکێکی مافناس و ئاینی و ئەفسەری تیابوو، لەویش تاك وتەرای عەلمانی تێدا

[**] لە سالی ١٨٨٠ لەنەهری کۆبونەوەیەکی فراوان بۆ سەرۆك عەشیرەت وکەسایەتیەکان کراو تیایدا شێخ گوتارێکی ئاینی وسیاسی خوێندەوە ووتی : پێش نزیکەی ٦سەدەعوسمانی دەسەڵاتی گرتۆتە دەست بێ دەنگ بووین بەڵام ئیستا بەرەو عەلمانیەت دەڕوا حەتمەن تێك دەچێت، کاتی یەکگرتمان هاتوە، بەو شێوەیە کۆمەڵەی کورد لەوێ ڕاگەیەنرا ، بۆ زیاتر بڕوانە :جلیلی جلیل- الإنتفاچە و خالفین —صراع علی کوردستان والکورد والدولە العپمانیە .

[١] بروانەد عبداللە جودت والقومیە الکردیە - ص٢٧ .

بوو ، دوو ئاڕستەی تێدا بوو ،زۆربەی دامەزرێنەرانی ئەوانە بوون لە ئیتحادوتەرەقی تورکی هەلگڕابوونەوە ،بەشێکیان بە هۆی عەلمانی بوونی ئیتحادوتەرەقی بەشەکەی تر بە هۆی تۆرانیەتەکەی ، ئەو دوو لایە یەکڕا نەبوون لە پرسەکان، لە دنیا بینیەکان دوای وەك بالی عەلمانی وئاینی لیٚ دەرکەوت ،بالی عەلمانی بێسەروبەر بوون ،بەتایبەتی (شریف پاشا) نوێنەرێکی وریای کورد بوو لە رێکەوتنەکانی ئاشتی لە پاریس بەشدار بوو ، بەلاّم ماندووناس و پیاوی ڕابواردن بوو، لەبارەی پەیوەندیان بە عوسمانی و پرسی مافی چارەنوسی کوردستان دیسان دووڕای جیای تێدابوو یەکەمیان داوای سەربەخویی تەواوی بۆ کوردستان دەکرد دووەمیان کۆنفیدرالیەك بە ناوی جامیعەی ئیسلامی .

## گەشەی عەلمانیەت لە کوردستان لەدوای جەنگی جیهانی

دەولّەتی عوسمانی بە فەرمانی ئەنوەر پاشا لە ٢٩/ ١٠ /١٩١٤ چووە پالّ ئەلّمانیا لە جەنگی جیهانی یەکەم، لە ١٩١٨/١٠/٣١ بە شکستەوە لە (هودنەی مۆدرس)[*] جەنگی ڕاگرت، لەو کاتە هێزەکانی هاوپەیمانان گەیشتبونە سنوری کوردستانی خوارووی (ویلایەتی موسلّ)، لەگەلّ ئەو سەرکەوتنانەی هاوپەیمان و شکستی عوسمانی بانگێشەی رزگاری میللەتان لەلایەن رۆژئاوا زۆر خەست بۆوە، پێشووتر بنەماکانی مافی چارەنووسی لە شۆڕش ئەمریکی ١٨٧٦، شۆڕشی فەڕەنسی ١٨٧٩، دوایش کاتی جەنگ وەك: لیدوانە هاوبەشە بەناو بانگەکەی فرنساو بەریتانیا (Anglo- French pederation)لە ١٩١٨/١٠/٧،ئینجا(١٤ بنەماکەی ) ویلسون لە ١/٨/ ١٩١٨بەتایبەتی بنەمای ژمارە ١٢ سەبارەت بە میللەتانی ژێردەستی عوسمانی بوو، هەروەها بنەماکانی شۆڕشی ئۆکتۆبەری ١٩١٧ سەبارەت بە مافی چارەنووسی

---

[*] ئەو هودنەیە لەنێو کەشتی دەریا ئەنجام درا پێك هاتبوو لە ٧ مادە

میللەتان، تەنانەت لەگەڵ داگیرکردنی هەر ویلایەتێکی عوسمانی لەلایەن جەنەڕاڵێکی هاوپەیمانی بەڵێنی ڕزگاری بۆ میلەتان دووبارە دەکراوە، هەروەك بەیانەکەی جەنەرال مۆد لە بەغدای١١/٣/ ١٩١٧، بەو شێوەیە مافی چارەنووسی میللەتانی ژێر دەستی عوسمانی کەوتە دەست هاوپەیمانان، بۆیە زۆربەی هەرەزۆری ڕۆشنبیر و سیاسەتمادارانی مەدرەسەی کوردایەتی وەك میلەتانی تر ڕویان لەوان کرد، بەو شێوەیە عەلمانیەت لە کوردستان لە پرۆسەیەکی پێویستی کۆمەڵایەتی و سیاسی و تەعلیمی و زانستی بە ئاسانی پەڕیەوە بۆپێویستی نیشتمانیش ، ئیتر چالاکوانەکانی عەلمانی کورد زیاتر هاتنە مەیدان و لایەن و کەسایەتیە ئایینیەکانیش ئەو بوارەیان دان.

بەلام عەلمانی کورد سەرکەوتوو نەبوون لە هێنانەدی دەولەتێکی کوردستانی ، لای ئاینیەکانیش بوە شکست چونکە بەتەواوی دەولەتی عوسمانی هەلوەشایەوە ،نەزانرا ئاخۆ ئەو ڕێکەوتنانەی لەگەل کورد مۆریان کردبوو جێبەجێیان دەکرد یان نا،بەلام لەوکاتیەوە تائەو ساتە مشت ومڕ بەردەوامە لە نێوان عەلمانی وئاینی ،هەریەکەیان شکستی بەدەولەت بوون دەدەنە پال بەرامبەرەکەیان ، تا ڕادەیەکی زۆر بالی عەلمانی زال بوو توومەتەکە بداتە پاڵ ئاینیەکان ، ئیتر هەرلەوکاتیەوە دوو هۆکار بۆ گەشەی عەلمانیەت لەکوردستان ئامادە بوە ، هۆکارێکیان گشتین کە لەسەروو باسمان کردبەلام بۆ هەر وولات ومیلەتێك بە ڕێگەی تایبەتی خۆی کاریگەری دەبێت ،هۆکاری دوەم تایبەتیە بە کێشەی کورد وپرسی نەتەوەییەکەی .

گشتیەکەی ئەوەیە دەلێن (دیموکراسی و کۆماری و مافی مرۆڤ و فرە لایەنی و دروست کردنی کۆمەڵگەی مەدەنی و بازاڕی ئازاد، گەشەکردن، یەکێتی نیشتمانی .. تەنیا بە عەلمانیەت بەدی دێت)،کە لەبەشەکانی سەروو باسکران، لەلایەکی تریشەوە دەلێن : ئەو میللەتانەی کە زیاتر پەیوەستن بە ئایین ئەوا زیاتر دواکەوتوترن، ئەو پرۆسەیەش لەسەرەتای عەولەمە و سەرەتای دروستبوونی دەوڵەتی

مۆدێرن و سیستەمی جیهانی زیاتر ڕوون تر دەرکەوت، لە ئەوروپا تا لە ئایین ڕزگار نەبوون گەشەیان بەخۆ نەبینی و تابوونە پێشڕەو، ئەوانەی زیاتر پەیوەست بوون بە ئایین بوونە قوتابی و گوێگری ئەوانەی پەیوەست نەبوون بە ئایین، لەوەوە تەنزیری ئیستیعمار ئەوروپای مامۆستا و بنەمای(ملتون) سەری هەلدا[١]، تا ئەو ڕادەیە ولآتانی عەرەبی و ئیسلامی قایل بوون بچنە ژێر سیستەمی ئینتیدابی کە لەبەشی (١)ی مادەی (٢٢) ی کۆمەڵەی گەلان دەرچوو، ئەوان ببنە قوتابی وئەوروپیش مامۆستاو فێرکەر، لەسەر ئەو بنچینەش وولآتانی عەرەبی ئیستا دروست بووینە، لەوەش زیاتر مامۆستایان بۆ ئەو میللەتانەی مسولْمان نارد کە فێری دەولْەتداری و پێشکەوتنیان بکەن، لۆرانسی بۆ ولآتانی جەزیرەی عەرەب، بۆ عێراق هەریەکە لە (مس بیل) و (برسی کۆکس)بۆ عیراق...، تا ئەو ساتەش وا بەدی دەکریْ لەهەر شوێنێك کە کۆمەڵێك میللەت تێکەڵ دەبن دواکەوتوەکانیان ئەو میللەتەیە کە زیاتر بە ئایین پابەندە، ئەوە لە ڕووکەش ڕاستی پێوە دیارە ،بۆ خەلکی عاقلمەندیش لە قوولایی هۆکاری هەیە ،بەلام زۆربەی خەلکی ئەنجام وڕووکەش دەخوێننەوە نەك هۆکارو قوولایی ، ئەو هاوکێشەیە گوتاری عەلمانی بەهێزدەکاو پاساوومقەوەماتی پتەو تر دەکات لە نێو جیهانی ئیسلامی .

هەرچی تایبەتیەکەی کوردستانیشە لەدوای شکستی نەوەی یەکەمی عەلمانیەتی کوردیش هەر هۆکاری گەشەیان بەردەوام بوە ،مادام شکستەکەیان لەسەر شکستی بزوتنەوەی کوردایەتی هەژمارکرا، ئینجا توانیشیان بیدەنە پالْ ئاینیەکان ،لەو کاتیەوە بەرەبەرە عەلمانیەتی کوردی زیادی کردوە وەك کاردانەوەی چەوسانەوەی نەتەوەیی بووە، بەرامبەر ئەو زولْم و زۆرەی دەکریْ، دەبینین داگیرکەران بەڕووکەش موسلْمانن، واهەست دەکەن هەر دەولْەتەکان داگیرکەر و زۆردار نین بەلْکو

[١] د علی وردی –لمحات من تاریخ العراق... ج٥ ص٥٦ بنەمای ملتۆن وادەلێ: ((لا تدع بریطانیا تنسى رسالتها في تعليم الأمم كيف تعيش)).

**میللەتی مسوڵمانی دەوڵەتەکەش یارمەتی دەرن، کەمتر بینیویانە زانایانی ئایینی لە وڵاتانی عێراق و ئێران و تورکیاوسوریا سۆزی ئایینی بیگرێ لەسەر کورد فەتوایەکی ئیجابی بدا، (جگە لەهەندێ زانای شیعە) نەبێ بەدەگمەن نەبووە، بەڵکو بەپێچەوانەوە هەندێك لەزانا و موفتی و بزوتنەوە ئیسلامیەکانیش ناوی کورد بە پیلانگێر و سەر بە ئیمپریالیزم و ئیسرائیل وەسف دەکەن.**

**لەسەرەتای بزوتنەوەی کوردستان وارێکەوتوە بەسەرکردەیەکی ئاینی و ریکخستنیکی نیمچە عەلمانی بەرێوە چوە ، لەدوای ١٩٧٥ بۆ یەکەم جار سەرکردەو رابەرەکانیش کەوتنە ریزی عەلمانی ،تارادەیەك عەلمانی زیادی کرد و مارکسیەت بوە چرای پێشەنگی کوردایەتی[١]، بەکورتی هۆکارەکانی عەلمانی لە کوردستان(سەرەرای ئەوانەی سەروو) ئەمانەی خوارەوەشە :**

1. **بەشێکی زۆر کاردانەوەی چەوسانەوەی نەتەوەیی بووە، بەرامبەر ئەو زوڵم و زۆرەی دەکرێ، دەبینین داگیرکەران بەرووکەش موسڵمانن، واهەست دەکەن هەر دەوڵەتەکان داگیرکەر و زۆردار نین بەڵکو میللەتی مسوڵمانی دەوڵەتەکەش یارمەتی دەرن، کەمتر بینیویانە زانایانی ئایینی لە وڵاتانی عێراق و ئێران و تورکیاوسوریا سۆزی ئایینی بیگرێ لەسەر کورد فەتوایەکی ئیجابی بدا، (جگە لەهەندێ زانای شیعە) نەبێ بەدەگمەن نەبووە، بەڵکو بەپێچەوانەوە هەندێك لەزانا و موفتی و بزوتنەوە ئیسلامیەکانیش ناوی کورد بە پیلانگێر و سەر بە ئیمپریالیزم و ئیسرائیل وەسف دەکەن.**

[١] تەنانەت پ.د.ك لەسەر رێبازی بارزانی - ئایینی بووە، کەچی لە کۆنگرەی - ٩- المنهاج والنظام الداخلی للحزب الدیمقراطی الکردستانی (منهاج)وایان تؤمارکرد :
المادة الخامسة\ یسیر الحزب فی نضاله السیاسی والاجتماعی والاقتصادی علی ضوء النظریة المارکسیة اللینینیة ویقوم بتثقیف النظریة المارکسیة وتسلیح کوادره ومنتسبیه مرکزیاًبها، کما ویستفید من التجارب الشعب الکردی وتراث البارزانی الفکری، ومن التجارب حرکات التحرر الوطنی فی العالم.

٢. لەلایەكی تر دەبینین لەكاتی مەینەتی و لێقەومانی كورد كەمتر وڵاتانی جیهانی ئیسلامی لەسەر كورد بەوەڵام دێن، زیاتر وڵاتانی ڕۆژئاوا و غەیرە ئیسلامیە، ئەوە كاریگەریەكی قوڵ لەسەر ناخ و سایكۆلۆژیەتی تاكی كوردكردووە، باوەڕی بە مسوڵمانان ئیسلامیش لەق بێت.

٣. موسولمانی كورد ڕووبەڕووی چەند پرسیارێك بوویتەوە وەلامی زەحمەتەو عەقلی ئاینیەكەی بەرەو قەیرانێكی سەربااردەبات ،گرنگەكانیان ئەوانەیە: كوردستان داگیرو دابەشكراوە بە سەر سوریا، عێراق، ئێران، توركیا.. ناویشیان دەوڵەتی ئیسلامە، وا دەردەكەوێ كە مافی كورد لەلایەن ئیسلام خورابێ، بەتایبەتی كاتێ دەبینرێ لەو هەموو مەینەتیەی بەسەر كورد هاتووە لەو وولاتە ئیسلامیانە و جامیعەی عەرەبی و كۆنگرەی ئیسلامی و ڕێكخراوێكی لەو جۆرانە بە هانای كورد نەهاتوون، ئیتر دیمەن و ڕای گشتیەك بەسانایی بیرو ئەقڵی كورد دەوروژێنێ كە هەر ئیسلام چەوسێنەری كورد بووە، بەسانایی بیرۆكەیەكی هەلبەستراو ئەكتیڤ دەكات كە دەڵێن: داگیركردنی كوردستان بەناوی (فتح)ی ئیسلام ئەنفالی یەكەم بووەو ئەنفالی بەعسیش دووەمە، ، زیاتر لەوانەش پرسیار و فەرمایشتێكی چەوتی وەك گۆتەی: (خودی فكری ئیسلامی لە خزمەت شۆڤێنی و ناسیۆنالیزمی عەرەبی دایەو بەشێكە لە فەرهەنگی داگیركاری)، (بەهۆی ئیسلام كورد دەبێتە خزمەتكاری عەرەب)، پرسیاری تری وەك ئیسلام كورد دەكاتە بەلاگێڕی خۆی كەچی میللەتانی تر ئیسلام دەكەنە بەراگێڕی خۆیان ،هەمووی سودی لەئیسلام بینیوە تەنها كورد نەبێ...لەگەڵ زۆر گەلالەی تركە ئیسلامیەكان بە چاكی وەلأمیان پێ نەبوە .

٤. لەسالی ١٩٦٣لە هەلمەتی یەكەمی ئەنفالی عبدالسلام عارف وبەعسیەكان هێزی سوریا بە فەرمی هات یارمەتی عێراقی دا بەپێی مادەی(٢)ی (معاهدة الدفاع المشترك بين دول الجامعة العربية)كە لە ١٩٥٠/٤/١٣ مۆركرابوو، لەوێشەوە بۆ

هاوپەیمانیەکی سەربازی نێوان سوریا وعێراق کە لە ١٩٦٣/١٠/٨بەسترا بوو ،پسپۆرانی شەڕی پارتی زانی جەزائیری وفرۆکەوانانی یەمەن وهێزی هندی وپاکستانیش یارمەتی عێراقیان دا، دەنگی زانای ئاینی بەدی نەکرا جگە لەدەنگێکی نزمی (محسن حکیم لەنەجەف) ، لە ئەنفالی دووەمی ١٩٨٨ لەسەرئاستی عەرەبی تەواوی جامیعەی عربی پالپشتی عێراق بوون دژ بەکورد،زیاتر لەوەش هەندی وولاتی عەرەبی دیسان هێزیان ناردبەشداری ئەنفالی کردوە(وەك لەدانپێهێنانی مدیری هەوالگری گشتی بەعس)دەڵێت: یەمەن بە لیوای(عروبە)وئوردەن بەلیوای(یەرموك)وسودان بە(متطوعین)ووولاتانی کەنداویش بە یارمەتی مادی بەشدار بووینە[1]...کەواتە هەر حزبی بەعس بەشداری ئەو تاوانە نەبووینە گەلە کۆییەك بەدی دەکرێ دژ بە میلەتیکی هەژاری بێکەس .

٥. بەشێکی تری شارەزای مێژووی کورد هۆکارێکی سەرباری تری خاڵی (٢)یان بۆ دروست دەبێت، کاتێ دەبینین هەندێ مەزهەبی فیقهی ئیسلامی و زانای موعتەبەر بەچاوی (مەوالی) و (علوج) و (ڕەچەلەك سوك) بەلای مێژووی کورد داچووە، لەوانە مەزهەبی ئیمامی شافیعی ئیمام سەعالیبی و شێخ ئیسلام ئیبن تەیمیە و زۆری تر پێیان وابووە عەرەب پلە یەکەو کورد پلە دووە[2]...زیاتر لەوە بەشێك ڕەچەڵەکی کوردیان کردۆتە عەرەب یان جن یان (ئەعرابی فارس)...، بۆچوونی ئەو زانایانە لەگەڵ تەیاری عروبی ئێستا و بۆچوونیان لەبارەی کورد دیمەنێکی زۆر ناشرینی ئاین دێنێتە پێش چاو، ئەگەر زۆر بەوردی ئەو زانیاریانە لێك نەکەیتەوە و ڕەفتاری مسوڵمان و ئەسلی ئایین لێك جیانەکەیتەوە(کە ئەو تەقەلایەش زۆر کەمە) ئەوا ئەو ڕەوشە دەبێتە زەمینەیەکی زۆر چالاکی سیکولاری ولائیکی وهەتا ئیلحادیش لە کوردستان.

---

[1] وفیق سامرائی- حطام بوابة الشرقية ص١٣٠ .

[2] ڕۆلی عەلمانی لەدروست بوونی مەینەتی کورد ل ٣٠٨-

٦. ئەوەی زیاتر ئەو قەیرانە قوول تر دەکاتەوە تا ئەو ساتە لایەنە ئیسلامیەکانیش نەهاتوون لەگەڵ ڕابوونی خۆیان پیشەنگ بن بۆ چاکردنەوەی ئەو دەردە مەزهەبیانە، بەڵکو زیاتر کەوتونە ژێر کاریگەری تەیاری عروبی کەبەسەر زۆربەی بزوتنەوە ئیسلامیەکانی عەرەب زاڵە، ئیسلامی کوردستانیش بە توندو نەرمیەوە لەژێرکاریگەریەکی سەختی ئیسلامی عەرەبە بەچەوت وڕاستیەوە، لەودەمە سەرەتای تەقەلایەك بەدی دەکریێ بۆ ڕزگاربوون لە ژێر ئەو بارە قورسە.

٧. میلەتی کورد زۆر پێویستی بە یەکریزی هەیە، کەچی دەبینن ئەو هەمو کێشەیەی مەزهەبی وفقهی وسیاسی لە نیو موسوڵمانی کورد هەبێ، وادەردەکەوێ ئاین مایەی یەکڕیزی نیە.

٨. ئەوەی ئێستا لەبەشێکی فراوانی عەلمانی کورد دەبینرێ هێشتا زانیاریە فەلسەفی و زانستی و گەردونیەکانیان زۆر کلاسیکیە، کتێبەکانی (هۆبز) و (نیچە) و (ڕۆسۆ) و (مۆنتسیکۆ) تۆخمەکانی فیکری ڕۆشنبیری کورد پێکدەهێنێ.پیشتریش کتێبەکانی مارکس وئەنجلس ولینین و ترۆتسکی وماوتسی تۆنگ وکیم ئیل سۆنگ و ج پۆلیتزرو...کاریگەر بوون.

٩. بەشێکی تری هۆکاری تایبەتی ئەوەیە زۆربەی ڕۆشنبیرانی عەلمانی کورد دەردی لاسایی و (تقزم الثقافي) و دوور و قۆڵیان هەیە،ناتوانن هۆکارەکان بە ووردی دیاری بکەن ، جاروایە کەمی شارەزایی و ڕەوشەنبیری هۆکاری مانەوەو گەشەی عەلمانیەت بوە ، لەکاتێکدا لە کوردستان مارکسی گەرم بوو لە ١٩٧٩ بەدواوە ڕاپەرینێکی کرێکاری لەسەرانسەری ئەورووپایی ڕۆژهەڵات لەدژی مارکسی دەکرا بەتایبەتی لە پۆڵەندا بە سەرۆکایەتی (لیخ فاونسا)، ئینجا لەهەمان سال ئێران گەورەترین شۆڕشی جەماوەری جیهانی بە هۆی ئاینی کرد، لەڕووی زانستی و ئابوری و فەلسەفی و... مارکسیەت دووچاری قەیرانی گەورەبوو.

وەك دەبینرێ (لەسەروو) ئەوەی یارمەتی دەری عەلمانیەتە لەکوردستان هەر بیری عەلمانی نیە (بەچاك وخراپیەوە )بەلکو دۆخی تێگەیشتنی ئاینیش یارمەتیدەرە ، لەلایەکی تریشەوە ئەوەی ئێستا لەبەشێکی فراوانی عەلمانی کورد دەبینرێ هێشتا زانیاریە فەلسەفی و زانستی وگەردونیەکانیان زۆر کلاسیکیە،کتێبەکانی (هۆبز)و(نیچە) و (رۆسۆ) و (مۆنتسیکۆ) توخمەکانی فیکری رۆشنبیری کورد پێکدەهێنێ، پیشتریش کتێبەکانی مارکس وئەنجلس ولینین و ترۆتسکی وماوتسی تۆنگ وکیم ئیل سۆنگ و ج پۆلیتزرو...کاریگەر بوون...کاتێ قەیران لە عەقلی عەلمانی وئیسلامی پێکەوە هەبووبێت ئەوا جورئەتێکمان پێدەدا قسە لە قەیرانی عەقلی کوردی بکەین و دەیکەینە ئەدرێسێکی تایبەت کە یارمەتیدەری عەلمانی وزۆربەی بیروهزری خواروخێچە .

## قەیرانی عەقلی کوردی

قەیرانی عەقلیەتی کوردی لەدووچینە پیشڕەوەکانی کوردستان دێت ،کەلەو دەمە یەکەمیان عەلمانیەو دوەمیشیان ئیسلامیە،هەردوولایان هەندێ قەیرانی هاوبەشیان هەیە هەندێ لاشیان لێکجیایە ، هەردوولایان تووشی دەردی(تقزم الپقافی)بووینە ،لەکاتیکا عەلمانیەتی بەعەقلی چەندین سەدە لەوەو پیشی زاناوفەیلەسوفی رۆژئاوا دەچیتە نێو سروشت ،کە سروشت لەخۆی نزیکە دەتوانی خۆی راستەوخۆ دیراسەی بکا ،تەنانەت بەعەقلی موستەشریقیك دیراسەی قورئان دەکا ناچی خۆی راستەوخۆ دیراسەی بکا ،لەوەش خراتربەشی هەرە زۆری عەلمانیەکان زیاتر پاشکۆی لایەنی سەلبی رۆژئاواین پیشووتریش رۆژهەلاتی، زۆری لەسەری باس کراوە (بڕوانە سەروو) ،ئیسلامیش هەلدەستی بەدوو دەروازە دەچیتە ناو ئایین بۆ تێگەیشتن ،یەکەمیان بەعەقلی نەوەیەکی کۆن دەچیتە ناو ئایین ،دوەمیش عادەتەن لەرێی عەقلی

میلەتیکی ترەوە دەچیتە ناو ئایین هەردووکیان دەروازەی نەگونجاون ،دەروازەی سەرەکی ئەوەیە خۆت راستەوخۆ بیَ(وسیگ) بچیە ناوئاین،بۆیە تووشی قەیران بەجیمان وتخلف دەبیت ، بیویستی خۆی دەبیتە پاشکۆی عەقلی عەرەبی کە خۆی لە قەیراندایە ،چەندین کتیب بەو سەردێرە نوسراوە لەلایەن خودی زاناوبیرمەندانی عەرەب، لەوانە :(بنية العقل العربى –محمدعابدالجابرى) ،(ازمة المثقفين العرب- عبداللة عروى) ،(فى نقد الفكر العربى-على المخلسي) ،(ازمة العقل العربى –محمدالفزاوى) (اغتيال العقل: محنة الثقافة العربية بين السلفية والتبعية –برهان غليون) ،(مساهمة فى حل ازمة العقل العربى المسلم- طه ابراهيم) ،(ازمة العقل العربى المعاصر-دقاسم حسين صالح) (ازمة العقل العربى-د حامدخليل)...زۆری تریش بەو عینوانە نەبوە لەناوەڕۆکا باسیان کردوە ،عەقلی عەرەبی لە ژێر ئینتدابە واتە ئەو عەقلە کوردیەی کەوتۆتە ژێر ئینتدابی ئینتداب ،ئەو دۆخە زۆر تایبەتەو پێی دەووتریَ(پاستکی–pastich) بەوانە ووتراوە لاسایی لاساییکەران[1].

ئاینپەروەری کورد ڕازی بوە لەدوای ئەو عەقلەی عربی جێی خۆی بکاتەوە ،کەچی عەرەبی ئیسلامی بە پلە دووی موالی کۆن سەیری ئیسلامی کورد دەکا ، تەنانەت بە خۆی ئەو هەمو قەیراناویەی بەئیسلامی کورد دەڵیَ تۆ بیرمەکەوە عەقلی عربی بەهیزترە(وەك لە فقهی ئیمام ئیبن تەیمیەو...) من لە جیاتی تۆ بیردەکەمەوە ،تۆ تەنها لە خزمەتدابەو بەدوام کەوە،من چیم پیَ باش بوو ئەو بۆ تۆش باشە،ئەگەر هەلەشم کرد ئەوا هەلەی من لە ڕاستی تۆ دروست ترە ، بەو ڕوانگەسەقەتە ئیسلامی کورد سەیری جیهان دەکا،چاوەڕیَ دەکا عەقلی عربی وێنەی دونیای بۆ بکێشی،دەریش کەوتوە ئەو وینانەی عەقلی عربی دروستی دەکا زۆر لەنگ وسەقەتە، وێنەی ڕاستەقینەی جیهان نیە (إياك و مصادقة الكذاب، فإنه كالسراب يقرب

[1] معجم مصطلحات عصر العولمة ص٨٤ .

علیك البعید و یبعدعنك القریب)،لەوەوە ئیسلامی کورد تووشی کاردانەوەی تایفی وتوندی ودەمارگیری ودابڕان وبێ ئینتمابی بوە بێ ئەوەی پیویستی پێبێت،تووشی وەهمی بوونی پیلان دەبێت ، جاروایە هەمو دنیای لێ دەبێتە دوژمن، تاجل و بەرگی خۆشی بێ ئەوەی هۆیەکەی مەعقول بێت،کە شایستەی نیە،بە دلپاکی وفەقیرحالی تووش دەبێ ، جاریش وایە دەگاتە ئەو ڕادەیەی تەرازوو وپیوەرەکان پیچەوانە دەکەنەوە دۆستی لێدەکەنە دوژمن ،سپی لێ ڕەش دەکەن ..بە پیچەوانەشەوە ، شیخ سعیدی و شیخ محمودو مەلامستەفاو تەواوی دۆزی کورد دەدەنە پاڵ پرۆژەی ئیستعمارو زایۆنی و وولاتانی عربیش پیشڕەوی رزگاری وهەلگری ئالای ئاین ،شۆڕشەکانی کوردستان ئینفسالی وئینگلیزی ورووسی بوە کەچی شۆڕشێکی خیانەتکاری وەك شریف بن حسین بە (پورە العربیە الکبری) وەسف دەکەن ، ئیستا عەقلی عەرەبی دواکەوتو ترین عەقلە لە جیهان تا ئیستا ناتوانیٚ دەرزیەك دروست بکا ،کەچی ئاین پەروەرانی کورد موعجیبە بەو عەقلە قەیراناویەو دەیەویٚ مندالی کورد لە ژێر سایەی ئەو عەقلە پەروەردە بکا ،...

قەیرانەکە لەوە دێت کە ڕاستەوخۆلەگەل عەقلی ئاینی کاری نەکردوە بەلکو لەڕێی عەقلی عربی چوویتە نیو ئاین ،واتە قەیرانی عەقلیەتی کوردیش وەك باقی قەیرانەکانی تری میلەتانی موسولمان ئاین بۆی دروست نەکردوە بەلکو لە تینەگەیشتن لێی دروست بوە ، قەیرانەکەشی زۆر سەخت نیە،چونکە ڕیشەی میژوویی نیە،زانایانی ئاینی کورد کەمتر ئەو قەیرانەیان هەبوە ،ئەوەی تووشی ئەو قەیرانەش بووبیٚت کەمتر لە کوردستان دانیشتوە،بۆیە کاریگەریەکەی بەسەر کۆمەلگەی کوردی زۆر نەبوە،ئەو دیاردەیە نوییە دەتوانین بلیێین هەم ئیستا سەرەتایە هەم کۆتاشە، ڕبوونی ئیسلامی لە کوردستان ودوایش بزوتنەوە ئیسلامیەکان بە چاکسازی فقهی ونیشتمانی دەستیان پینەکرد ، بەلکو ئەوانیش بە (حسن القن

المفرگ)بە مێژوو و بەسەلەف و بە فقه هاتنە مەیدان ،بەلام ئێستا جوولەیەکی زۆر هەیە بەئاڕستەی ئەرێنی ،وارِادەبینریٚ لەچەند سالی داهاتوو شۆڕشێکی فکری ڕاست کردنەوە ئەنجام بدرێت ویچووی رۆژئاوا،لەوێ لەسەر فقهو پەیام کرا هەرچی لەکوردستان وجیهانی ئیسلامیە تەنها لە سەر فقهی بەشەری کلاسیکی دەکرێت ناگاتە دەق و پەیام ،بەلکو ئەو هەیمەنەیەی فقە بەسەر پەیامیدا کردوە کۆتایی پێدەهێنرێت .

ئەوانە هەموو وای کردوە عەلمانی لە کوردستان لەنامۆی دەرچێت ، بەڵکو زیاتر لە ڕێ ی پرسی مەینەتی کورد و کێشەی مەزهەبی و کێشەی ئافرەت و مافی مرۆڤ و هەندێ کەلێنی زانستی تر بەکاردەهێنێ، رەواجیکی زۆری سیاسی وتەعلیمی پێ بدرێ.

## هەلسەنگاندن(ئیجابی وسەلبی )عەلمانی کورد

ئەگەرچی لە میژوودا عەلمانی وهاوتاکانی دەردەسەری بوە بۆ مرۆڤ لەشەڕو خۆویستی و ستەم ،بەلام ناکریَ نکولی لەوە بکریت کە عەلمانیەت لە جیهاندا خزمەتی بەبەشەریەت کردوە ،بەتایبەتی عەلمانیەتی میانڕەوی عەقلانی ، لەچاو ئەو دۆخەی ئاینی مسیحی(ئیستایان) و بەشیك لە فقهی ئیسلامی کۆمەلگەیان تیاالاند، ئەوەی ئیستا جیهان بەڕیوە دەبات لە تکنۆلۆجیاو شارستانی و سیستەمی سیاسی و یاسای دەولی و فەرهەنگ و مافی مرۆڤ و ...بەسەرکردایەتی عەلمانیە ، بەلام مەرج نیە ئەو هەمو نەرینیە(نسبیە)بۆ جیهانی ئیسلامی واهاتبیت ، بۆکوردستانیش بەهەمان شیوە ،لەهەموی گرنگ تر واڕیکەوتوە لەگەل هاتنی عەلمانی مەینەتی کوردیشی لەگەل هات(بڕوانە : ڕۆلی عەلمانیەت لەدروست بوونی مەینەتی کورد) ،لەهەمان کات عەلمانیەتی کوردە شۆڕشی نوێی کوردی لەزۆربەی پارچەکان هەلگیرساندۆتەوە ، لەگەل زۆرلای تری ئەرینی ، بەلام سەلبیاتیکی زۆری تریان هەیە ،هەندیکی گشتین لە چوارچیوەی جیهانی ئیسلامی وبەشیکی تایبەتیە لەچوارچیوەی کوردستان ،بەکورتی باسیان دەکەین :

### یەکەم – جیهانی :

باسی ئیجابی عەلمانی ئیستامان کردلەسەروو ،بەلام ئەوە لەچاو نادادگەری جیهانی ئیسلامی و جیهانی شیوعی(سەردەمی سۆڤیەت)وجیهانەکانی ترە ،ئەگینا ئەوەی ئیستا دەگوزەریَ دادگەری نیە ،بەلکو ناشرینی ئەوجیهانانە جیهانی رۆژئاوای عەلمانی جوان کردوە ، لە سیستەمی عەلمانی
بنەمای(بەرژەوەندی) لەسەر ئاستی تاك وکۆدا ڕەوایی وەردەگریَ(بەتایبەتی لەمەدرەسەی لیبرال دیموکرات) دەبیتە بنچینەی سیاسەت ویاساو دەستور وماف وئەرك ، بە پیی بنەمای (پیك گەیشتنی دوو بەرژەوەندی دەبیَ جیا بیت لەگەلَ

سێیەم)[1]، ئەو بنەمایانە جیهان بەچەندین ئاڕستە دابەش دەکات، بۆ سەروو و خواروو، ڕەش و سپی، تێر و برسی، بەهێز و بێ هێز، داگیرکراو و داگیرکەر، زانا و ڕووناك بیر و نەزان و نەفام، .. نەتەوە و کەلتور و زمانی جیاجیا، شارستانیەتی جیاجیا، ئاین و ئایدۆلۆژیای جیاجیا.. ناسنامەی جیاجیا.. بۆیە هەر یاسا و بڕیار و هەنگاوێك دێت مەرج نیە لە بەرژەوەندی هەموو ئەو پۆلانە بێت، بە زۆریش لە بەرژەوەندی بالاّ دەستانە، ئینجا پلە بە پلە دادەبەزێ و گەورەترین زەرەرمەند میللەتانی ژێر دەستن، هەژاری زۆر و دەوڵەمەندی زۆر دەوڵەمەند پەیدا دەکات ، ئەو چینایەتیە ڕەهەندی جیهانیش وەردەگرێ، سیستەمیك زال دەکا بەسەر جیهان چینایەتیەکی توند بەرپا دەبیت ، هەندی نمونە لێی هەلدەبژێرین :

تێکڕای قەرزاری وولاتانی هەژار(جیهانی سێیەم) تا سالی ١٩٩١ گەیشتۆتە ١٢٥٠ ملیاردۆلارە ،٦٨٢ملیار ئەمریکای لاتینی کەدەکاتە٣٨٪، ئینجا وولاتانی ئاسیا بە ریژەی ٣٢٪ ئەفریقا بە ١٦٪.. ئامارێکی تری دابەشی داهات بە پێی ژمارەی دانیشتوان لەسالی ١٩٨٩ بۆ پینج بەش بە جۆریك بەشی یەکەمی هەرە دەولەمەند ٢٠٪ی جیهان ٨٢٪ی داهاتیان هەیە ، پینجەمی هەرە هەژار ٢٠٪ تەنها ١٪ی بەردەکەوێ ، لە کۆنگرەی زەوی (جوهانسبیرك ٢٠٠٢ز)، لە راپۆڕتەکانی (un).. بەکورتی واهاتووە: خەڵکی سەروو کە لە ٢٠٪ دانیشتوانی سەر زەوی پێك دێنن، کەچی لە (٨٠٪) دەخۆن، خەڵکی خوارووش کە لە ٨٠٪ی دانیشتوانی سەر زەوی پێك دێنن تەنیا لە ١٦٪ی داهاتیان بەردەکەوێ، ئاماری سەرسوڕهێنەری تر هەیە (١٧٣) کەس و کۆمپانیا لە (٨٠٪)ی داهاتی جیهانیان

---

[1] لە بنەڕەتدا ئەو ڕێسایە بۆ (مارکۆز) دەگەڕێتەوە ، کە لەگەل بنەمای ئاینی تێکدەگیرێن :(إذَا كُنْتُمْ ثَلاَثَةً فَلاَ يَتَنَاجَى اثْنَانِ دُونَ الآخَرِ حَتّى تَخْتَلِطُوا بِالنّاسِ مِنْ أَجْلِ أَنْ يُحْزِنَهُ) .

بەدەستە و (٦) ملیاریش تەنها لە ٢٥٪، بەپێی( Swiss Observatoire de la Finance .) سویسری بۆ دارایی ئەوا ٨٠٠ دەزگا دەستی بەسەر نیوەی داهاتی جیهان داگرتوە، هەتا لە ناوەخۆشدا هەریەك دەوڵەمەندی ئەمریکی هەیە بە ئەندازەی (٢٠٠) خێزانی ئەمریکی بەردەکەوێ[1]... بەشێکی ترزیاتر لەوە (وەك مارکس) پێیان وایە پرۆسەی دیموکراسی بریتیە لەوەرچەرخان بۆ پلۆتۆکراسی (دەولەمەندەکان)بەتایبەتی لە ئەمریکا)[2] ... هەمو ئەوانەش ڕەنگدانەوەیەکی سەلبی بۆسەر کۆمەلگە دروست دەکا، عەیارەکان تێك دەچن کۆمەڵگەیەکی دوور لەبەهای مرۆڤایەتی و ئایینی دروست دەبێت ، بەگشتی فاکتەرەکانی ئایین و ئەخلاق و ئایدۆلۆژیا بەشێکە لەتەواوکەری کەسێتی، نەبوونی ئاین وبنەما مرۆییەکانی تر وجێگرتنەوەی بە ئایدیۆلۆجیای لائیکی کەسێکی لەرزۆك وراڕاو کرێگرتە دەبێ، بەرگری لاواز دەبێت بەتایبەتی بەرامبەر داگیرکاری، لەسەر ئاستی کۆمەڵگەش ئەو فاکتەرانە (بەدروستی) دەبێتە هۆی تەبایی و (چبگ اجتماعی) و هاریکاری و لێبوردەیی و بەزەیی و وەفا و خۆنەویسی بلاودەبێتەوە، بەگشتی ڕێگرە لە زاڵبوونی بەرژەوەندی تایبەتی بەسەر بەرژەوەندی گشتی، کە فاکتەری هەرە بنچینەیی دروستبوونی کۆمەڵگە و نەتەوە و حیزب و تاقم ودەزگایە، ئەوەش دەروازەی یەکەمی پێشکەوتن وداهێنانە لەلایەك ولەلایەکی تریش بۆ خۆشەویستی میلەت و وولات و هێزی بەرگری، بەپێچەوانەوە ئایدیۆلۆجیای عەلمانی کەسی شەڕانی و خۆویست دروست دەکات، کۆمەڵگەیەکی پر لە تاوان دروست دەکا، یاسایەك هەیە بەناوی( Univarsal social law)هاتووە (ژمارەی تاوان لە

[1] بۆ زیاتر سەرنج بدە: ١-امریکا طلیعة الانهیار- روجیه غارودی، ٢-تقریر امم المتحدة لسنة١٩٩٩، ٣-قمة الارض—جوهانسبرك، جنوب افریقا.

[2] -p٣١٦ Amodern Dictionary Political Analiysis- geoffr Roberts

کۆمەڵگەیەك زیاد دەکات ئەگەر ئایین رۆڵێکی پەراوێزی هەبێت)[١]..لەگەل زۆر لای تری .

## دووەم – جیهانی ئیسلامی:

لە سەرەتای سەدەی (٢٠) ڕەوشەنبیرانی عەلمانی جیهانی ئیسلامی بەڵێنیان دا بە نووسین و وتار کە هاتنی عەلمانیەت بەهەشت لەگەڵ خۆی دەهێنێ لە پێشکەوتن و ئازادی و شارستانی، کەچی وا دەبینین جگە لە دیکتاتۆری و پارچەپارچەیی و ناکۆکی و برسیەتی و گەندەڵی وخۆویستی ..خێری نەهێناوە، بەتایبەتی بۆ کورد بووە هۆی دابەشی و داگیرکردن و مەینەتی ، زۆر بەکورتی قەیرانەکانی عەلمانی لە جیهانی ئیسلامی باس دەکەین :

### قەیرانی یەکەم:

لەجیهانی ئیسلامی عەلمانیەت قەیرانی زیاترە نەك لەجیهانی رۆژئاوا، چونکە لەوێ ئاینێکی بێ شەریعەت هەیە، ئەوروپا قازانجی لە وەرچەرخانی ئاینیەوە بۆ عەلمانی کرد، بەلام جیهانی ئیسلامی قازانجی نەکردوە بەتایبەتی وولاتانی عربی ،ئیستا لەدوا کاروانی میلەتانی جیهانن، ئا لێرەدا عەلمانیەکان هەردەم لەگەڵ خودی ئیسلام وئیسلامیەکان لە ڕوبەڕووبوونەوەدان، بۆیە هەرگیز نابنە بزوتنەوەیەکی جەماوەری.. هەردەبێ (توقیە) بەکاربهێنن، بۆیە لەجیهانی ئیسلامیدا دەبێ عەلمانیەت هەموو ئەو داب و نەریت و کەلتوور و ئایین و مێژووی میللەتەکە هەڵتەکێنێ، ئنجا بنەماکانی عەلمانی لێ دابڕێژێتەوە.. عادەتەن ئەو هەنگاوانەش بە وێرانکردنی ژێرخانی کۆمەڵگا لە ئەخلاق و بەها و ئاکارەکان دەست پێ دەکا، بێ ئەوەی بتوانێ دروستی بکاتەوە،

---

[١] موسوعة العلم الاجتماع ص٥٠٦. هةروةها بروانة: مةوسوعةى جودى ل٢٥٥

بەو پێیە وای لێ دێت دەسەڵاتی سیاسی و بیری گەندەڵی تەنها بتوانێ لە کۆمەڵگەیەکی گەندەڵ بژی. وەك ئێستا لە زۆربەی ئەزموونەکانی عەلمانی جیهانی ئیسلام دەبینین بە کوردستانیشەوە.

## قەیرانی دووەم :

بەزمانێکی پاڵاو ناڵێ من چیم، ئیسلامیە و عەلمانیشە، دیکتاتۆریە و دیموکراسیشە، نەتەوەیی و ئومیشە، .. هەمووە و هیچیش بەتەواوی نیە، بۆیە دەبینین نەك جیهانی سێ یەم، حزبە کوردستانیەکانیش بە تایبەتی دەسەڵاتدار یادی جەژنی کرێکار، جەژنەکانی ئیسلام، جەژنی مەسیحی، جەژنی نەتەوەیی، .. هەمووی دەکەنەوە.

## قەیرانی سێیەم:

عەلمانیەتی ئێستا لەسەر ڕێباز و بەرهەمی فکری خۆی نارِوا، لە سەردەمی فکری شیوعی زۆربەی ناوەڕۆکێکی مارکسیان هەبوو، لەگەڵ سۆشیال دیموکراس و وجودی و فەلسەفە و ڕاڕەوەکانی تر.. بەڵام لە هەموویدا تێبینی دەکرا لایەنە سەلبیەکانی ئەو ڕێبازانە پەیرەو دەکرا نەك لایەنە ئیجابیەکانی.

## قەیرانی چوارەم :

بەشی زۆری عەلمانیەتی ئێستا کەمترخزمەت دەکا و بەو پلەیە نیشتمانی و دیموکراسیش نیە، گەڕاوەتەوە سەر پێناسەکانی بەشێك لە فەرهەنگە رۆژئاواییەکان کە عەلمانیەت (Secular) بە دنیایی و بێ مبالات و بێ بەرپرسیاری لێك دەداتەوە.

## قەیرانی پینجەم:

لە کاتێکا لەو سەردەمەی عەولەمە هەر مەدرەسەو لایەنێکی سیاسی پێویستی بەوە هەیە لە هەوراز و نشێو، لە دەسەڵات و معارەزە، لە بوونی و نەبوونیدا.. بەرنامە و پلانی ستراتیجی هەبێت بتوانیٚ جەماوەری بێت.. کەچی عەلمانیەتی ئێستا تەنیا و تاقە رێگەی دەسەڵاتە ئەگینا رێگەی تری مردنە.. بۆیەش ژیانی عەلمانی لە جیهانی ئیسلامی ولە جیهانی سیٚ یەم شەڕە دەسەڵات و دیکتاتۆرىیە.

## قەیرانی شەشەم:

تاك و سەرکردەکانی حزبەعەلمانیەکان بە بەرنامەکەشەوە ا ڕەوای دەدەنە بەرژەوەندی تایبەتی و کۆکردنەوەی زۆرترین خەڵك لەسەر بنچینەی (پێم بدە و پێت دەدەم= take and put).. ئیتر دیاردەی وەك: (بەرتیل، گەندەڵی بیٚ سنوور، بیٚ بەڵێنیٚ، و بەد ڕەوشتی و نیشتیمان فرۆشی و ماستاوچیایەتی و خۆویستی، ..) باو وەردەگریٚ و بناغەکانی کۆمەڵێش تێك دەرووخیٚ.. و ترسناك ترین چارەنووسە، ئەگەرچی لە رۆژئاوا ئەو قەیرانە تاڕادەیەك بەیاسا چارەسەر کراوە ،بەلام لە جیهانی ئیسلامی (کە یاسا سەروەری بەو پلەیەی رۆژئاوا نیە)ئەو قەیرانە زیۆر زەق بوویتەوە.

## قەیرانی حەفتەم :

ئەگەر بەرژەوەندی میللەت یان نیشتیمان یان مەبادیئەکان لەگەڵ بەرژەوەندی سەرکردەی حزبەکان (یان سەرۆکی وولاتان) تێك گیرا ئەوا یەکسەر دووەمیان سەرکەتوە، ئەوەش سەرچاوەی گشت دیاردە دزێوەکانە و پێوانەکانیش وەردەگەڕێن (ئامراز بۆ ئامانج)، (وەختی بۆ دائیم)، (خائین بۆ جیێی دڵسۆزی)، (پێش کەوتن بۆ پاش کەوتن)، (نیشتمانی بۆ بەرژەوەندی)، (مەبادیئی بۆ گیرفان)..

## قەیرانی هەشتەم:

لە هەمووی ترسناك تر ئەو مەدرەسە و حزب و لایەنانـە خـودی خۆیـان لەسـەر بنچینەی گەشەی فاکتـەرە کۆمەڵایەتیـەکان بـۆ فاکتـەرە ئایدیۆلـۆژیـەکان دروسـت دەبن.. کەچی ئێستا ئەوان لەو فاکتەرە گەلێ لاوازن، بۆیـە ناچـار بگەرێنـەوە سـەر فاکتەرە کلاسیکی و کۆمەڵایەتیەکان، ئەو کاتیش ناکۆك دەبن هەم لەگـەڵ واقیعـی کۆمەڵایەتی و سەردەم و هەم لەگەڵ دروشمەکانی خۆیان لە پێـك هێنـانی سیسـتەمی دیموکراسی و مەدەنیەت .

## قەیرانی نۆیەم:

قەیرانی ناسنامەیە ئەو قەیرانانە رۆژ بە رۆژ لەگەڵ ڕەوتی مێژوو بە خێراتر زیاد دەکات، هێشتا خانەی ڕاستەقینەی لەو دابەشیەی جیهانیش نەزانیە لە کوێیە (سەروو یان خواروو)، شارستانی ئیسلامیە یان شارستانیەکانی ترە، تیرۆرستە یان لە بەرەی دژی تیرۆرە! سەرنج بدە ئێستا هەموو وڵاتانی عەرەبی و موسڵمان نشین کە هاوکاری ئەمریکا بوون ئێستا لە ژێر هەڕەشەی ئەون، ئینجا زانا و بیریارە عەلمانیەکانیش.. نازانن ئینتیمای شارستانیان کامەیە هەر بە نموونە (گە حسین) دەڵێ: (شارستانی عەرەب و فەرەنسا یەکن لە کۆتاییدا سەر بە شارستانی یۆنانی لاتینین)، لەبەر ئەوەی عەلمانیەت ناسنامە و کەلتوری دەرەکیە، بۆیە ناچار لەدژی ڕابردوو و کەلتوور و فەرهەنگی میللـەتەکانیان بن، عەلمانیەتی ئێستا شێوەیەکە لە جەوهەری هیلنسیتی کۆن.

## قەیرانی دەیەم:

بیروباوەڕە گەردوونی و مرۆڤایەتی و ئاینیان تێك ئالاوە، بەتایبەتی لەدوای گەشەی زانستی سوڕانەوەی بەرەو ڕاستیەکانی قورئان ئەو بیروبۆچوونە عەلمانیانەی وەك :مادیەت لە فلسفە، گەردوونی بێ کۆتای، تیۆرەکانی پەرەسەندن و...هتد. لەباریەك هەلوەشاندەوە، بۆیە ئێستا بەلێنەکەی (جان کوریس) هاتەدی کە لە کتێبی (حقیقه العالم الملموس) باسی کردبوو وتبووی من تا لەقوڕاوی بنی گەردوون نەگەم ناچمە ناو سیاسەت. بەو پێیە ئێستا عەلمانیەت کە دەچێتە ناو زانستی نوێ لە جوغزی عەلمانی دەردەچێ و پالێ دەدا بۆ لای ئیسلامی.. بۆیە بەشی زۆری بنەما فیکریەکانی عەلمانی لەگەلٚ زانستی نوێ تێك دەگیرێ.

## قەیرانی یازدەم:

دارمانی شیوعیەت بووە هۆی دارمانی بنەماکانی عەلمانیش، ئێستا حزبە عەلمانی و دەسەلاتی عەلمانی مەبادیئو و بەهایەکی وای نەماوە پەیوەستی ناسنامە ودیواری فیکری پێ دروست بکا، بۆیە تەنها دەتوانی بە بەرژەوەندی مادی خەلکی کۆ بکاتەوە کە ترسناك ترین هۆکارە بۆ کۆمەلگە، هەر ئەو فاکتەرەشە سەرچاوەی دەسەلات بازی و دیکتاتۆریەت و براکوژی و هەتا ولات فرۆشیشە ، بۆیە عەلمانیەتی جیهانی سێ یەم (بەتایبەتی عەرەبی )هەردەبێ دژی پێشکەوتن و عەقلانیەت و دیموکراسی و ئازادی و وشیاری و مەدەنیەت و دادگەری بێت، ئەگینا گۆڕ بۆخۆی هەلدەکەنێ، بۆیە دەبینین لە هەر شوێنێك کەمێك ئازادی هەبووبێ عەلمانیەکان پاشە کشە دەکەن و تەیاری نیشتمانی وئیسلامیەکان گۆڕەپان داگیر دەکەن، هەروەك بینرا لە: جەزائیر، ئەردەن، تورکیا، یەمەن، لوبنان، فەلەستین، تاجیکستان، .. وا ئێستاش

دەبینرێ لە مەغریب، تورکیا، پاکستان، بەحرەین، ئەندۆنیسیا و مالیزیاو هەتا لەو دۆخە ناسروشتیەی سۆمالیش، زۆری تریش بەرێوەیە. هەڵبژاردنەکانی عێراقیش ٢٠٠٤ لەژێر سایەی داگیرکاریش بوو هەر ئیسلامیەکان زۆرینەی دەنگیان هێنا.

قەیرانی دوازدەم:

(قەیرانی نیشتمانپەروەری)زیاتری لەسەر دەوەستین بەسەردێرێکی تایبەت .

## رزگاری نیشتمانی و ئایدیۆلۆجیای عەلمانی

ئەزمونی مێژوویەکانیش بەهاوار پێمان دەڵێن ئەوانەی وولات فرۆشن ئاین و مەبادیئو ئایدیۆلۆژیان نیەو نەبوە، (ولید بن یزید)یەکێك لە خەلیفەکانی ئەمەویەو باوەڕی بەخوداو قورئان وزیندووبوونەوە نەبوە [١]، چی بەسەر نیشتمان هێناوە؟ خوراسانی فرۆشتە (نصر بن سیار)، ولایەتیکی تری بە(یوسف بن عمر )بە والی و کارمەندەوە فرۆشت، ئیتحادیەکانی عوسمانی(لەدوای ١٩٠٨) وعەرەبی کەنداو فەلەستینیان فرۆشتە یەهودیەکان بە دوو سینی لیرەی زێڕ[٢]، لیبیایان فرۆشتە ئیتالیا بە دوو بەلەمی سەربازی [٣]، ڕووباری دیجلەیان فرۆشتە ئینکلیز بە ٢٥٠٠٠٠لیرە[٤]، شیخەکانی کەنداو مووچەی مانگانەیان بە زێڕ هەبوو لەبەرامبەر فرۆشتنی وولات.

گۆڤاری(شۆون خارجيە) لە لندن دەردەچوو لە کانونی دوەمی ١٩٢٧ز زانیاریەکیووردی بەناوی (امراء العرب وداوتنغ بسكريت) ناوی هەریەکە لە ئەمیرە عەرەبەکان وموچەی سالانەی ئاشکراکرد بەوشێوەیە :﴿١- ابن السعود ١٠٠,٠٠٠ جنيه، ٢- الملك حسين- شريف مكة- ١٠٠,٠٠٠ جنيه، ٣- فهد الهذال ١٤٠,٠٠٠ ربية، السيد الأدريسي ١٢,٠٠٠ليرة..﴾٥. ئەزمونی مێژوویەکانیش بەهاوار پێمان دەڵێن ئەوانەی وولات فرۆشن ئاین و مەبادیئو ئایدیۆلۆژیان نیەو نەبوە، (ولید بن یزید)یەکێك لە خەلیفەکانی ئەمەویەو باوەڕی

---

[١] د محمد عمارة-المعتزلة والثورة ص٧٢-٧٣

[٢] - اليهود والدولة العثمانية.. ص٢٢٩

[٣] يقول جوليتي- رئيس الحكومة الإيطالية عام١٩١١م عن حكومة الإتحاديين: لقد طلبوا منا اذا كانت ايطاليا مستعدة للتنازل لصالح تركيا كتعويض لها عن ضياع ليبيا، عن سفينتين من أحسن سفن اسطولها.(الباحث- الإسلام والعلمانية واثرهما على نشأة الدولة العراقية الحديثة ص٧٩)

[٤] عباس العزاوي- العراق بين الأحتلالين-.. ج٨- ص١٨٦

[٥] عبدالرزاق الحسنى - تأريخ الوزارات العراقية -دارالشؤون الثقافة العامة -بغداد ١٩٨٨م ج١ص٩٢ هەروەها د.على الوردى – لمحات.. ج٥ ص٣٧ هەروەها (الإسلام والعلمانية واثرهما على نشأة الدولة العراقية الحديثة ص٧٩

بەخوداو قورئان وزیندووبوونەوە نەبوە [١]، چی بەسەر نیشتمان هێناوە؟ خوراسانی فرۆشتە (نصر بن سیار)، ولایەتیکی تری بە(یوسف بن عمر )بە والی و کارمەندەوە فرۆشت، ئیتحادیەکانی عوسمانی(لەدوای ١٩٠٨) وعەرەبی کەنداو فەلەستینیان فرۆشتە یەهودیەکان بە دوو سینی لیرەی زێر[٢]، لیبیایان فرۆشتە ئیتالیا بە دوو بەلەمی سەربازی دوای بەلەمەکانیشی پێنەدان[٣]، ڕووباری دیجلەیان فرۆشتە ئینکلیز بە ٢٥٠٠٠٠لیرە[٤]، شیخەکانی کەنداو مووچەی مانگانەیان بە زیڕ هەبوو لەبەرامبەر فرۆشتنی وولات. ..هەروەها ئەوچاکەیەی بنەماڵەی (الشریف حسین بن علی) بۆ هێزەکانی هاوپەیمانان لەدژی عوسمانی کردیان، بەتایبەتی ئەو کارە دەگمەنەیان کەلە ١٩١٦ قودسیان لەدەست ئیسلام دەرهێناو کەوتە ژێر دەستی بەریتانی و لەوکاتیەوە قودس ڕۆیشت، لەو پاداشتەدا مەلەکی بەریتانی شافەیسەلیان بە (وسام النصر) و (صلیب الحرب مع النحل) خەلات کرد[٥]، ئەوکاتی هەر ولاتێك بۆ سەرۆك یان مەلیکێکی عەرەبی دیاری بکرابایە دەبوایە پالپشتێك لەلای ڕێکخراوی زایۆنی بهێنێت، لەسەر ئەو بنچینەیە(شکری غنام)سەرۆکی وەفدی سوری لە١٩١٩لەبەرامبەر کۆمیتەی ئاشتی ڕێککەوت لەگەل نوێنەری ئاژانسی زایۆن بۆ ئەوەی یەهودیەکان بتوانن بێ ڕێگری بۆفلستین کۆچ بکەن تادەبنە زۆرایەتی حوکمیشی دەگرنە بەر،لەدۆسیەکانی وەزارەتی دەرەوەی فرنسا بەلگەنامەیەك دۆزرایەوە بە ژ:٣٥٤٧ ی ڕۆژی ١٥/ ٦/ ١٩٣٦تیایدا کۆمەلێك سەرکردەی عربی ئەو وولاتە داوا لە فرنسادەکەن هەر لەسوریا بمێنێتەوە ، لەو ناوانەی تیای بوە ( سلیمان الأسد ومحمد سلیمان الأحمد ومحمود أغا جدید وعزیز أغا هواش وسلیمان

[١] د محمد عمارة-المعتزلة والثورة ص٧٢-٧٣
[٢] - الیهود والدولة العثمانیة.. ص٢٢٩
[٣] .(الباحث- الإسلام والعلمانیة واثرهما علی نشأة الدولة العراقیة الحدیثة ص٧٩)
[٤] عباس العزاوي- العراق بین الأحتلالین-.. ج٨- ص١٨٦
[٥] هەمان س ص١٢٢

المرشد ومحمد بك جنيد ..) ، بەهەمان ئاڕستە مەلیك فەیسەل لە ١٩١٩/٥/٣ ڕێکەوتنێکی لەگەل (حایم وایزمان) مۆر کرد پێکهاتبو لە ٩مادە[١]،لەهەوان ڕاشکاوانە تر دروست کردنی ئوردەن بوو بەرامبەر پشتیوانی لە ئیسرائیلی داهاتوو ،دروست تر بلین ئەو ولاتانە لە بنەچە بۆ دژی یەکیتی عەرەب وبۆ پاریزگاری ئیسرائیل دروست بووینە، لەدوا هیرش ئیسرائیلیش بۆ سەر غزە لە (٢٠٠٩) ولاتانی ئوردن و میسرو سعودیە و دەسەلاتی فلستین لایەنگیری ئیسرائیلیان کرد، تائەو ساتەش ئابلوقە خراوەتە سەر فلستین لەلایەن عەرەب خۆی.. پۆل بریمەر دەڵێ سەرۆك عەشیرەتێکی عەرەب پێی ووتم عیراق چاك نابێ واچاکە ئێوە بیکەنە ویلایەتی ژمارە (٥٣)ی ئەمریکا[٢]،

ئەو دۆخە بۆ کۆمەڵگەیەکی بێ دەوڵەت و یاسا بەتایبەتی بۆ ئەو میللەتانەی لە فەترەی گواستنەوەن یان لەفەترەی ڕزگاری نیشتیمانین (کە دەوڵەتیان نیە) یەکجار زۆرتر پێویستیان بە ئایین و ئەخلاق و ئایدۆلۆژیا هەیە، بۆئەوەی بەدیل بێت بۆ حکومەت و یاسا و پۆلیس و زیندانی بتوانی پەیوەندی کۆمەڵایەتی وژێرخانەکەی بپارێزی، ئەو فاکتەرانە لەو قۆناغە دەبنە ڕێگری هەرە گەورە تا خۆویستی و خۆفرۆشی و گەندەڵی و..... دروست نەبێ، لەو قۆناغە کۆمەڵگە پێویستی بە هاریکاری و تەبایی و ئۆقرە و گیانی بەرگری هەیە.

لەو قۆناغی رزگاری نیشتمانی کۆمەڵگە پێویستی بە هاریکاری و تەبایی و ئۆقرە و گیانی بەرگری هەیە، ئەوەش بە ڕوونی لە ئامۆژگاریە بەناوبانگەکانی میکاڤیلی(١٤٦٩-١٥٤٧)بۆ دەسەلاتدارە داگیرکەرەکان دەردەکەوێ کە

[٥٦]- دەقی ریکەوتنەکە بە ئینکلیزی وبە عربی لای نوسەر پاریزراوە .

[٢] بول بريمر- عام قضية فى العراق ص٧١

لەیەکێکیان دەڵێ: بۆ ئەوەی (ئەمیر) زاڵ بێت بەسەر میلەت پێویستە میلەتەکە دوورخاتەوە لە ئەخلاق وئاین[1]، زۆر بە زەحمەت نمونەیەکمان دەست دەکەوێ میللەتێك لەژێر داگیرکاری رزگاریان بووبێ ئەگەریەکێ لەو سێ فاکتەرە (ئایین، ئەخلاق، ئایدۆلۆژیا)ی نەبووبێ، یان هەرسێك پێکەوە.

کاتێ ئەمیریکا لە (شاری ناکازاکی)دا وەزیری بەرگری یابان لە وەڵامی پرسیاری ئاخۆ ئەگەر ئێوە چەکی ئەتۆمیتان هەبوایە لە ئەمریکاتان دەداوە؟ لە وەڵامدا وتی: ئەگەر چەکی ئەتۆمیمان هەبوایە پێویستی نەبوو بەکاری بهێنین لەبەر ئەوەی ئەمریکا نەیدەتوانی لێمان بدا، جا لێرەشدا ئەگەر میللەتێك (ئایین و ئەخلاق و ئایدۆلۆژیا)ی پتەوی هەبووبێ،فەیلەسوف وزاناو پیتۆلی هەبێت هەر لە ئەسلدا داگیر ناکرێ، ناچێتە چوارچێوەی نەخشەی داگیرکەران.

لە چوار چێوەی پرۆژەی(ارض بلا شعب لشعب بلا ارض) کە لەکۆنگرەی لندن ١٨٤٠ درایە بارمستونی سەرۆك وەزیرانی بریتانیا بەدوای وولاتیك گەڕان بۆ یەهودیەکان، سێ شوینیان بینیەوە (ئەمریکای لاتینی، هەندێ ناوچەی ئەفریقا کینیا لەوانە، هاتنە خوارووی بەغدا بۆ ناوچەی ئۆر)کە میلەتیان لێ لاوازە.

لە پرۆتۆکۆلەکانی یەهود ڕوون تر باس کراوە لە پرۆتۆکۆلی(١١) دەڵێ تا بتوانین زاڵ بین بەسەریانا دەبێ (ان الأممين -غير اليهود- كقطيع من الغنم، وأننا الذئاب، فهل تعلمون ما تفعل الغنم حينما تنفذ الذئاب إلى الحظيرة؟ انها لتغمض عيونها عن كل شيء) لە برۆتۆکۆلی ١٠ باس لە تیك شکاندنی ژیرخانی خیزانی دەکا (فسوف ندمر الحياة الأسرية بين الأمميين، تفسد أهميتها التربوية)[2]، هەولی داوە جۆری سیاسەتەکە میکافیلیانە بێت وەك لە پرۆتۆکۆلی یەکەمی باسی دەکا بۆ ئەوەی

---

[1] نيقولا مكيافيلي — الأمير-تعليق:موسوليني-ترجمة:خيري حمادي ص١٥٠

[2] بروتوكولات حكماءالصهيون- ترجمة :عباس محمود العقاد ط٥ ١٩٨٠بروتوكول رقم:(١٠، ١١).

[3] مدخل الى الفلسفة ص٤٧، ٤٩

پەیوەندی زانستی سیاسیش بە میلەت لاواز بکاو داگیرکاریەکەی بە ئاسانی بچەسپێ، مەبەستی نیشتیمانی بێ میللەت ئەوە نەبوو دەوڵەتێکی یەهودی لە پانتاییەکی جوگرافی بێ دانیشتوان دروست بکات، بەڵکو مەبەستی دانیشتوانێکی بێ (مەبدەئی) و (سیستەم) و (ئایین) و قەتیس بەستوو لەژێر کاریگەری فاکتەرە ستونیە کۆمەڵایەتیەکانە، لاوازی میلەت مانای لاوازی ژێرخان نەك کەمی ژمارەیان، لەمێژووشدا تا ئەو ساتە زۆر بەدەگمەن بینیومانە میللەتێك پەیوەندیەکانی نێوان میللەت و نیشتیمان و دەسەڵاتی سیاسی باڵای هەبووبێ و داگیرکرابێ، میللەتێکی مەدەنی (ئومە) داگیرکرابێ، شەڕی نێوان دوو ئیمپراتۆر و جەنگی جیهانیەکان لەسەر ئەو جۆرە میللەتە بوە کە لاوازن وەك چۆن دڕندە نیچیری نەخۆش وگەوج یان ساوا هەڵدەبژێرن، هەردەم داگیرکار چاوی بڕیوەتە خاکی ئەو میللەتانەی پێنەگەیشتوون، وەك لە کۆنگرەکانی سایکس پیکۆ وسان ڕیمۆ.. ڕوون تر دەردەکەوێ. دابەشی ئینتدابی ساڵی ١٩٢٠ بەپێی مادەی (٢٢)ی عوسبەتولئومەم بۆ پلەکانی (a،b،c) باشترین بەڵگەیە.

ئیمپراتۆر و داگیرکەران لە کۆنەوە پێش ئەوەی بەرەو هەر وڵاتێك بهاتبانایە بانگی جوگرافی ناسی و کۆمەڵناسی و زانا و فەیلەسوفانیان دەکرد، یان هەر لەگەڵ لەشکرەکان بەڕێ دەکەوتن تاهەم سروشتی خاکەکە بزانن (بەمەبەستی عسکری) سروشتی میلەتەکەش(بەمەبەستی سیاسی)، بۆیە ئاساییە ڕای ئەو جۆرە فەیلەسوف و زانایانەی مونەزیری داگیرکەر زیاتر بەلای ئایدیۆلۆجیای عەلمانیدایە، هەر بەنمونە لە مێژوودا یەکەم زانا کە هەوڵی جیاکردنەوەی ئایین و سیاسەتی داوە سینکا(٤-٦٥م) فەیلەسوفی بیبڕوای ڕۆم بووە[1]، بەهەمان شێوە فەیلەسوفی یۆنانی کۆن (هرکلیت) کەباوکی ئایدیۆلۆجی عەلمانی هەژماردەکرێت زیاتر لایەنگیری دەسەلات بووینە،

[1] موسوعة علم الإجتماع ص٣٣٩

زینۆن(٣٠٠ پ.ز) بۆ پاپای ئەسینا، مارکۆس ئۆلیتۆس وئیکتیپۆس(٦٠-١٢٠) بە نۆکەری ئیمپراتۆر بە ناوبانگ بوو..بە هەمان شێوە ئەرستۆ هۆبز و وماکیاڤیلی..، ئەرستۆش لە خزمەت داگیرکەرێکی وەك فیلیپی مەقدونی بوە[1]، دوایش بوە فەیلەسفی رەسمی ئیمپراتۆریەت وماموستای ئەسکەندەری مەقدۆنی مونەزیری دەولەتی بەندایەتی بوو، میکاڤیلی بۆ بنەمالەی حوکومداری مدیتچی وئاواش لاپلاس وهۆبز و... زانای هۆلەندی هۆگۆ گرۆتیۆس(١٥٨٣-١٦٤٥)بە دامەزرینەری یاسای دەولی وسیستەمی عەلمانی هەژمار دەکریٚ کەچی لایەنگری کۆیلەداری بوە.

هەڵمەتەکان بۆسەر جیهانی ئیسلامی بەهەمان شێوە دەست پیٚ دەکا، یەکەم جار هەولیان داوە ئاینیان لاوازبکا، ( لورنس براون) دەڵیٚ گەورەترین دیوار لە پیش داگیرکار وئیستعمار ئاینە[2]، سەرکردەی پورتوگالی لە١٥١٥ز لە ژێر دروشمی (گرد المسلمین وأخماد النار المحمدیه الی الّبد) بەرەو جیهانی ئیسلامی هات، کلادستونی سەرۆك وەزیرانی بریتانیا دەڵیٚ: مادام هذا القرأن فی أیدی المسلمین یتدارسونه ویقبلون علی العنایة، لن تقوم لنا قائمة، فلا بد العمل علی انتزاع هذا الکتاب من عقولهم وقلوبهم)) دەڵێت ناتوانین جیهانی ئیسلامی داگیربکەین تا (قورئان) یان لەنێو دورنەخەینەوە[3]،لە ناو پەرلەمانی فرنسا پەرلەمانتاریك هەستا ووتی(القرأن هوالذی یحرض المسلمین اذایة الفرنسیین)٤ فەلسەفەی ئینتیداب و دابەش و دیزاینی جیهانی ئیسلامی بەگشتی و رۆژهەلاٚتی ناوەڕاست بەپێی مقاسیدی سایکس بیکۆ دروست کرا، یەکەم پێگەی (بەمورتاحی) ئیستیعمار لەجیهانی عەرەبی حیجاز بوە کە یەکەم پرۆسەی لێك جیاکردنەوەی ئایین لە دەسەلاٚتی ئەنجامدرا لەنێوان(محمد کوڕی

[1] سبینوزا-رسالة فی اللاهوت و السیاسة ص٢١١

[2] التبشیر والاستعمار ص ١٠٤.

[3] بنی مرجة- صحوة رجل المریض ص١٩٩

[4] ابن بادیس وعروبة الجزائر ص٤٠ .

عەبدولوەهاب)و(محمد کوڕی سعود) لەسالی ١٧٣٧ز ئاین بۆ یەکەم ودەسەلاتیش بۆ دوەم[١].

نمونەی شبلی شمیل(١٨٥٠-١٩١٧) وهەلویستی خراپی بەرامبەر ئاین ولەهەمان کات خراپی بەرامبەر نیشتمان نمونەیەکە بۆ بەشێکی زۆری سیکولاری کوردوعەرەب،ئەو پێی وابوو ئاین هۆکاری پەرتەوازەی میلەتانە،بۆیە داوایان دەکرلە ژیان وسیاسەت جیا بکرێتەوە ، لەگەل (سلامە موسا)ش پرۆژەی هاوبەشی تریان هەبوو ،کەچی ئەوانە لەلای میژوونوسانی عرب بە نانیشتمانی وەسف کراون ،بەتایبەتی لە کێشەی قەناتی سویس و پرسە عربیەکانی تر ، باهەر وانەزانین عەلمانیەتی بەرەی رۆژئاوا ئەو دەردەی هەبوە (عەلمانیەتی رۆژهەلاتیش)ئەو دەردەی لەجیهانی ئیسلامی هەبوو ،ڕاستە ئەو چینە عەلمانیەتە رۆلی گرنگیان بینی لە رزگاری بەلام بەخیرایی دەکەوتنەوە باریکی تری تەبەعیەت ، لای ئەوانە خەباتی رزگاری نیشتمانی داگیرکاربە(سانەوی)هەژمارکراوەو لە بەرامبەردا خەباتی پرۆلیتاریا دژی سەرمایەداری بە (ئەوەلی)هەژمارکراوە ، بۆیە بنەمای (تضحیة الجزء من أجل الکل) کە خەباتی رزگاری بە (جزء) و ڕووخانی سەرمایەداریش بە(کل) پۆلین کراوە ، هەلویستی نیشتمانی حزبە شیوعیەکان زۆر جار وەك هەلۆیستەکانی ئەزموونی حزبی شیوعی تونسی بوو کە لە سالی ١٩١٩وەك درێژکراوەی حزبی شیوعی فرنسی دروست کرا، فرنسا وئیتالیاش داگیرکەری ئەو ناوچانە بوون بۆیە حزبی شیوعی تونسی نەیتوانی ئەو دوو دۆخە بە سەلامەتی کۆ بکاتەوە، لە ئەنجاما کەوتە بەرەی فرنسی لەدژی بزوتنەوەی ڕزگاری خوازی تونسی، هەرچەندە لەسالی ١٩٣٤لە حزبی شیوعی فرنسی جیا بۆوە بەلآم ئەوپەلەیە لە کۆلْ میژووی ئەو حزبە نەبۆوە تا گەشە بکا، هەردیسان لەنیوان شیوعی ئیسرائیل جێی سەرنجە چونکە یەهود زۆر

[١] حرکة الأستقلال العربی ص١٢-١٣

دەمارگیرن،کەچی خودی حزبی شیوعی ئیسرائیل(راکاح)[1] زیاتر هەلوێستی ولاتـانی سۆشیالیستی دەگرتەبەر نەك حكومەتی ئیسرائیل وبنەمای زایۆن، لـە پـەیرەوی ئـەو حزبە زایۆنی بە ڕەگەزپەرست وەسف دەکرد، زیاتر لەوەش لـە کـۆنگرەی (١٦)ی جـەنگی حـوزەیرانی بـە دریـژکراوەی ئیسـتعمار وەسـف کـرد[2]،سـەربازگەی سۆشیالیستی وایان کرد لە ١٥/ئۆکتۆبەری ١٩٧٥ بڕیارِی (الصهیۆنیه شـکل مـن اشکال العنصریه)دەرچوو لە نەتەوە یەکگرتووەکان ، دوای لاوازبوونیان ئـەو بڕیـارە لەخولی (٣٠) ی کۆمەلەی گشتی ١٩٩٦ هەلوەشیندرایەوە ، زیاتر لەوانـە ،لـەو بارەیەوە با گوێ لە ڕای فهد(سکرتیری حزبی شیوعی عیراقی) ڕاگـرین لـە بـارەی هەر ڕەخنەیەك لە سەرکردایەتی ستالین و دەلێ: (ئەوەی ستالین دەیلێ ودەیکا هەر ئەرکی شیوعیەکانی سۆفیەتی نیە وەك ئەرکێکی موقـەدەس ودەق جێبـەجێی بکـەن بەلکو ئەرکی هەموو پرۆلیتاریای جیهانە پەیرەوی بکا)[3]، بەهـەمان شـێوە زۆر جـار حزبی شیوعی عیراق کەوتە هەلە بەرامبەر دۆزی کورد.

دەسەلاتی عوسمانیش لەدوای ئەوەی ڕێڕەوی سیکۆلاری کەوتە نێـو ئـەوجا بـوە دەولەتە نەخۆشەکە، رۆجی غارودی هەروەهاش مەکسیم رۆدنسن دەلێن ئیسـتعمار بۆ جیگیر بوونی خۆی لە وولاتـانی داگیرکـراو هـەولی یەکـەمی دەرکیشـانی ئـاین وکەلتوری ڕەسەنی ئەو میلەتە بـوە، بۆیـە تەبشـیری پیشـرەوی ئیسـتعمار بـوە..[4]،

---

[1] علی عزەت بیگۆفیچ لەکتیبەکەی (الاسلام بین الشرق والغرب) دەلیت سۆشیالیستی ویەهودیلەیەك سەرچاوە هاتوون، موسا هایس کاریگەریەی یەهودی بۆ مارکسیەت گواستۆتەوە (مارکس خۆشی یەهودی بە) .

[2] بۆ ئەو مەبەستە بڕوانە : اللقاء لماذا هوغیرممکن مع یسارفی اسرائیل-محمداسماعیل نصیف ص٦٧-٦٨ هەروەها بڕوانە دەقی (مقررات المؤتمر السادس عشر للحزب الشیوعی الاسرائیلی-راکاح- هەروەها ئەودەقانە لە مجلەی (الهدف) ژ:٢ بلاوبوویتەوە ،گۆڤاری هدف بەرەی فلستینی بەسەرۆکایەتی جۆرج حەبەش دەردەچوو .

[3] مؤلفات الرفیق فهد —حزب الشیوعی ولا إشتراکیة الدیموقراطیة ص٢٣

[4] روجیه غارودی-مارکسیة قرن عشرین ص١٤٩ وص١٩٥ هەروەها مکسیم رۆدنسن لە کتیبی (الإسلام والمارکسیه) ئەو باسە دەکات.

مەبەستی بنچینە تەبشیری گۆڕینی ئاینی داگیرکراو بوە بۆیە پیشەنگی داگیرکاری بوە [١]، (فرانتز فانون)دەڵێت : بەپێی ئەزموغان بۆ داگیرکاری ئەوارووبەڕووبونەوەمان لەگەڵ تەبشیری بۆ وولاتانی داگیرکراولەلایەن داگیرکەرەوە وەك قەلاچۆی میش ومەگەز پێویستە[٢].

تەنانەت داگیرکەر هەولی داوە ئاینیکی بەهێزو بەرگر بگۆڕێ بە ئاینیکی تری سادە، بۆیە هەولێ گۆڕینی دراوە، چونکە ئاینی ئیسلامی ڕاستەقینە هەرگیز ناشێت ونابێتە کەرەستەی هیچ داگیرکەرێك، دەبێت فتوحات وغەزاو هێنانی دەسکەوت وکەنیزەلەژێر دروشمی ئاینی جیاکەینەوە لەگەل خودی ئاین، جورج کامبل لە کتێبی (الأفرقا الإستوائية) لەگەڵ ڕای(جورج کارپنتر) هاوڕان ودەڵێن ئاینی ئیسلام رۆلی سەلبی نەبوە لەداگیرکاری، تەبشیری بە پێچەوانەی ئیسلام سەربەخۆیی نیشتمانی تێك شکاندوە لە ئەفریقا[٣]، سەرەڕای ئەوەش هیشتا ئاینێکی لاوازیش باشترە لە بێ ئاینی، ئەگەر بە وورردی سەرنج بدەینە مانەوەی گیانی بەرگری میلەتی کیبك لە کەنەدا دەبینین یەکێ لە هۆیە بنچینەییەکە ئەوەیە رۆحی ئاینیان هیشتۆتەوە وەك بەشیك لە سەربەخۆیی .

لە ئەزمونی ئەپارتایدی ئەفریقا ورۆدیسیای پیشوو سەرنج بدە ئەو تیمەی سپیەکان دژ بە رەشەکانیان دروست کردبوو بەناوی(عصابة التمساح) تا ژێرخانی میلەت داخوڕێنن بۆ ئەوەی بەرگریان نەمینی، هەول دەدرا بەهاو ئاینی ڕەسەنیان بتوینەوەو فەرهەنگی ئەوروپیان بەسەردا زال بکەن[٤]، لەوە زیاتر (فرانتزفانون)دەڵێت ئیمپریالیزم وداگیرکاری کەسێتی وسروشتی مرۆڤ تێك دەشێوینێ و عەقڵێشی

---

[١] هاری ماجدۆف- الإمبريالية من عصرالإستعمار الى اليوم ص٦٧
[٢] فرانتز فانون- معذبو الأرض، ت :جمال اتاسی ص١٧
[٣] عباس محمود عقاد- مايقال عن الإسلام ص٩١ هةروةها: جورج كامبل-الأفرقا الإستوائية ج٢ص٢٧٦
[٤] مايكل ريبون-النار السوداء(حرب العصابات فی روديسيا) ص٧٦-، ص١١٧.

دوادەخا[١]، بۆیە لـە بنەماکانی(تصـفیه الإسـتعمار) واهـاتوە:بۆ رزگـاری یـەکجاری پێویستە خۆت لـە هەمو ئاسەوارەکانی ئیستعمار رزگار بکەیت[٢]، لـەکاتێکائەرستۆ لـە چوارچێوەی تیڕوانینی بۆ میلـەتان مرۆڤی بە (حیوان ناگق) وهۆبز ونیتچەو لـەهـەمان ڕوانگەی ڕەگەزپەرسـتی مرۆڤیـان بـە گـورگ وەسـف کـردوە، کەچـی زۆربـەی فەیلەسوفانی رزگاری خواز مرۆڤیان بە (کائن متدین) وەسف کردوە، پێیـان وابـوە بەبێ ئاین کەسیتی مـرۆڤ تـەواو نـابێ[٣]، نمونەگـەلی زۆرە بۆمانـەوەی ئیسـتیعمار و داگیرکەر تەقەلای داوە ئەو هەنگاوانە بێنێتەدی:

١- میلـلەتی داگیرکراو گەشە نەکا بەرەو مەدەنیەت و ڕووناکی و شارەزایی.

٢- هەردەم دەیەوێ سیاسەتو ئاین ومەبادیئو گیانی نیشتمانی لیك جیا کاتەوە.

٣- یەکپارچـەیی و گیـانی هاریکـاری و زینـدەکی و هەسـت بـە ئـازادی و دیموکراسی نەکا.

٤- هەوڵدەدا پەیوەندی نێوان خاك و میللەت ومێژوو لاواز بکات.

٥- هەوڵدەدەن بەرژەوەنـدی تایبـەتی و خۆویسـتی زاڵ بکـەن بەسـەر هەسـت بەبەرپرسیاریەتی و بەرژەوەندی گشتی و خۆشەویستی خاك و نیشـتیمان و دژ بە زوڵم و زۆرداری.

٦- بۆهەموو ئەوانە هەوڵ لـەسەر کۆی ئەو هەنگاوانـە لـەسـەر چـاوەیەك دەکـا ئەویش تەقەلای لاوازکردنی ئایین و ئەخلاق و مەبدەئـە لـەناو ئـەو میلـلەتـە، لـەبەرامبەردا فەلسەفەی موڵحیدی بلاودەکاتەوە.

***　　***　　***　　***

---

[١] معذبو الأرض- ص٦.

[٢] عبدالكريم العبيدى - تصفية المصالح الإمبريالية الأمريكية ص٤٨

[٣] المعتقدات الدينية لدى الشعوب ص٧ بۆزیاترلەوبابەتەبروانە: إدوارد سعيد (الاستشراق والثقافة والإمبريالية - Orientalism 1978، Culture & Imperialism ,new york 1993).

لەکۆتایی ماوە بلێین ئەو جۆرەعەلمانیەتیە دیمەنێکی ناشرینی هەیە، خۆی بەستۆتەوە بەدەسەلات و سوپا و زیندانی ،ناچار خۆی بەستۆتەوە بەزل هێزانی جیهان، ئەگەر تەنگاو بیت زۆر بەسانایی دەست بۆ دوژمنانی میللەتەکەی دەبا ولە دژی ئۆپۆزیسۆنی، ئیستا دۆستەکانی رۆژئاوا زۆربەی لایەنە عەلمانیە دیکتاتۆریەکانن، بۆیە رۆژئاوا ئەودیموکراسیەی بۆخۆی دەوێ بەو ئەندازە بۆ جیهانی ئیسلامی (بەتایبەتی جیهانی عەرەبی) دیموکراتخوازنیە .

## سێیەم : زیانی عەلمانی بۆ کوردستان:

هەلبەتە ئەو ئەرێنیانەی عەلمانی (کەلەسەروو باس کرا) وەبەر کوردیش دەکەوێ ، پێویست بەدووبارەکردنەوە ناکات ، ئینجا نیشتمانپەروەریەکی زۆریش لەناو عەلمانی کورد هەبوە ،بەتایبەتی قۆناغی نوێی شۆڕش ئەوان زیاتر ئەو بەرپرسیاریەتەیان هەلگرت ،ئیسلامیەکان بەو ئاستە نەچوونە ژێر بالی قورسی بزوتنەوەی کوردایەتی،بەدرەنگەوە ئەوانیش بەشداری دەکەن..هەمو ئەوانە نابێت وامان لێبکات کەمتەر خەم بین لە هەلسەنگاندن وئەو زیانە ئۆتۆماتیکیانەی عەلمانی بەکوردی گەیاندوە .

خەلکی کوردستان ئەو هەمو زیانەی بەردەکەوێ (کە لەسەروو باس کران) ،لەگەل زیانێکی سەرباری تریش ئەویش زیانی نیشتمانی و دابەش وبێبەشی کوردستانە ، واتە زیانەکان ئاوێتەن لە چەندین لاوە دێت، بەکورتی بەشی زۆری ئەزمونی عەلمانی لە جیهانی ئیسلامی ولەکوردستانیش بەو شێوەیە بوە: ﴿١- لەڕووی ئابووری – گرانی٢- لەڕووی‌ئیداری- گەندەلی٣- لەڕووی کومەلایەتی –وێرانی بەها و ئەخلاق وبەرتەوازەیی٤- لەڕووی‌زانستی –دواکەوتووی ٥- لەڕووی فەرهەنگی- لاسایی کردنەوەی بیٚ داهینان(تقزم الیقافی)٦- لەڕووی سیاسی – میکافیلیەت

٧- لەڕووی‌حوکم رانیەوە- دیکتاتوریەت ٨- لەڕووی پەیوەندی -کراهیەت٩- لەڕووی نیشتمانیەوە- بێ ئینتمایی (واتە هەلوەشاندنەوەی کوردایەتی )...﴾ کەواتە زیانەکان فرەئارِستەن ، وادەکەن دوو جۆرە زیان وقەیران دروست بکا ،بەشێکیان دوورخایەن وناراستەوخۆیە ، ،بەشێکیان خێراو دەماودەست وراستەوخۆو بەرچاون کە بەکورنی ئەوانەن :

١-تیکچوونی رێزی نیشتمانی - هەر ئەویشە بوویتە هۆی ئەو هەموو دووبەرەکی و شەڕی برا کوژی و تێکدانی رێزی کورد. بزوتنەوەی کوردایەتی تا زانای ئایینی سەرپەرشتی کردووە لەجیاتی ئایدیۆلۆژیای عەلمانی ئەوا میللـەت یەك پارچەو بەهاریکار و کەم (خائین و گیرفان پرکەر) بووە، بەلاّم دوای ئەو هاوکێشە وەرگەڕاوە بە پێچەوانەیی لەگەڵ بە عەلمانی کردنی ناوەڕۆکی کوردایەتی و سەرهەڵدانی سەرکردەی عەلمانی.
٢- ئەو مەدرەسە عەلمانیانە هەروەك لەڕووی دووەلی نەبووە پشتیوان بۆ کورد، لەڕووی ناوەخۆش تەنها بوونە ماندووکردنی شۆڕش و کوردایەتیەکە،لەوانە: لێکترازان، تۆمەت، ناکۆکی، شەڕی براکوژی، تەسك بیرکردنەوە، لاسایی کردنەوە، داڕووخانی بینای ڕەوشتی کوردەواری،... لە کۆتاییدا ئەو دیاردە دزێوانەی پەیداکرد: بێئەمەکی، بێ متمانەیی، دزی، تالاّن، دیل کوژی، خیانەت، جاشایەتی، بوونە بەعسی، بوونە عەرەب و تورکمان، مەبدء فرۆشی، لایەنگیری سەرکەوتوو، ناهەقی، فێلّبازی،...ئیتر ئەوکولەگە بە هێزانەن بۆپەیدا کردنی ئەو گەندەلّیە وێرانکەریە،هەرە دواییەکەش لە کورتی دانی گیانی بەرگری و شەرە دەسەلاّتیکی بە زەقی و کانتۆنیایەتی.
٣- هەر ئەویشە بە ناڕاستەوخۆ بووە هۆی ئەو هەموو نیشتمانفرۆشیە دروست بێت.

٤- لەگەڵ پەیدابوونی عەلمانیەت مەینەتی کوردیش بە هەموو ئاڕاستەیەك دروست بووە.بەڕێکەوت نەبوو لەگەڵ سەرهەڵدانی ئەو مەدرەسە عەلمانیەتە لە ناوچەکەو لە کوردستان مەینەتی کوردیش سەری هەڵدا لە پەیمانی سایکس پیکۆ ١٩١٦ تا جەزائیر ١٩٧٥ و تا ئێستاش، بەردەوامیەکەشی لەگەڵ بەردەوامی عەلمانیەتە، ئێستا کە ئاسۆی ئاوابوونی عەلمانیەت دەرکەوت، ئاسۆی ئومێدی سەرکەوتنی کوردیش تارادەیەك دەرکەوتووە.

٥- هەر ئەو مەدرەسانەن بوونە هۆی لێ تێکەڵبوونی هەریەکە لە (پشتیوان، دۆست، بێلایەن، ناحەز، دوژمن) لە ئیقلیمی و دەولی و هەندێ جاریش تەواو پێچەوانە.

٦- لە کۆی ئەزموونەکان، بەتایبەتی عەلمانیەتی نوێ تا ئەو ساتەش، ئەگەر وا هەڵکەوتبێ بەرژەوەندی نیشتمان و بەرژەوەندی حزبایەتیەکەی ناکۆك بن ئەوا هەردەم نیشتمانیەکە ژێرکەوتووە.

٧- نەبوونی ستراتیژیەتێك بەدیدێکی قوڵ و هەمەلایەن و چارەنوس ساز.

٨- لەبارەی ئێستایاندا هەمووی گوایە دیموکراسین، کەچی تا ئێستا دەستگۆڕی دەسەڵات لەناو خودی حزبەکە نیەو بواری هەموو ڕەخنەیەکیش لە سەرۆکەکە نیە.

٩- دیاردەی لاسایی کردنەوەو هێنانی نەریت و شەریعەتی هەندەران، سەردەمێك ئەو زاراوانە باوی بوو (پرۆلیتاریا، حتمیە تاریخیە، ئیمپریالیزم، دیالیکتیك، ڕەجعیەت، برجوازی، بەکرێگیراو، سەرمایەداری، دیکتاتۆری پرۆلیتاری، زەحمەتکێش، صراع گبقی).. ئێستا بێ هیچ بنچینەیەکی کوردانە گۆڕاوە بۆ (دیموکراسی، مافی مرۆڤ، دژەتیرۆر، ئاشتی، دیالۆك...) .

١٠- گوایە ئەو مەدرەسانە بۆ ئەو مەبەستەن ناوەرۆکی شۆڕشی کورد لە خێڵەکی و بێسەروبەری و بێنەخشەیی ڕزگار بکات کەچی تەنها ناوەکان گۆڕاون، ئاغە نەما بەڵام بەشێوەیەکی توندتر دروست بۆوە، بۆیە لە نوێترین کتێب (دیفید ماکدۆیل)[١] دەڵێت: شۆڕشی کوردیش سەرباری ئاغەی جاران ئاغەی نوێشی دروست کرد، مەبەستی بەرپرسەکانە.

١١- عەلمانیەت هۆکارە بۆ تێك شێواندنی ڕەوشت و ناوبانگی پیاوەتی کورد. لەکۆتاییدا بەهۆی ئەو عەلمانیەتە توندە و بەپێی بنەمای (باکۆنین): (کل تحگیم للقائم هو الخیر لإنسانیه)[٢] ئەوە زۆربەی بناغە ڕەوشتیە کۆمەڵایەتیەکانی کوردەواری وێران کراو بەدیلیشی نەبووە بووە هۆی سەرچاوەی هەموو ئەو دیاردە دزێوانە.. بەتایبەتی جاشایەتی.

١٢- ئێستاش حزبە کوردستانیەکان لە کۆمەڵێك قەیرانی فکری و سیاسی و گەندەڵی ئیداری و میللی زۆر سەخت دان سەرەڕای قەیرانەکانی دووبەرەکی و نیشتمانی و ئیقلیمی و دەولی (کە لێرەدا بوار نیە باسی بکەین)، چارەنووسی ئەو حزبانە لەسەر ئەوسکەیە وێستگەکەی دیار و ئاشکرایە و بەرەو قەڵۆشیە، هەموو هەنگاوەکان ناکۆکە خۆبەخۆ، هەر لە نمونەیەکی دووردا عەلمانیەتی کوردستان وەك عەلمانیەتی زۆربەی وڵاتانی ئیسلام بەو تێڕوانینە سادەیان بۆ ئیسلام پاساوی تیۆرەکەی (صراع الحچارات) دەکەن کەچی خۆی بۆ ئامادە ناکەن و بەپێچەوانەوە هێشتا زیاتر داکۆکی لە (شارستانیەتی ڕۆژئاوا) دەکەن کە بەو گفتەیە بێت ڕۆژێك لەڕۆژان

---

[١] بە ئینگلیزیەوتەرجومە نەکراوە Amodern Historey of The Kurds-1995

[٢] **مبادیء الثورة** - ئەو کتیبەیە کەناوبانگی باکۆنینی پیێ دەرچوو تیایدا داوا دەکا دام ودەزگای ئیمپریالیزم هەلتەکینریێ بە چاکوخراپەوە، ریکخراوە تیرۆریستیەکانی وەك بادرماینهۆڤ وئەلویە ئەلحمرا و..لەو تیۆرە سەرچاوە دەگرن.

یەکتر دەهاڕن، عەلمانیەتی جیهانی ئیسلامیش لەسەر شارستانیەتی ئیسلام حیساب کراوە، واتە لایەنگیری شارستانیەکە کە سەرکەوتنی هەم نەمانی عەلمانیەتە ژێرکەوتنیشی هەر نەمانە، خۆی لەو ململانێیە خستۆتە خانەیەك لەشێوەی (قۆلّی پێنجەم).

١٣- بەگشتی فاکتەرەکانی ئایین و ئەخلاق و ئایدۆلۆژیا بەشێکە لەتەواوکەری کەسێتی، ئەوەش وادەکا کەسێکی لەرزۆك وڕاڕاو کرێگرتە نەبێ، بەبەرگری بێت بەتایبەتی بەرامبەر داگیرکاری.

١٤- لە ژێر سایەی عەلمانیەت هەرگیز هەموو کوردستان نەیەك دەخرێت و نە لایەنەکانیش یەك دەگرێت.

<u>داگیرکەران ئایدیۆلۆجیای عەلمانی لەکوردستان بلاو دەکەنەوە</u> : بۆ جوان تر تێگەیشتن لە زیانەکانی دەبێت وورد لە نەخشەو پلانی داگیرکەرانی کوردستان بگەین بزانین بۆ ئەوەی تەمەنی داگیرکاریان درێژکەنەوە چی دەکەن ، جگە لە هەلمەتی سەربازی و ئاسایش و داپلۆسین وزۆرلای ترکەبەرچاوە، کۆمەلێك تەقەلای تر دەدەن (کە پەیوەستە بە بابەتە کەمان)بەو شێوەیە :

١- هەولّی داوە ئایین لە کوردستان لاواز بکا... چ بە سوتاندن و وێرانکردنی مزگەوتەکان چ بەناشرینکردنی لە ڕێ ی ناوی ئاییینی لە پرۆسە عەسکەریەکانس دژ بە کورد.

٢- هەولیداوە شۆڕش و بزوتنەوەی کوردستان لە ئایین جیابکاتەوە ،بۆیەدەبینین یەکەم لێکجیاکردنەوەی ئایین لە سیاسەت ڕۆژنامەی (یەکێتی کورد) سەر بە بەریتانیا لە سلێمانی بانگیشەی بۆکرد.

٣- لە تەقەلای بێووچانە تافەرهەنگ و کەسایەتی کورد هەڵتەکێنێ. ..بەهۆی بەتەماح کردنی و خۆویستی و مادی بوونی و...

٤- هەوڵی داوە ئەو تەبایی و هاریکاری و ئەخلاقە کۆنەی کوردی لەناو ببا کە جاران ناوی قورەیشی عەجەم بوە... بەهۆی ناکۆکی خستنە ناویان و گواستنەوەیان لە شوێنی خۆیان و کۆکردنەوەیان لە کۆمەڵگە و دروستکردنی (فوج) بۆ هەر عەشیرەتێك بەناوی(افواج خفیفە) کە هەمان ناوە لەسەردەمی ئیتحادیەکانی عوسمانی لەدوای سالانی ١٩٠٨ بۆ کورد کرایەوە.

٥- لەکۆی ئەوانەش هەوڵی داوە پەیوەندی نێوان کوردستان و کورد لەیەکتر جیا بکاتەوە، پەیوەندی تاکی کوردیش بە (مێژوو و ئایین و فەرهەنگ و کورد و نیشتیمان) لێك بکاتەوە، تا ئینتیمای تاك بۆ میللەت و نیشتیمان لاواز بکا، کەسێکی یاخی و (لامنتمی) لێ دەرچێ..بەهۆی ژیاندنەوەی فاکتەرە ستونیەکانی عەشایری و بنەمالەیی ، تاکیش سەرقاڵ بکا بە ئارەزو بازی وباقی کارە لاوەکیەکانی تر.

کەواتە سەرەنجامێکی لۆجیکیە شۆڕشەکانی کوردچۆن دژ بە داگیرو دابەشی کوردستان بوە ئاواش دژ بە مولحیدی و عەلمانی بوینە، چونکە زانیویانە مەینەتی کورد هەم لە ئەستۆی عەلمانی دایە هەم عەلمانیەت وپرۆسەی دژ بەئاینی ڕیزی میلەتەکەت تێك دەدا، مەلا سلیم وشیخ عبدالسلام وئەوەی شێخ سعیدی پیران بە ڕوونتر لە دادگاییەکەی دەردەکەوێ کەلە گۆڤاری (گێرشەم)ی ئەوسەردەم بلاوکرایتەوەو دەڵێت: ئێمە دژی داگیرکەروعەلمانیەت شۆڕشمان کردوە، بەتایبەتی کەبینیم لە جەریدەی (سبیل الرشاد) عبداللە جودت واحمدناوێك نوسیبویان: موسا بە لەخۆبایی و عیسا بەناوبانگی و محمد بەئەمینی.. هەریەکە ئاینێکیان هێناوە، ئێمەش دەتوانین

ئاینێك بهێنین، ئەو جۆرە بانگێشانە لەرۆژنامەكان تەنیبۆوە ئێمەش شۆڕشمان دژ بەوانیش کرد[١].

## شێکردنەوەی یەکەم زیانی عەلمانی بۆکورد

لەبەر ئەوەی نەوەی یەکەمی عەلمانی کوردی زادەو هەلقولاوی بارە کۆمەلایەتیەکانی کوردەواری نەبوون ،زۆربەی خەلکانێك بوون لەدەرەوەی نەریتی کوردەواری دروست ببوون ،بۆیە زیانەکانیان زیاتر لە ئاستی نیشتمانی بوو نەك کۆمەلایەتی ، ئەوانە لە قۆناغێکی وەرچەرخان بوون ،هەندێکی دلسۆزیشی تێدا بوو بەلام قۆناغی داهاتوو لایان ڕوون نەبوو ،بۆیە کەوتنە هەلەی کوشندە،هەر لەلایەنگیریان بۆ هاتنی عەلمانیەت وئینجا ئیتحادوتەرەقی و ئینقلابەکەی ١٩٠٨ تا دەگاتە ململانێی ئەتاتورك وسولتانی عوسمانی ،خراتر لەوە عەلمانی کورد خۆیان نەخستە پال هاوپەیمانان ،چونکە ئەوان (رۆژئاواییە سەرکەوتوەکان لە جەنگی جیهانی یەکەم)شارەزا تر بوون ،ئەوان ئەو دیوی قۆناغی نوێیان لێدیار بوو ،ئەو میلەتانەی بە هۆی ئینتداب یان ڕێنمایی تر ئیستعماریان لە پشت بوو باش تر بوون لەوانەی بێپشتیوان بوون ، نەوەی یەکەمی عەلمانیەتی کورد لەو باوەرە دابون کە چارەنووسی کورد بەعەلمانی چاتر دەبی نەك ئیسلامی، لەسەر ئەو بنچینەیە لایەنگری ئەتاتورکیان کرد لە دژی سیڤەر و عوسمانی لە نێوان ١٩٢٠ تا ١٩٢٣، بۆیە لەنێو کوردیش بەوهۆیەوە بونە دوو بەش، لە ڕاستیدا سەرچاوەی بەشبونیان لەوەوە دێت ئاینیەکان بانگێشەی برایەتی تورك وکوردیان لە چوارچێوەی جامیعەی ئیسلامی دەکرد، لەو ڕووەشەوە ڕێکەوتنێکی باش لە نێوان وەفدی بالای کوردو عوسمانی مۆر کرابوو ،سولتان لەگەل کورد ڕێکەوت بۆ سەربەخۆیی پێدان ، دوای دوو وەفد پێك هات

---

[١] دەقی گفت وگۆی دادگاییەکە لە: دراسات فی الحرکة الکوردیة المعاصرة ص٥١٢- ٥٢٣

لە هەردوولا، نوێنەرانی کورد پێك هاتبوو لە: عبدالقادر شەمزینی (سەرۆك)، ئەمین عالی بدرخان، مراد بدرخان، مەولان زادە رفعت بەگ، لە لایەن نوێنەرانی عوسمانیش پێك هاتبوو لە: دووەمین کەسایەتی نێو عوسمانی شیخ الإسلام صبری زادە(سەرۆك)، ئەحمەد عبوق پاشا، عونی پاشا لە چوارچێوەی جامیعەی ئیسلامی .

لەسەر ڕەزامەندی هەردوولا سوڵتان قایل بو کە ئەو ڕێکەوتنە ببێتە بەڵگەنامەیەکی جهانی و بۆیە ناوەرۆکی ئەو ڕێکەوتنە لە١٩٢٠/٨/١٠ لەسیڤەریش بەرجەستەکرا، ئەگەر بەوردتریش بچینە نێو بابەتەکە دەبینین ئەو ناوەرۆکە یاسایی و سیاسیەی لە سیڤەر هاتووە، هەمان نەخشە و پلانی سەرکردە کوردەکانی ئەوسایە، بەتایبەتی شێخ عبدالقادری شەمزینی و ماڵی بەدرخانیەکان (ئەمین عالی بەدرخان)[1] کە بەداخەوە بەشێك بەشێوەیەکی تری لێ تێگەیشتوون، پێیان وایە ئەوە لە دەسکەوتی عەلمانیەتی کوردەو مانیعەکەی شیخ عبدالقادرو ئاینیەکانی تر بوە، ڕوونیان نەکردۆتەوە کە ئەو ڕێکەوتنە لە لایەن عوسمانی مۆرکراوە نەك کەمالیەکان، لەوانە مێژوونوسی کورد د.کەمال مەزهەر[2]، هەروەها بڕوانە نارازیەکانی تر لە (ل٧٦ی کتێبی مالمیسانژ: القومیه الکوردیه ود. عبدالله جودت)، هەروەها کریس کۆچیراش وای بۆچوە...بەلآم هەر هەمان کتێبی (د.کەمال) دەقی گفتوگۆیەکەی (شێخ عبدالقادر لەگەڵ ڕۆژنامەی (ئیقدام) تۆمارکردووە بەجوانی ئەوە ڕونکراوەتەوە کە شێخ عبدالقادر و ئاینیەکان چیان دەوێ، پێیان وابوو لە چوارچێوەی دەوڵەتی عوسمانی ئۆتۆنۆمی وەرگیرێ بۆ ماوەیەك وەری دەچەرخێننە سەربەخۆیی تەواوی کوردستان[3]، بۆ زیاتریش بڕوانە دەقی نامەکەی شێخ عبدالقادر بۆ فەڕەنسا کە لە ١٩٢٠/٦/٢٥

[1] ـ بڕوانە: (فایلی دوارۆژی کوردستان ـ بەریتانی) لە ل٨٢، (کوردوکوردستان لە بەڵگەنامەی بەریتانی ـ کەمال مەزهەر)

[2] ـ بڕوانە: (د.کەمال مظهر ـ کورد و کوردستان...) ل٧٦ .

[3] ـ بۆ ئەم مەبەستە بڕوانە کورد لە بەڵگەنامەی بەریتانیا ژمارە: ٤٠، f0.371/5068 بۆ وەزارەتی دەرەوە ١٩٢٠/٤/٨.

نوسیتی[١]، ئەو پرۆژەیە لەلایەن فرید پاشای سەرۆکوەزیرانی دەوڵەتی عوسمانی (ئەستەمبۆل ـ سوڵتان واحدالدین) بە فەرمی مۆرکراوە[٢]، دیڤید ماکدۆناڵدیش هەر وای بۆچوە لە کتێبەکەی خۆی و ئۆتۆنۆمی سەرەتای سەربەخۆیی بوە چ لە ڕێی ئینتداب چ لە ڕێی ئۆتۆنۆمی. لەبەڵگەنامەیەکی تریی بەریتانی (FO.371/5067) کە لە ل٣٢٦ی هەمان سەرچاوە هاتوە دەڵێ: فەریدپاشای سەدری ئەعزەمی عوسمانی لایەنگیری دروست بونی دەوڵەتی کوردی کردوە ، ئینجا دەبێ ئەوەش وەبیر بهێنینەوە کە(سوڵتانی عوسمانی وفرید پاشا) علی ئیحسان پاشایان ڕاسپارد بە بروسکەیەکی فەرمی لە ١٩١٩/١٠/٣٠ مومتەلەکاتی عوسمانیان تەسلیمی حکومەتی شێخ محمود کردو دانیشیان پێدا هێنا..

هەرچی ئەو بەشە عەلمانیە کوردە بوو بانگێشەی برایەتی کورد و تورکیان لە چوارچێوەی دەوڵەتی مۆدێرنی تورکیا بە سەرکردایەتی ئەتاتورك دەکرد[٣]، بە پێی بەڵگەنامە بەریتانیەکان کە لەسەر زاری(بیرترام دیکسۆن) وەرگیراوە لە سەرانسەری کوردستان لە هەڵچوون بووینە دژ بە ئیتحادی و زاڵکردنی تورکایەتی ودابەشی کوردستان، سەرجەم بە سەرکردایەتی ئەو (٦) سەرکردە ئاینیە بوە لەدوای ١٩٠٨ تا دوای جەنگ :( مەلا سلیم بدلیس، رشید ئاغەی سلێڤانی، عبدالرحمن شرناخی، شێخ نوری بریفکانی، شێخ عبدالسلام بارزانی، شیخ سعید الحفید)[٤] هەریەکە لە

---

[١]ـ کۆمەڵەڕێکخراوەکوردیەکان لەبەڵگەنامەکانی بەریتانیاوفرنسالەبەلگەنامەی ژ:٤٤ و ل١٥٩ بلاوکراوەتەوە .

[٢] د عثمات علی ـ دراسات فی الحرکة الکوردیة المعاصرة ص٣٢٥، هەروەها بڕوانە: بە لگەنامەی بریتانی Air512 تەلەگرام لە ١٩١٩/٤/١٨ .

[٣]ـ بۆ تێگەیشتن زیاتر بە ووردی مێژووی دعبدالله جودت بخوێنەوە لەکتێبی: (القومیە الکردیە ود عبدالله جودت خۆی بە نازناوی کوردی- تورکی ناوزەد کردووە.

[٤]ـ دراسات فی الحرکة الکوردیة المعاصرة ص١٥٤ .

شێخ عبدالقادر شمزینی و شریف پاشا[١]و شێخ سەعید پیران و نەورەسی و هەندێ لە بەدرخانیەکان و هەندێ دەستەی تری کوردی و ئایینیەکان[٢] . پێیان وابوو ئەوەی مستەفا ئەتاتورك دە یکا فرۆفێڵ و تاکتیکە و دەستکەوتەکانی کورد لە ئەستەمبۆل و پەیماننامەی سیڤەر هەڵدەوەشێنێتەوە[٣]، دوای ئەوەی عوسمانی بەرەو هەلوەشانەوە ڕۆیشت ئاینیەکان دروشمی سەربەخۆییان هەڵگرت، هەروەك لە ئەرشیفی وەزارەتی دەرەوەی بەریتانی یاداشتی (یانەی ناوەندی کوردستان) تێدایە لە بەرواری ١٩٢٠/٣/٢٠ داوای سەربەخۆیی تەواوی کوردستان دەکا ، بەشەکەی تر(لائیکیەکان) وەك لە بەڵگەنامەی بەریتانی لەلایەن جێگری مەندوبی سامی بەریتانی لە١٨/ مایس/١٩٢٠ ناردوە و دەڵێ (ناحەزانی سەید عبدالقادر) بریتین لە دەستەیەکی زۆر لەیەك نەچوو هی ئەوتۆیان تێدایە زۆر حەزیان لە سەربەخۆیی کورد نیە، زیاتر لەگەڵ ئەتاتورك ڕۆیشتون[٤]، بەشێکی تریش سیخوڕیان دەکرد وەك ئەو کۆمەڵە ڕەوشەنبیرە کوردەی لەدەوری (مێجەر سۆن) لە هەوڵی ئەوە بون بەریتانیا

---

[١]ـ بەشێك لەکوردە نیشتمان پەروەرو بیر تیژەکان زوو تر هەستیان بەوە کرد کەئەوەی ئەتاتورك دەیکا ماڵ وێرانیە بۆ کورد زوو لێی هەلگەڕانەوە ، شریف پاشا لە سەرەتا زۆر بەلای پرۆژەکانی ئاینی وئەستەمبۆل دا نەبوو دوای ئەو هەلویستەی وەرگرت کە بینی هادی پاشای نوێنەری سولتان ئامادەیە بچێتە سیڤەر لەسەر مافی تەواوی کوردستان مۆری بکا ، ئینجا لە ١٩٢٠/٤/٢٣شەریف پاشا بروسکەی ڕێزی بۆ سولتان لێدا لە بەرامبەر هەڵوێستی چاکی بەرامبەر کورد.

[٢]ـ دیڤید ماکدۆنال ناوی لەوانە نابوو کوردی ئەستەمبۆلی.

[٣]ـ بۆ وورد تر بڕوانە ئەو بەلگەنامەیەی بریتانی چۆن عبدالقادر شەمزینی ئامۆژگاری ئەفەندی وسەرۆك عەشیرەتەکان دەکا کە دوای ئەتاتورك نەکەون: مذكرة حول السيد عبدالقادر الشمزيني وسمكو

من المندوب السامي البريطاني / القسطنطينية (٢٠ مايس ١٩٢٢)

...... وأشتكى السيد عبدالقادر بأن كل المناشدات التي قدمها للحكومة صاحب الجلالة لم تلق آذاناً صاغية و أنه فشل في كسب ثقة جلالته. وكرّر، كما فعل ذلك عدة مرات، بأنه كان في موقع يساعده على السيطرة على الكرد في الولايات الشمالية الشرقية، لو أعطيت له الفرصة للتحرك. وأكد هذه المرة وبثقة على قدرته بإقناع سمكو للعمل وفق مصالحنا وأضاف أنه لا طائل من الاعتماد على أشخاص مثل مصطفى باشا وآخرين الذين يحومون هنا وهناك. هؤلاء ليس لهم تأثير حقيقي على الكرد.

[٤]ـ دەقی ئەوبەلگەنامەیە لە(ئیجابیەکانی سیڤەرـ دەقەکانی سیڤەر وخوێندنەوەیەکی تر) بلاّوکرایتەوە.

لە شێخ محمود بڕەنجێنن بەناوی ئەوەی شێخ ئاینیە[١]، (وەك لازاریف)دەڵێت: هەندێك لە بنەماڵەی بەدرخانیەکانیش (لائیکیەکانیان) خەریکی دانوستان بون لەگەل ئیتیحادیەکان داوای پارچە زەوی گەورەو ٢٠٠٠لیرەیان کردبوو[٢]، ڕەفیق حلمی فەروەیەکی بەدیاری لەلایەن شێخ محمود بۆ سوڵتان لەئەستەمبۆڵ بردبوو، لەڕێگا ڕای گۆڕی و کردیە دیاری بۆ ئەتاتورکیەکان لەئەنقەرە، ئەو دەردە گەیشتبوە کوردەکانی دەرەوەی وڵات، لە بەڵگەنامەی بەریتانی ژ:٢١ لە ١٩٢٩/٤/١٨ بۆ وەزیری دەرەوەی بەریتانیا نوسراوە دەڵێ: مانگانە یارمەتی٦٠,٠٠٠$ یان بۆ ئەتاتورك دەنارد تا بزوتنەوەی خۆیبون تێبانیگەیاند کە ئەتاتورك چیە و یارمەتیەکەی پێ وەستاندن، تەنانەت ئیحسان پاشاش کە لەدواییدا لە ١٩٢٧بە شۆڕشی ئاگریداغ هەڵسا، لایەنگیری ئەتاتورکی کرد و ئەفسەری بەرپرس بوو لە سەربازگەی ئەستەمبۆل و تەسلیمی ئەتاتورکی کرد لە دژی سوڵتا ن[٣]، لەلای سەرۆك عەشیرەتەکان زۆر زیاتر، ئەوەندە متمانەیان بە ئەتاتورك هەبوو ببوە ڕاوێژکاری عەشیرەتە کوردەکان ، لە کۆبونەوەیەکی (هاوپەیمانی هۆزەکان) لە ١٩١٧/١١/١٥ نامەیەکی (٥) پرسیاریان بۆ ئەتاتورك نووسی، تیایدا داوایان کردبوو بۆیان ڕوون بکاتەوە ئاخۆ ئەویش وەك سوڵتان ئامادەیە بەتەواوی دان بە سەر بەخۆیی کوردستان بنێت،هەڵەبەتە وەلامی درۆزنانیش ئامادەیە .

بەو شێوەیە کوردە ڕۆشنبیر و لائیك (عەلمانی) و سەرۆك عەشیرەتەکان بەشداریی و پشت گیریان لە دام و دەزگا و حکومەت و پەرلەمانی ئەتاتورك کرد لەژێر ناوی (برایەتی کورد و تورك لە دەوڵەتی تورکیای نوێ)، حسن خەیری سەرۆکی فراکسیونی کورد بون لە ئەنجوومەنی مەزنی تورکیا لە ئەنقەرە کە ئەتاتورك دروستی

[١] ـ بڕوانە: ئحمد تەقی ـ خەباتی کورد ل٩٢ هەروەها (دراسات فی الحرکة اکوردیة المعاصرة ص٢٧٤ )
[٢] ـ دراسات فی الحرکة الکوردیة المعاصرة ص٢٥٢
[٣] ـ بڕوانە: ئیحسان نوری پاشاـ شۆڕشی ئاگری داغ ل٢٢ .

**کردبوو، ٧٢ ئەندامی کوردی تێدابو، ئەتاتورك وەفدێکی لیَ ڕێکخستن بەسەرۆکایەتی عصمت ئینینۆ، دووکوردیشی بەگەردا (برنجی زادەو زولفی بەگزادە)، ئەوان لەویَ چوونە لۆزان بەناوی کورد قسەیان کرد، وتیان: ئێمە و تورك براین، دەمانەویَ پێکەوە بژین، نامانەویَ جیاببینەوە مادەکانی ٦٢ـ٦٤ دەبیَ هەڵگیریَ، (حسن خەیری) لە ئەنجومەنی ئەنقەرە بروسکەی لایەنگری بەناوی هەمو کورد بۆکۆنگرەی لۆزان دەکرد[1]، تاوای لێهات وەفدی ئەنقەرە بەشداری پی کراو وەفدی عوسمانی دەرکران لەو کۆنگرەیە، لەلای عیراقیش وەفدی لۆزان کورد بوە، بەریتانیا(بەسەرکردایەتی کیرزۆن) سەرپەرشتی دەکردن بەشداربوان جعفر عسکری(کوردە) وتوفیق سوێدی، بەوشێوەیە ڕێکەوتنی سیڤەر گۆڕا بەلۆزان کە پیك هاتبە لە ١٤٣مادە ١٢٨جار ناوی تورکیای لیَ هاتوە تاکە ناوێکی کوردی تێدا نەهات .**

**لەومیانەدا زانایانی ئاینی کوردستان لەوانە شیخ عبدالقادر، شیخ سعیدی نەورەسی، شیخ سعیدی پیران، شیخ محمود، ... زۆر ناقایل بون بەو هەنگاوە، بەڵام چینی عەلمانیەتی کورد داوایان لەوانە کرد ئەو هەنگاوەیان ڕزگاری کوردەو دەوڵەتێکی عەلمانی تورکی مافی کورد مسۆگەر دەکا، لەلای ئەو زانایانە لەسلێمانی و کوردستانی سەروو بەبەیانی ڕەسمی لە گەرمەی کێشەی ویلایەتی موسل لە سالی ١٩٢٤ دەرچوو، کۆپیشیان نارد بۆ (عصمە الامم)تیایدا هاتبوو کە کوردو تورك هیچ پەیوەندیەك یەکیان نابەستەوە جگە لەئاین، ئاینیش نەما لەسەردەستی ئەتاتورك ئیتر کوا برایەتی کورد و تورك، بۆیەزانایانی ئاینی ڕەوشەنبیر داوای سەربەخۆیی کوردستانیان کرد، کۆمەڵێك لە ڕەوشەنبیران و نیشتمان پەروەرانیش لاگیری ئەو ڕایەی زانایانی ئاینی بوو، بەڵام ئەوانەی بەناوی مۆدیرنی و سیکولاری بانگێشەیان**

---

[1] ـ بەیتار دەرسیمی لە ل٢٢١ی کتێبەکەی خۆی(دەرسیم لە مێژووی کوردستان) دەلیَ حسن خەیری بە خۆی هەمو ئەو قسانەی بۆ گێڕامەوە کە چۆن بروسکەیان بۆ کۆنگرەی مەسلەتی لۆزان لێداوە .

دەکردو سوربون لەسەر ڕای خۆیان، زانایانی ئاینیش بوواریان پی دان تا گەیشتنە بنبەست، دوای ئەوەی ئەتاتورك زال بوو بەسەر ئەستەمبۆڵ و بەیەکجاری خیلافەتی هەڵوەشاندەوە و کۆماریکی تورکی عەلمانی لەسەر بنچینەی تورکایەتی دامەزراند لە ١٩٢٣، لە دەستور (ANA YASA) نکۆلی لە کورد کرا و دەستی بە داخستن و قەلا چۆکردنی دام و دەزگاو فەرهەنگ و کەلتووری و سیاسی کرد، کە پێشتر تا ڕادەیەکی باش بەئازادانە لەئەستەمبۆڵ ئیشیان دەکرد، محمد زەکی بەك دەڵێت(هەمو ئەو جەمعیەت وحزبە کوردیانەی کورد دروستی کردبون لە ژێر سایەی خیلافەت ئازاد بون، بەڵام ..لەگەل تسلیم بونی ئەستەمبۆل بە حکومەتی کمالی هەموی داخستن)[١]، بەرنامەیەکی ترسناکیش دارِشرا بۆ قەدەغەکردنی زمان وجل وبەرگی و تەوای فەرهەنگی کوردی... بەوانەش نەوەستا هەڵسا بەگرتنی هەمو ئەوانەی یارمەتیان دا، دادگایەکی ریك خست بەسەرۆکایەتی (صائب پاشا) بۆ لەسێدارەدانی سەرکردە کوردەکان، ئەو دادگایە گەیشتە هاریکارەکانی ئەتاتورکیش،لەوانە زۆربەی ئەو عەلمانیانە کوردانەی هاریکاریشی بوون .

بەو شێوەیە لەناوچەوانی نەوەی یەکەم ونەوەی دوەمی عەلمانیەت زیانێکی ستراتیجی بەر بزوتنەوەی رزگاری خوازی کوردستان کەوت ،بەلام ئەو کاتی بەرەی عەلمانی وبەرەی نیشتمانی وئاینی لیکجودا نەکرابۆوە ،بۆیە ئەو شکستە نەبوە شکستێکی بەرچاوی ئەونەوەو مەدرەسەکەیان ،بۆیە عەلمانیەت لەکوردستان هەر بەردەوام بوو لە جیگیربوون وهەلکشان .

[١] ـ خولاسە.. ل٣١٤ . لە ل٣١٥ باس لە داخستنی رۆژنامەکوردیەکانیش بە هەمان شێوە دەکا .

## ئاسۆی فۆرمێکی نوێی دێزاینی سیاسی لەکوردستان

بەکۆی توێژینەوەکانی سەروو دەردەکەوێ کە سیستەمی عەلمانی بۆ کوردستان گونجاو نیە ، کەواتە نۆرەی بەدیلەکەیەتی کەلەو دەمە زیاتر ئیسلامیەکان وگەلالەکانی ئەوانە ، بابزانین ئەوان چەندە لەو ئەزمونەیان سەرکەوتوو بووینە ؟ ئەگەر سەرکەوتوو نەبن نۆرە چ جۆرە فۆرمێك دێت لە نێوان شکست ونەگونجانی عەلمانی و ئامادە نەبوونی بەدیلی ئیسلامی، کەواتە دەبێت هەلوەستەیەك لەسەر ئەو پرسیارە بنچینەیی بکەین: ئایادەتوانین بلێین بەرنامەی چاکسازی ئیسلامیەکان لە کوردستان شکستیان هێناوە ؟ ڕەنگە وەلامی ئاسان نەبێت چونکە لەو سەردەمە لەرۆژهەلاتی ناوەڕاست ولە کوردستانیش دەتوانین بلێین ئاینیەکان یەکێ لەو مەدرەسانەن بێ فاکتەری دەرەکی لە هەناوی جەماوەر بخولقێن،خۆی دەتوانی خۆی ئۆتۆماتیکیانە چاکساز بکات، بەلام بە پێی ئەو بارو دۆخەی تێیدایە زۆر زەحمەتە نەفی کردنی ئەو پرسیارەش، چونکە هەر دام ودەزگاو کۆمپانیاو بزوتنەوەیەك ئەگەر لەو دۆخانەی خوارەوە بوو بە (فاشیل)پۆلین دەکرێ:

١- زەمەن لەقازانجی نەبێت ،دوێنێ و ئەورۆی وەك یەك بێت یان خراتر، ئەگەر ئەوە بەراوورد بکەین دەبینین تا سالانی١٩٩٩بزوتنەوەی ئیسلامی کوردستان لەلایەن ئەمریکاوە بە یەکێ لە ٧ لایەنە کاریگەریەکانی عێراق پۆلین کرابوو[١] ئیستاش هەروا لەکورتی دەدەن، لە دوا هەلبژاردنی ٢٠٠٩/٧/٢٥و هەرەدوایی ٢٠١٨ بزوتنەوەی ئیسلامی بێ کورسی مایەوەو هەمو ئیسلامیەکانیش هاتونە ١٢ کورسی .

---

١ بروانە دەقی : بەلگەنامەی ئەمریکی - بڕیاڕی ژ:١٣ ـ ٩٩ی سەرۆك کۆماری ئەمریکی لە٤/٢/١٩٩٩.

٢- کەمتر لە معادەلەیەکی کارای ناوەکی وهەرێمایەتی جیهانی بەدی دەکرێن بەڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ ،هەرچەندە لەدوای دروست بوونی (بزوتنەوەی گۆڕان) ئاسۆیەکی تریان بۆ هاتە پیش بەلام لەوەش زۆر سەرکەووتو نەبوون.

٣- لە دۆخە جیاجیاکاندا گۆڕانیان پیێ ناکریێ.

٤- هەموو دۆخ وئەزموونەکان شکستی هێنابێ، واتە بە ئەزموونی جیهادی ئاسایی(بزوتنەوە)، ئەزموونی جیهادی توندی ( ئەنسارولئیسلام)،بەنەرمی ونیمچە نەرمی (کۆمەل ویەککگرتوو)لەهەموو بارێك هەر لە شکست دابێ .

٥- ئەگەری دەربازت لەئاسۆ دیارنەبێ، ئیمکانیەتی گەشەو گۆڕانی پەکی کەوتبێت .

٦- بەدیل نەبێ بۆ دۆخە خراپەکانی بەرامبەریشت، ..بە لای کەمی هەندێك لەبیرمەندانیان گەیشتبنە ئەو قەناعەتەی کە نەبوون وبوونی وەك یەکە .

٦-زۆربەی ئەوانەی دەچنە نێو حکومەت بە نوێنەرایەتی لایەنە ئیسلامیەکان لەو تاقی کردنەوەیە دەرنەچووینە ،وەك گەندەلچیەکانی تری حزبە عەلمانیەکان کەوتونەتە ژێر کاریگەری پارەو کۆشك وتەلار وژن هێنانی تر ومۆنیکاو..

٧-ئیسلامی کوردستان مێژووی لەگەلە ،سروشت وزانستەکان لایەنگریەتی ، لە فکرو بنەما لەعەلمانیەکان بەهیزترە ،چواردەوری هەموی ئیسلامیە ،لەناوەخۆ زۆرایەتی هەرە زۆری خەلکی کوردستان ئاینین ، کەچی لایەنی عەلمانی لەسەر باتیل و گەندەلی ئاوا لیێیان دەبەنەوە ، کەواتە یان خەلەل لە ئیسلامە یان لە ئیسلامی ، بێگومان خەلەل لە ئیسلامی و لایەنەسیاسیە ئیسلامیەکانە .

٨-ڕیسایەك هەیە لەكارگێڕی باڵا ئەویش ئەوەیە ئەگەر دەزگایەك لادەی وکاریگەریەکی وای نەبێ لەدوای لادانی ئەوا مانای بێ سوودە،لەو کاتە ٢٠٠٩ ئەو لایەنە ئیسلامیانە لە گۆڕەپان لابدەی دەبینین کاریگەریەکی وای لەدوای خۆی بە جیناهیلی.

خەریکە بلێین پرۆژەکە بەتەواوی نزیکە لەفەشەل ...کەواتە دەبێت کۆمەلێك قەیرانی هەبێت بەکورتی ئەوانەن :

لەسەرەتای ڕابوونی ئیسلامیەوە وا ڕادەبینرا کە بەخێرایی گەشەبکات سەرکەوتوو بێت ،کەچی وادەرنەچوو،حزبی تحریر ٣ قۆناغی بەگەیشتن بە خەلافەتی ئیسلامی دیاری کردبوو ،قۆناغی ئامادەکاری ئەندامان ،تێکەل بوون لەگەل ئومەو کۆمەلگە ،سێیەم گەیشتن بەدەولەت وخەلافە ..بەو مەرجەی هەر٣ قۆناغ نابێت لە ١٣ سال ڕەتبدات ..تا ئیستاش قۆناغی یەکەمیشیان ڕەتنەداوەبەهۆی قەیرانی زۆر سەخت، هۆکارو قەیرانەکان زیاتر لە چواردەوری ئەو تەوەرانە دەخولێتەوە ( ١-قەیرانە فقهیەکان ٢- قەیرانی مەزهەبی ٣- قەیرانی توندڕۆیی ٤- قەیرانی حزبیایەتی )، زیاتر ئەو قەیرانانە لەو ناوچانەو لە نێو ئەو میلەتانەن کە هیشتا نەیانتوانیوە کەلتووری عەرەبی وپەیامی ئاینی لێکجیا بکاتەوە ، زۆربەی ئاینپەروەرانی کوردستانیش لەو پۆلەن ، بۆیە قەیرانەکان نزیکە لەو قەیرانانەی کە ڕووبەڕووی ئیسلامی عەرەبی دەبێتەوە ،بەکورتی باسیان دەکەین :

١- ئەوەی پێی دەووترێ ڕابوون (یان ئیسلامی حرکی) هێشتا کەمایەتین ، ڕای گشتی بۆ نوێژ و ڕۆژوو و حەج و بەشێك لە حەرام و حەلاڵ دروست کراوە، بەلام بۆ بابەتە گرنگەکانی جیهاد، بیروباوەڕی ئیسلامی، فێربوون، حوکم بە

ئیسلام،ڕابوونی ئیسلامیو دادگەری ... دروست نەکراوە، بۆیە بە ئاسانی توومەتی بەکارهێنانی ئاین لەپێناو مەرامی پایەو تەخت قووت دەبێتەوە دژیان .

٢-زانایانی ئیسلامی کەمتر بەلای کاری سیاسی و دەسەڵات چوونە، بەتایبەتی لەدوای خۆسەپاندنی (معاویە) و ڕاوەدوونانی زانایان وای لێکردوون کەمیش لەسەر سیاسەت بنووسن، جگە لە هەندێ سەرچاوەی دەگمەنی وەك (سیاسة الشرعیة- ابن تیمیة)،گرق الحكمیه، احكام السلگانیه،...بەشێکی زۆریش لەو جۆرە کتێبە بەدەستنووس ماونەتەوە ،ئیمامی غەزالیش لە (احیاء علوم الدینیة) بەلای ئافاتی دەسەلاتی سیاسی خراپ دا نەچوە لە چوارچیوەی ئافاتە خراپەکان( آفات الشهوتین شهوة البطن وشهوة الفرج، وكتاب آفات اللسان، وكتاب آفات الغضب والحقد والحسد، وكتاب ذم الدنيا، وكتاب ذم المال والبخل، وكتاب ذم الجاه والرياء، وكتاب ذم الكبر والعجب، وكتاب ذم الغرور) ،لەسەر ئەو بنچینەیە (ابن خلدون)ڕەخنەی لە زاناو فەقیهەکان گرتوە ودەڵێ دوورترین توێژن لە سیاسەت وبگرە لەواقعیش چونکە زیاتر لەناونوسین وکتێبن نەك ناوکۆمەڵگە ، لەنێو کۆمەڵگەی ئیسلامیدا دوو هۆی سەرەکی هەیە بۆ ئەوەی ئایین لە سیاسەت و دەسەڵات لێك دووركەوێتەوە( یەکەمیان هەڵسوکەوتی نیگەتیڤی بەشێکی زۆر لە خەلیفەکان، دوەمیان پەیڕەوکردنی ڕێبازی میکاڤیلی لە ڕێبازی سیاسەتی نوێ‌دا..) لەوەوە وشەی (سیاسەت) بەناوناتۆرە دەزانن و بەخێرایی ڕەتی دەکەنەوەو دەڵێن ئێمە زانای ئایینین سیاسی نینە .

٣- سەرهەڵدانی فرەمەزهەب و تەیار و فرە مەدرەسە و فرە لایەنی ئیسلامی، هەڵبەتە هەر فرەییەك بۆ هێنانەدی یەك ئامانج بێ ئەوا دەبێتە (بدیل) بۆ یەکتریش، ئیتر ئاساییە ناکۆکیش سەرهەڵدەدا، ئاکامە نێگەتیڤەکانی گەلێ زۆرە ناژمێرێ لە دووبەرەکی و سەرقاڵ بوون بە یەکەوەو دەبێتە هۆی وەرگەڕانی ڕاستیەکان و

جێ‌گۆڕکێی: لاوەکی بۆ جێی بنچینەیی، ئامراز بۆ جێی ئامانج، گۆڕاو بۆ جێی نەگۆڕ، وەختی بۆ جێی دائیم، تاکتیك بۆ جێی ستراتیژ، ناحەز بۆ جێی دۆست، توندی بۆ جێی نەرمی،...هەولێکی زۆر دراوە ئەو دیمەنانە جوان بکرێت وبلێن (ئەدەبی ئیختلاف)هەبوە لە نێو ئەو مەزهەب و تەیارو تایفانە ،لەکاتێکا وانەبوە زۆر نیگەتیڤ بوە .

٤-دووبارە سەرهەلدانەوەی شۆڤێنیەتی حزبی و ناشیۆنالیزمی (بەتایبەتی ئەو بیرەی گوایە خیلافەت هەر بۆ عەرەبە) وای کردووە تەیاری ئیخوان و تەیاری سەلەفیە جیاجیاکان دژ بەیەکتر لەدژی عەجەم وکورد کاری سیاسی بکەن بە پێشبڕکێی (مزایدە) تا ڕادەی توندوپەڕەگری.

٥- گرنگی نەدانی بەشی ئەکتیڤی فقهی ئیسلامی بەفلسفەو فکرو زانست و تەکنۆلۆجیاو هێنانەدی شارستانی ، ئەو خالّە لاوازانە بەسانایی پەڕینەوە نێو ڕابوون، دیمەنێکی دواکەوتەیی و کلاسیکی پێشان دەدا ناتوانێ ببێتە بەدیل بۆ ماکینەکانی عەولەمە.

٦- لەکۆتاییدا : بەشێك لە ڕەوشەنبیرو نەوەی نوێ بەو تەفسیرە کلاسیکیەی ئاین ڕازی نین ، وا سێ پۆل سەرهەلّدەدا یەکەمیان دەلێت فقە سودی نیەو فەرمودەش پەیامی خودا نیە و تەنها قورئان پەیامە ،پۆلی دوەم ڕێك پێچەوانەی ئەوە دەلێت دەبی ئێمە لەسەر فقهی ئیمامەکانی کۆن بڕۆین ونابێت دەستکاری بکەین ،پۆلی سێیەم دەلیت فەرموودەو قورئان پەیامن وباقیەکەی تر ڕای بەشەرین دەکرێت هەلەی تێدا بێت وبۆ سەردەمی خۆی نوسرایتەوە بۆ ئیستا تەواو گونجاو نیە ، واتە لە دوای پەیام سود لە فقهی گونجاویش وەردەگیری ، ئەو بۆچوونە دەیەوی لەو دواکەوتنەی ئیستا (کە لەجهان بە جیماون) دەرچن ، دەیانەوی لە میراتی ئەو فقهە دەرچن کەوای

لەکورد کردوە ناچاری بکات تەنها بەدوو دەروازە بچنە نێو زانستی ئایین :یەکەمیان بەعەقلی میلەتیکی تر (وەك فلتەر) بچیتە،دوەم بەعەقلی نەوەیەکی کۆن ،ئەو دوو هۆکارە وای کردوە زۆربەی موسولمانانی جیهان دواکەون ،کوردیش بە خراپتر .

هەندێك لەمیراتگری ئەو فقهانە ڕێگرن لە دەرچوون لە میژوو و هاتن بۆ ئیستاو داهاتوو ...،هەر چوار خەلیفە وئیمامەکانی پیشوو لای موسولمانان خۆشەویستن بەلام زانست وایە دەبێ کارو بۆچوونی ئەوانەش هەلسەنگێنری ، خۆشیان ووتویانە هەلەمان کرد ( ح عمر )ووتی من هەلەم ئەو ئافرەتە راست دەکات ، هەندی دەمارگیر هەن تەنها بلێی ئیمامی عمر یان ئیمامی علی هەلەی کردوە دەبێتە کافر کەچی معاویە شەڕی ئیمامی علی کردوە دەلێن نابی بلێی معاویە تاوانی کردوەو نابێ بلێی خوا لێی خۆشبێت ... هەمو ئەوانە ناکۆکیە لە میشکی دەمارگیران ڕێگرن لە پیشکەوتن وبەرجەستەی ڕابوون ، ئەوانەو بەشیکی تر ڕێگرن چونکە ئەو بارودۆخە فقهیە لەگەل پیگەو بەرژەوەندیەکانیشی تیکەل بوە ، تەیاری عەلمانی ودەسەلاتیش تارادەیەك یارمەتیدەری ئەوانەن .

## فۆرمێکی نوێی ئاینی وسیاسی:

کەواتە عەلمانی لەشکست و غیابی سۆشیالیستی وشیوعی وناکاملی ناشیۆنالیزمی ..، لەهەمان کات ئیسلامیەکانیش نەیانتوانیوە ئەزمونێکی سەرکەوتوو پیشکەش بکەن ، یان ووردتر لەسەرەتا سەرکەوتوو بوون بەلام چەندین سالە وەستاون، بەو فۆرمە کلاسیکیە نارِوات ،ئەو فۆرمە بەرهەمی سەدەی بیستە ،لەسەرەتادا شیخ سعیدی نەورەسی لەسالی ١٩٠٨ یەکیتی محمدی دروست کرد وەك کاردانەوەی ئینقلابی ئیتحادیەکان دژی عوسمانی ،دوای شیخ حسن بەنا لە ١٩٢٨ وەك کاردانەوەی ئینتداب ودۆزی فلستین وعەرەب هاتە مەیدان تا لەسالی ١٩٧٩ لە ئەنجامی شۆڕشی ئیرانی ئەو فۆرمە ئیسلامیە خەملی ،لە ئیستاشدا بە

دیقەتدان لە میسرو جەزائیروسودان وتورکیاو زۆر لای تر ئەو فۆرمە لە قەیران دایە ،فۆرمی ئیسلامی کوردستانیش کەتۆتە قەیران نابیتە بەدیل بۆ قەیرانەکانی عەلمانی کوردستان.

کەواتە کوردستان کەوتۆتە قۆناغێکی بۆشایی و(لەتراز) ،واتە قۆناغی گواستنەوەیە لە سیستەمە کلاسیکیەکان بۆ دیزاینێکی سیاسی نویێ، ،عادەتەن لەرۆژهەلاتی ناوەڕاست (وووردتر لەناوچەی سایکس پیکۆ) گۆڕانی وا ئێش وژانی لەگەلە ،وا دەبینریێ کە شۆڕشێکی شێوەی ئەوروپا بەرپا بێت کەلەسەدەکانی ناوەڕاست بەرپابوو ، لە ئەوروپا شۆڕشەکە دژی سەرتاپای ئاینەکە بوو ،هەرچی لە جیهانی ئیسلامیە شۆڕشەکە لەدژی خلت وخاری بەشەریە کەبەسەلبی چوەتە پاڵ ئاین ، لەو شۆڕشەدا مشت ومڕەکان هەمو داهاتی عەقلی بەشەری دەگرێتەوە بەلام ناگاتە پەیام ،ڕەنگە لەسەرەتادا تەڕو ووشك بسوتێنیێ ،بەلام لەدوایدا جارێکی تر هەلسەنگاندنێکی عەقلانی بە ستاندەری پەیام بۆ بەرهەمە بەشەریەکانیش دەکرێتەوە لە بیری ئیمام وفەقیهو زاناو فەیلەسوفانی پیشینە و کولتووری عەرەبی و مێژوو ...،چینە زانایەکی تری پیشینان (کە تائێستا فەرامۆش کرابوون)جێی زۆربەی ئەو زاناو فەقیهانەی ئێستا دەگرنەوە.

لەدوای ماوەیەك بۆیان دەردەکەویێ هەمو فقهو هەمو مێژوو وهەمو زانایانی پیشووکارەکانیان سەلبی نەبوە، ناکریت کاری ئەو پیاوە گەورانەی مێژوو ڕابمالی ، کەواتە ئەوانەی ڕابەرایەتی ئەو قۆناغە گواستنەوەیە دەکەن یەك هەلوێست نین ، سیێ پۆلی سەرەکین، وەك لەسەروو باس کرا ، پۆلی یەکەم شۆڕشی لەسەردەکریێ لەسەر دەستی پۆلی دوەم ،پۆلی دوەمیش ئیدارەی پیناکریێ ڕادەستی پۆلی سێیەمی دەکا، لەدوای ئەو هەنگاوانە فۆرمێکی نوێی سیاسی و یاسایی و هزری دەخەملی ،کە تیایدا مرۆڤایەتی وشارستانی و پێکەوە ژیانێکی ڕاستەقینە دەخەملیت ، ئاین دەبێتە پێویستیەکی بەشەری ، مەبەستمان جەوهەری ئاینیە –کەهەمو ئاینە ڕاستەقینەکان (لە

مسیحی ویەهودی وزەردەشتی و ئیزیدی وتاوی و..)هەموی دەگریتەوە هەموشی پێی دەووترێت ئیسلام ، دەبێتە ئەو چارەسەرەیەی قەیرانی داهاتووی گۆی زەوی ،ئەو زەویەی لە ئیستادا ٧ملیار کەسی لەسەر دەژی و سیستەمی سەرمایەداری هاواریەتی دەلێت بگاتە ١٠ملیار من ناتوانم بە خێویان کەم ، ئاین جارێکی تر نۆرەی ڕاستەقینەی دێت ودەلێت من دەتوانم چەندین ملیاری زیاتر لەسەر ئەو زەویە بەخێو بکەم بەهۆی دادپەۆرەوەری گەردوونی ، ئەو فۆرمە بەرێوەیە مونەزیری سیاسی و ئاینی سەرکەوتووی کورد ئەوەیە لە ئیستادا خۆی بۆ ئامادەبکات ، چاوەڕێی عەرەب وتورك وعەجەم نەکات،پیخوستی دەرەکیەك نەکەویٚ ،چاوەڕێی مێژوو نەکات پێی بگۆڕی خۆی بەو گۆڕانە هەلسیٚ، بۆ ئەوەی جارێکی تر کوردستان بکەینە پێشڕەو لە گۆڕان .

## پاشکۆ

## ڕیشەی ئیلحاد لەکوردستان

ئیلحاد هاوتای وشەی ئەگریکی (athos) ە، بەمانای (باوەر نەبوون بـە خـوا)، تائیستا کۆمەلگەیەك نیە مولحد بیت بەلکو هـەر لـەئاسـتی (تـاك وتـەرا)هاتوە ، زۆر تاقمی کۆمەڵایەتی هەیە بە ڕوونی ئایینیان نیە، کەچی مولحیدیش نـین، چـەند جـۆرە مولحید هەیە، سەرەکیەکیان نەفامی و مولحیدی فەلسـەفی وزانسـتی هەیـە، لــەوەی نەفامی هەروەك ئاژەڵ بیرناکاتەوە، مولحیدی فەلسەفی بیر بـە قـوڵی دەکاتـەوە بـەڵام مەنهەجی بیرکردنەوەی لەنگە'بەگشتی باری زانیاری وفلسـفی ئیلحـاد لەسـەدەی ٢١ زۆر جیایە ،لە ئیستای کوردستان جۆریکی تایبەتی ترە لەوانە یان تیکەلیکە کە لەدوای باسی دەکەین.

چەندین دیاردەی نەرێنی هەیە لە میژووی کوردستان بوونی نەبوە یـان هەشـبووبێت زۆر نامۆ بوە ، ردە لەکوردستان نەبوە لە هیچ سەردەمیك کەچی لەناو عـرب زۆر بوە ، پەیوەندی کردن و خەت مائیلی لەنیو میلەتانی تر زۆر بوە بۆ ئەورووپاو ڕوسیا، بەهەمان شیوە دیاردەی ئیلحادی لەکوردستان نەبوە ، تا سەرەتای سـەدەی بیسـتەم ئینجا وەك دیاردە بەدی دەکریت ،واتە ڕیشەیەکی قوول وکۆنی نیـە ، هەنـدیٚ جـار باسی فەیلەسوف سیف الـدین امـدی)[1] کـراوە گوایـە مولحـد بـوە بـەلام نوسـین وگەواهیـەکانی سـەردەمی خـۆی دەری دەخـەن یـەکجار زۆر خواپەرسـت وئـایین

[1] خاوەنی ئەوبەرهەمەگەورانەیە: لإحكام في أصول الأحكام. منتهى السول في علم الأصول.ـ ـ المآخذ على المحصول. ـ منتهى السالك في رتب الممالك. ـ دقائق الحقائق.ـ غاية المرام في علم الكلام.ـ كشف التمويهات على الإشارات والتنبيهات.ـ رموز الكنوز.ـ الغرائب وكشف العجائب.ـ النور الباهر في الحكم الزواهر.ـ المبين في شرح ألفاظ لحكماءوالمتكلمين.ـ فرائد القلائد.ـ منائح القرائح مختصر أبكار الأفكار.ـ المآخذ على المطالب العالية.
ـ أبكار الأفكار في أصول الدين...الجدل فى الفلسفة، دقلئق الحقائق فى المنطق...بروانة: موسوعة الفلسفة والفلاسفة ج١ص١٥

پەرەوەر بوە یەکی لە شاهیدەکان (ابن تيميه)بوە بۆی(.. لم يكن أحد في وقته أثر تبحرا في العلوم الكلامية والفلسفية من(الأمدى)وكان من أحسنهم إسلاما وأمثلهم اعتقادا).

## ڕیشەی ئیلحاد لە میژووی کۆمەلگە

جاران واباو بوو گوایە سەرەتای کۆمەلگە دڕندەیی وبێئاینی بوە یان فرە ئایین وفرە خوایی هەبوە ئینجا یەکتا پەرستی وئاینی تەوحید هاتە کایەوە ... زۆربەی ئاینی یەهودی دیاری دەکەن وەك یەکەم ئایینی تەوحید یان زەردەشتی یان مەندائی ...ئەوانە هەلە دەرچوون ، لە پلۆتارخی ئەگریکی تا هنری برگسۆنی ئەو سەردەمە ڕایان وایە کۆمەڵگە بیّ ئاین نەبوەو دەڵێن: لەمێژوودا میلەتان بیّ کۆشك وتەلار بوە، بیّ فەلسەفەوهونەر بوە بەلام هەرگیز بیّ ئاین و پەرستگا نەبوە، لە (معجم لاروس)یش هاتوە کە لە تاکی دڕندە ترین میلەتانیش مەیلی ئاینی تیدا بوە ، ئەگەر ڕای یەکەم ڕاست بوایە دەبوایە یەکەم باوەڕدار لە میژوو دیاری بکەین ،بەلام ئیستا بەپیچەوانەوە دەبیت یەکەم موحید بدۆزینەوە لەمیژوو ، هەندیّ سەرچاوە یەکەم موحید (سومخيا)ی هندیبوە لە (٤٥٠ پ ز) بەشێکی تر بۆ (پیلاس ٥٥٠پ–ز)ی یۆنانی یان دیاگراس ٥٠٠ پ–ز، ناوی هەریەکە لە (ئەناکسیۆگوراس٥٠٠پ–ز، ئەناخسیماندەر، تیۆدۆرس، گریتۆس، ئەبیکۆر(٣٤١–٢٧٠ پ ز)، (شیشرۆن ١٠٦– ٤٢ پ.ز.، (سینکا ٥–٦٥ز)بەموحیدی هاتووە، ئەنجلس(١٨٢٠– ١٨٩٠) دەڵیت: ئەبیکۆر مەزن ترین مادی موحیدی فەلسەفەی یۆنانیە[1]، (جیمس پروير) لە کتیبەکەی (الإلحاد الغربى Western Atheism) ئیلحاد ودەهری لەپیش سوکرات دەست پیّ دەکاو هەریەکە لە(هرکلیت و ئەناکسیمینس و ئەبیکۆر و ئەناکسیماندر..) لەو پۆلە بووینە ،دەکریّ ئەوانە یەکەم موحیدی فلسفی بیت نەك

[1] دیالکتیك الطبيعة –فهرس الاعلام ص٣٧٨

مولحدی نەفام ، ئەگینا بێباوەڕی وئیلحادی لەسەرەتای بەشەری هاتوە ، بەلام عادەتەن ئەوانە نەشارەزاو نەفام وستەمكاریش بووینە یان لەبەر دەستی ستەمكار بووینە ، بەگوێرەی قورئانی پیرۆز و هەندێ كتێبی تری ئاسمانی هەر لە دوای (ح.ئادەم) بێ باوەڕی شان بەشانی باوەڕی پەیدابووە، بەلای كەمەوە لەسەردەمی (ح.نوح) بێ باوەڕی زۆر فراوان بووە، لە مەدرەسەكانی (یۆنانی و هەرسێ مەردەسەی سەرەكی ئایینی و نائایینی و مام ناوەندی لێ خەملێ)، مەدرەسەی ئایینی (یان نزیك لەئایینی ) بریتی بوو لە فەیلەسوف و زانایانی وەك (فیساگۆرس وئەمبادیكلس و ئەنكسیمونراس تا دەگاتە سوكرات).ئەوەی ڕوونە هەریەكە لە فیساگۆرس و ئەمبادیكلس قوتابی (ح.سولیمان و (ح.داود) بووینە، لە دوای یۆنانیەكان فەلسەفە و زانستی بێ باوەڕی بەردەوام بووە تا سەدەكانی ١٧ بەدواوە تەكانی بە خۆدا، گەورەترینیان سپنوزا و هۆبز شوبنهاوەر، دیفید هیوم، جون دیوی، برتراند راسل،.. شوبنهاور، فیورباخ، سارتر، فروید. مەكیاڤیلی. باڤلۆڤ نیتچە هواتیهد داروین ماركس ئەنجلس لینین تازەترین كتێبی بایۆلۆجی (رتشارد دوكینغز- وهم الإلە) وفیزیایی (ستیڤن هۆكینگ- the grand design ) (دیزاینی مەزن).

بەوشێوەیە زەمینەی ئیلحادی لەسەدەكانی ١٨ و ١٩ لە ئاستەكانی فیكری و فەلسەفی و یاسایی و سیاسی و دەولی تەكانەكی گەورەی پێدرا،وەك غارودی دەلیت: إن الالحاد والفلسفه بدأ فی قرن ١٨ وتحول الی السیاسه، وفی قرن ١٩ تحول الی العلم، أما فی قرن ٢٠ أخذ الگابع الانسانی أیچاً[1] ، (كارین ئەرمسترۆنگ) لەكتێبی (تاریخ الخالق الّعقم) دەلێت: لە سەدەی ١٧ و١٨ لەگەلّ گەشەی زانست ئەوا چەندین تەیاری فەلسەفی بە ڕوونی دژ بە خوا پەیدا بوون،

(١) ماركسیة القرن العشرین، ص: ١٤٣ – ١٤٥.

لەوانه (فولتیر، توماس هوبز، توماس باین، جون لـوك، بنجـامین فـرانکلین، کـارل مارکس و تشارلز داروین و فریدریك نیتشه وسیغموند فروید..)[1]، لەو سـەردەمەی ئیستاش ناوی کۆمەڵێك زانای وەك(یۆلیـۆس ئیکسـفۆردزانای کیمیـایی ئـەمریکی، پتریـــك پلاکیـــت١٨٩٧-١٩٧٣فیزیـــایی بـــەریتانی، چارلاندســـاخارفیزیایی هندی١٩١٠-١٩٩٥، فرنسیس کریك بریتانی١٩١٦- ٢٠٠٤، ریتچارددوکنیز بایۆلۆجی١٩٤١ ..بـەزانای مولحیـد وەسـف دەکرین،میشـیل ئـۆنفرێی فرنسـی لـە کتیبی(نفی اللاهوت) ڕای وەك فیۆرباخه کەدەڵێ میشکی دواکەوتەی مرۆڤه خودای دروست کردوە(الإنسان الشقي الذي يبحث عن السعادة، وإذا لم يجدها في ذاته، ولا على الأرض يتوَّهم أنه وجدها في شخص غريب عن الـدنيا اختلقتـه مخيلتـه ويسـميه الله)[2]، ،ئۆنفرێ لـە ڕەدی (نیتچـە کـە دەڵێ خـوامرد)دەڵێ مـادام مرۆڤیـك مابیـت خوانامرێ خوالەگەل مردنی دوا مرۆڤ دەمرێ ، لە مەدرەسەو گرووپە هەرە نوێیەکان ئـەوا لـەکاتیکا مەدرەسـەی فرانکفـۆرت کـەپیك هـاتوە لـە : مـاکس هۆرکهایمـەر(١٨٩٥-١٩٧٣) تیـۆدور ئـەدرنۆ(١٩٠٣-١٩٦٩)، هربـرت مارکۆز(١٨٩٨-١٩٧٨)ئەریك فرۆم(١٩٠٠-١٩٨٠) زیاتر بەلای مادی بووینـە وەك مدرەسەی براتراند راسلیش لە بریتانیـا، تـازەترین گرووپـی بـێ ئـاینی زانسـتی (new aithism) سام هارینزی فیزیایی، دانیال دینیکی بایۆلۆجی زان، ریتچـارد دۆکنیزی بایۆلۆجی زان، هەرچی (گرۆپی ڤینا)یە کەپیك هاتوون لە کۆمەڵێك زاناو فەیلەسـوفی پسـپۆر جیـای وەك(رودڤ کارنـاب ١٨٩١-١٩٧٠)، کـارل پۆپر(١٩٠٢-١٩٩١) هانزهان ومینجەر وکورت جودل پسپۆری بیرکـاری وئۆتـۆ نیورات کۆمەل ناسی ڤیکتۆر گراڤت مێژووزان، کۆفمان یاسا نـاس فیلیـپ فرانـك فیزیازان...فەلسـەفەی ئەوانـەزیاتر بـەلای زانسـتدا لار بوویتـەوە، هیشـتا سـاغ

---

[1] الفلسفة المعاصرة في أوروبا ص٢٨

[2] أنجيلوس جرجس(القس)- وجود الله وصوُر الإلحاد ص٢٢

نەبووینەوە، بەگشتی بەرەبەرە ئـەو ڕەوشـە زۆر هێـورتر بوویـەوە بەگەیشـتنمان بـە سەرەتای سەدەی (٢١) ، خالێکی تریش هەیـە شـایەنی گۆتنـە هەرچـەندە لـە زۆر سەرچاوەی تر ئەوانە بە مولحد ناویان هـاتوە بـەلام کـە بۆچـوونەکانیان بـە ووردی دەخوێنیەوە وایان لێبەدی ناکرێ ،هەندیکیان باوەڕێکیان هەیە لەگەل ئـەو سـەردەم ناگونجێ ،سوکرات و جۆردانۆ وتەنانەت زینفۆن(٤٣٠ پ ز)یش بە مولحـد نـاوزەد کراوە کەچی ئەو بەرجەستە کردن وبەمرۆڤ چـواندنی خـوای ڕەتکـردەوە ،ووتـی ئەوروپا وادەزانن چاوی خودا شینە ،ئەفریقی بە ڕەش ،ئاسیای سەروو چاوی خـودا بچوك ..،ئەوانەی ڕەت کردەوە ناویان نا مولحیدە ، بە پێی هەندێ لیکۆلینەوە ئـەوا هۆبز مولحید نیە بەلکو جوانتر لە ئایندارن وەسـفی خـودای کـردوە دەلی:لایجـوز تصور الله وتخیله او القول بتكوین فكره عنه في عقولنـا [1] ،ئـەوانی تـریش زیـاتر (دوودلن نەك مولحد) هەتا (دیگۆراس)کەبەیەکەم مولحدی ئەورووپی هەژمار دەکریت دەردەکەوێ مولحد نەبوە دوودلی وگومانی هەبوە ،بۆیەش ئـەو ئامـارە زیـاتر نزیکـە لەڕاستی کەدەلێت ئیستا ڕێژەی مولحید تەنها لـە٢٪ی جیهانە ،واتە مولحیدی تـەواو نەك مترددد[2].

## هۆکاری ئیلحادی

یەکێ لەنیشانەکانی بیری ئیلحادی ئەوەیە چەسپاو نیە(..مَا لَهَا مِن قَرَارٍ)، لەهەر سەردەمیك هۆکاری تایبەتی خۆی هەیە بۆ ئیلحادی ،لەکۆنەوە زیاتر پرسی نەفامی وئیرتزاقی وخزمەتکاری و ترسی دەسەلات و...ئەوانە بوە ، لەهەمان کات هەندێ تاك وتەرای فکری وفلسفیش هەبوە ، لەهەردوو باردا هۆکارەکان بەردەوام

---

([1]) ینظر: توماس هوبز: اللفیثان(الاصول الطبیعیة والسیاسیة لسلطة الدولة) ت:حبیب حرب دار الفارابی ط١ ٢٠١١م ، ص ٣٥٥

[2] بۆ ئەو ریَذەیە بروانە:دعدنانابراهیم– مدخل الی معرفة الالحادوبرهاناالنظم (مطرقةالبرهانوزجاجالالحاد) ص٢٣

گۆڕاون ،بەگشتی هۆکارەکانی پیش سەدەی ٢١ وئیستا زۆر لیکجیایە ، سەرەڕای ئەوەش جیی سەرنجە کە ئەو جیهانە ئەو گەردوونە هەموی لەسەر یاساو ریسای ئایین دەروات کەچی لەئیستادا ئایین لەکۆمەلگەی دەولی ئاوا لاواز بیت ،دەتوانین بلێین بەلای کەمی ئەوواقیعەی ئیستای جیهان لە پیشکەوتن وخۆشگوزەرانی وپەیوەندیە نیودەولەتی ومافەکان ومەدەنیەت ودیموکراسی وسەروەری یاسا وبنەمای هاوولاتی بوون..لە فەلسەفەی (نائاینی) هاتوە،کەواتە بابزانین گرنگترین ئەو هۆکارانە چین کە یارمەتی ڕێبازی فەلسەفی بێ باوەڕی دەدا، زۆر بە کورتی ئەوانەن:

١- لەسەرەتای سەرهەڵدانی مرۆڤایەتیەوە تا ئەو ساتە لە کاتی پێویست و کارەساتی سروشتی و کۆمەڵایەتیدا، لەکاتی زوڵمی بەشەری لەزۆرکاتی تر هەست بەبونی ڕاستەوخۆی دەستی خوایی ناکرێ بۆ کۆتایی هێنان بە مەینەتیەکان.

٢- هەر لەپەیوەست بە خالی (١) وکارەساتەکان زۆر لە خوا دەپاڕێنەوە کەچی هەر زۆردارە بەسەر هەژار سەردەکەوێ، یەکێ لە مولحیدە عەرەبەکانی ئەو سەردەمە دەڵێ: لەسالی ١٩٤٨ دوە عەرەب ویەك ملیار موسوڵمان دوعا دژ بە ئیسرائیل دەکەن کەچی سەرکەوتن هەر بۆ ئیسرائیلەو شکستیش بۆ عەرەب، لە ئەنفالەکان زولمی ئەوەندەگەورە لە ژن ومندالی کورد بە شیوەیەکی وا کرابە زیندوویی لە ژێر خاك بنرێن..کەچی هەردوعا دەکراو وەڵام نەبوو، وەك لائیکێکی کورد دەڵێ هەمو ئەو دوعایانە ناکاتە بەرگریەك کە بەدەستی خۆت دەیکەی، لە زۆربەی هەرە زۆری خانەوادە کۆنەکان (ئیستاش) هەر دوعای (کوڕ) بوون کراوە کەچی ڕێژەی کچ وەك کوڕە

ئەگەر زیاتر نەبیٚ[1]، کەچی کوڕ بوون وکچ بوون یاسای مەندل دیاری دەکا..کاری رۆژانەمان وژیان بریتیە لە پەیڕەوی یاسای سروشتی و(هۆوئەنجام)نەك دوعاو تەوەکول، بۆیە (هینزپاچلیز)لەکتێبی(دستور الكون) ئەو یاسایا سروشتیانەی ناونا دەستوری گەردون[2].

٣-لە دوای دورکەوتنەوەی (زەمانی ومەکانی) پەیامی ئایینەکان لەسەرچاوەکانی (واتە دوای نەمانی پێغەمبەرەکان) ئەوا کۆمەڵێك گۆڕانکاری بەسەردێت بەهۆکاری جیاجیای نەریت و ئاستی زانیاری خەڵکی و هەندێکیش بە ئەنقەست لەلایەن دەسەڵاتدارانەوە، ئایین پەروەریەکە کاڵ و سادە دەبێتەوە، گەڵێ جار لە ناوەڕۆك و قورساییە زانستیەکەی دەپچڕێ، دەبێتە نەریت و کاری سۆفیگەرایی و پاککردنەوەی دەرون، ئەوکاتیش هەموو ڕوداوێك دەدرێتە پاڵ خودا، ئەوەیان لەسیٚ ئایینە خاوەن کتێبە ئاسمانیەکەش بەدی دەکریٚ، لەتەورات و ئینجیل بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ، لە ئایینی ئیسلام ئەو خەلەلە لەخودی قورئان و فەرمودەی دروست بەدی ناکریٚ بەڵام لە فیقهی ئیسلامی و عەقیدە بەدی دەکریٚ، دەڵێن هەرچی ڕوودەدا لەباران بارینەوە لە بروسك و گڕکان و مانگ و رۆژگیران تا ڕووداوە کۆمەڵایەتیەکان و مردن،.. هەمووی دەڵێن بە ئەمری خودایە(تیۆری المشيئه) پشت بەو ئایەتەی (والى الله ترجع الامور)[3] دەبەسترێ،، لە نێو مەسیحیەکانیش نەك قەشەکان بەڵکو فەیلەسوفەکانیشیان لە ڕەدی سپینۆزا دەیان ووت هەرچی ڕوودەدا بە ئیرادەی خوا ڕوودەدا[4]، لەوەوە تیکگیرانیك لەنیوان ئەو تیگەیشتنەو (مشيئه)و یاساکانی سروشت ڕوودەدات تا

---

[1] لە کتیبی(ئافرەت لە نیوان عەلمانی وئاینیدا)-نوسەر بەدرێژی باسی هۆکارە سروشتیەکانی ڕێژەی زیادی ئافرەت بەرامبەر پیاو کراوە.

[2] بڕوانە: بۆل دیفیز- الإقتراب من اللة- ص٩٨ ئەو کتیبە لە بنچینەدا ناوی(Mind of God) وای بە شیاو زانیوە ئاوای وەرگێڕێ.

[3] سورة الحديد اية٥

[4] سپینوزا لە کتیبی (الاخلاق)وەلامی ئەوانەی دایتەوە –ديالكتيك الطبيعة ص٢٣١

ئەو ساتە لایەنگرانی ئاین چارەسەریەکیان نیە (لەکاتیکا هەشە) ، لەوەوە ریتچارد فاینمان(فیزیا زانی ئەمریکی) دەڵێت ئێمە ئامرازی وامان دروست کردوە هەمو نهینیەکمان بۆ ئاشکرا دەکا چی تر پێویستمان بەوە نەما بڵێین ئەوە خوا دەزانی ، کاتی لاپلاس تویژینەوە گرنگەکەی لەبارەی ((میکانیکاالسماو) تەواو کردو کۆپیەکی پێشکەش بە ناپلیۆن کرد، ناپلیۆن لیی پرسی ئەدی رۆلی خوالە ئاسمان چیە؟ کوا رۆلی خودا لە فەلسەفەی تۆ؟ لاپلاس ووتی: یاساکانمان دۆزیتەوە پیویست بە خوا نەما پیویست ناکا سوپاسی خودا بکەین لەجیاتی سوپاسی یاسای سروشتی بکەین [1]، یان وەك هولباخ لە(نقام الگبیعە) بلی ئەوەتە یاساکانی سروشت و(هۆوئەنجام)م دۆزیەوە لە سروشت چیتر پێویست ناکا بلین بە تەمای خوا،نمونەیەك بۆ خالی(٣) لەپێشوودا بڕوا وابوو بروسك لە ئەنجامی ئەوەی فریشتە بەقامچی لە هەور دەدا دروست دەبێ (أنَّ البَرق مَلَك لَهُ أربَعَه وُجُوه : وَجه إنسَان وَوَجه ثَور وَوَجه نَسر وَوَجه أسَد فَإذَا مَصَعَ بِذَنَبِهِ فَذَاكَ البَرق)[2] ،ئەوە ڕێك ئەفسانەیەکی ئەگریکی وئەسکەندنافی هاتوە کە گوایە بروسك لە تورەیی مانگایەکی زۆر گەورە دێت لە ئاسمان توورە دەبێت وقامچی ڕادەوەشێنێتە دوژمنەکانی وبەهەور دەکەوێ ودەبتە بروسك ، کەچی لەدواییدا (مانعە الصواعق) لەلایەن زاناو سەرۆکی ئەمریکی فرانکلین(١٧٠٦-١٧٩٠)دروستکرا، ئایا مرۆڤ کونترۆلی قامچی فریشتەی خودای کرد..

٤-لەلایەن ئاینیەکانەوە تاڕادەیەك ئاسمان وزەوی لیك جیادەکریتەوە، جۆریك لە میسالی پەیرەو دەکرێ، هەندێ جاربەگوزارشی (دنیاوقیامەت) بە دژی یەك وەسف کراون، کە مرۆڤ سارد دەکاتەوە لە پەیڕەوێکی ڕاستەقینەی دادگەری و قەلاچۆی زۆرداری، فەلسەفەی کۆن وبە ئاینیەکانی وەك ئیبن روشد وئیبن سیناو

---

[1] دیالکتیك الطبیعة ص٢٢٩

[2] ابن كثير-البداية والنهاية ج١ ص٥٣

فارابی و.. وایان دەزانی کەمادەی ئاسمان جیایە لەگەڵ مادەی زەوی، ئەوەی ئاسمان لە ناوناچیّ، یاساو ڕێساوپیکهاتنی ئاسمان لەگەڵ زەوی لیك جیایە،لە بنەچەدا بیرۆکەی جیای ئاسمان لەزەوی لە بیرۆکەیەکی تری هەڵە دێت کەوادەزانن خوا لە ئاسمانە یان لەسەر عەرش دادەنیشی وجارجار جیرە جیری کورسیەکە دیت لەبەر قورسایی خودا یان لەکاتی تووڕە بوونی ! .

لە (قاموس الكتاب المقدس ) دووجۆرە ئاسمانیکی مادی وئەوی تر ڕوحی ،گوایە ئاسمانە مادیەکە لەناودەچیّ بەلام روحیەکە دەمێنیّ ،دەقەکەی واهاتوە:

(..وهناك السماء الهيولية والسماء الروحية، .... أما السماء الروحية فهي مسكن الله الخاص، ولذلك يقال أن الله في السماء وأنه إله السماء، ...ويقال عن المسيح أنه الرب من السماء (متى ٥: ٤٥ و١ كورنثوس ١٥: ٤٧) وقد نزل المسيح من السماء وصعد إليها وهو فيها (يوحنا ٣: ١٣) هناك تسكن الملائكة)١.

هەرچەندە لە قورئان دەڵیّ ئاسمان وزەوی یەکن و هەردوولایان لە ئەتۆم پیکهاتون :(..لا يعزب عنه مثقال ذرة في السماوات ولا في الارض..) لەشوێنیکی تریش لەبارەی یاسای ئاسمان وزەوی هاتوە: (ومن اياته ان تقوم السماو والأرج بإمرە.. )[٢]، لەو هەڵەیەی فەیلەسوفانی ئاینی سەبارەت بە مادەی ئاسمانی (واینبرگ) لە کتێبی(DREAMS OF FINAL THEORY) دەڵێت ئاینیەکان وایان دەزانی رۆژو ئەستیرە مادەی نەمرن ولە خوا نزیکن، ئیستا دەرمان خست بریتین لە تۆپەلە گازو کیش وياسا چی لە بەردێکی سەر ئەو

١ قاموس الكتاب المقدس -دائرة المعارف الكتابية المسيحية-مادة: سماء
[٢] القران الكريم- سورة سبأ اية٣، سورة الروم اية٢٥

زەویە زیاتر نیەوئەستیرەکانیش نەبوونە گـەورەیی خـوا[١]، ئیترنهینـی سروشـت ئاشکرا دەبیّ و باوەڕداران لاواز دەبن.

٥- ناکۆکی نێوان فەلسەفەو ئاین: لـەدوای بـانگی پێغەمبـەرەکان عادەتـەن وا هـاتوە ئەوانـەی خۆیـان بـە میراتگـری ئـاینی زانیـوە لەگـەلّ عاقلمەنـدان ڕووبەڕوودەبێتەوە، ئەوەیان لە مێژووی ئیسـلامەتیدا زیـاتر شـێوەی نـاکۆکی نێوان فقهو فەلسەفەی وەرگرتوە، گەیشتە رادەی سوتاندنیان لەسەر دونیا .

٦- گەشەی عەقلّ وزانستی وشکستی ئاینی : سەر هەلـدانی کۆمـەلّێك تیـۆری زانستی دژ بە ئـاین بـوون و هەمولایـەکیش باوەڕیـان پـیّ هینـابوو، لەوانـە: دەرکەوتن و زالّبوونی تیۆری (گەردونی الساکن –یان– قدم العالم) سەردەمی بەتلیمۆس بەناوی (مەجەستی) وا دەرکەوت ئەو گەردوون و جیهانە هەر بووە و هەردەشمێنیّ، بواری بۆ ڕای ئایین نەهێشتەوە کە ئەو بوونەوەرە دروستکراون و تەمەنیشـیان هەیـە، ئـەوە لـە بنەچـەدا بەشـێك بـوە لـە بیرەبـاوەڕی ئـاینی سۆمەریەکان، پێیان وابوە ئەو ڕێسـایانەی گـەردوونی لەسـەر دامـەزراوە بـۆ هەتاهەتایە[٢]، لە تەوراتیش وا هاتوە (٣ والفاهمون یضیئون کضیاء الجلد والـذین ردوا کـثیرین الی الـبر کالکواکـب الی ابـد الـدهور)[٣]، لـەویش وا پیدەچـی لـە مەزمورەکانی ح.داود وەرگیرابیّ بـە جۆرێـك لـە جۆرەکـان کەلەمـەزموری ژ:٧٨ دەلّیّ: (کـالأرض اسسـها الی الأبـد )، لێـرەدا بـوارێکی زۆری بـۆ بـیّ باوەڕی دروستکرد،بەتایبەتی بۆ (تیۆری پەرەسەندن)، چونکە وادەرکەوت کە

---

[١] الفیزیاء ووجود الخالق ص٣١ لە ڕاستیدا ئەوە ئاین نەبوو ئاوای دەوت بەلکو فەلسەفەی یۆنانی نزیك لە پەیڕەوانی ئەرستۆ ئاوایان دەووت.

[٢] جفري بارندر- المعتقدات الدینیة لدی الشعوب - ترجمة :د .إمام عبدالفتاح إمام مراجعة :د .عبدالغفار مكاوي ص١٢

[٣] عهد القدیم -سفر دانیال اصحاح ١٢

چۆن سروشت ڕوداو دروست دەکات نەك خوا ئـەوا (خـەلق)یش لــە(خوا) سەنرایەوە بۆ تیۆری پەرەسەندن .

لەوەشەوە گومان لە دوارۆژ و باقی غەیبیەتەکانی تر زۆر خەست بوویەوە، تا وای لیهات عەقلّ ونەقل، زانست و ئایین، تەکنەلۆژیا ودوعا، موختەبەروفیقە، مۆدێرن و فکری کۆن،... کەوتنە ڕوو بە ڕووبوونەوە، وەك (ابو علی المعری) و (هوایتهد–لە سەدەی بیست دووبارەی کردەوە) ووتیـان: سـەرکەوتن بـۆ زانست و مۆدێرنەو شکستیش بـۆ ئـاین[1].هەرلـەوەشـەوە (همنکـوای) دەلّـێ بەسروشتی خۆی هەمو عاقلێك موحیـد دەبـێ، بـێ عـەقلیش ئـاینی دەبـێ، مارکس پێی وایە بۆ ئەوەی ئایندار بیت پێویسـتی بـە ئـەقلێکی لـەنگ هەیـە ئەقلی دروست ئاینی قەبوول نیـە[2]، لـە شـوینیکی تـر لە(ڕەشنوسـێکی سـالی ١٨٥٤) دەلّێت بۆ ئەوەی مرۆڤ پێی بووتریّ مرۆڤ دەبیّ موحید بێت [3]، واتـە بۆ جیبوونەوەی ئاینی لەکۆمەلّگە پێویست بە عەقلّی لەنگ هەیە، مەرگی ئاین لەگەلّ پێشکەوتنی عەقلە. زۆربەی موفەکیرانی عەلمانی عەرەبیش ئـەو ڕایـەیان هەبوە لە نوێیەکەیان عبدالمنعم الحفنی دەلّێـت: سـەرم سـوڕماوە لـە هەنـدی عاقلّمەنـد چـۆن یەکسـەر تەسـلیمی فەلسـەفەی مـادی نـابن کـە تاکـە چارەنوسیانە[4].

ئەوانە هەموو ئەوە پیشان دەدا کە عەقلّ و کاری مرۆڤ ئەسلە و ئایینیش لاواز و شوێنکەوتەیە وجێی لەسەردەمی مودێرنەو شارستانی نویّ نابێتەوە.

[1] شبلی عیسمی لە(العلمانیه والدوله الدینیه ص١٠٥) دەلیت شیخ محمد عبدەش ئەو بۆچوونەی هەبوە: ((اذا تعرض العقل والنقل أخذ بما دل علیه العقل)تا ڕادةیةك (رازی)یش ئةو بؤضونةی هةبوو.

[111] كارل ماركس–بؤس الفلسفة ص٢٥٦نامةكةی ماركس بؤ ئینینكؤف.

[3] ماركسیة قرن عشرین ص١٤٥

[4] المثالیة والمادیة وازمة العصر ص٩٥

٧- بینرا ئەو میللەتانەی کە زیاتر پەیوەستن بە ئایین ئەوا زیاتر دواکەوتوترن، ئەو پرۆسەیەش لەسەرەتای عەولەمە و سەرەتای دروستبوونی دەوڵەتی مۆدێرن و سیستەمی جیهانی زیاتر ڕوون تر دەرکەوت، لە ئەوروپا تا لە ئایین ڕزگار نەبوون گەشەیان بەخۆ نەبینی و تابوونە پێشڕەو، ئەوانەی زیاتر پەیوەست بوون بە ئایین بوونە قوتابی و گوێگری ئەوانەی پەیوەست نەبوون بە ئایین، لەوەوە تەنزیری ئیستیعمار ئەوروپای مامۆستا و بنەمای(ملتون) سەری هەلدا[١]، تا ئەو ڕادەیە وڵاتانی عەرەبی و ئیسلامی قایل بوون بچنە ژێر سیستەمی ئینتیدابی کە لەبەشی (١)ی مادەی (٢٢) ی کۆمەڵەی گەلان دەرچوو، ئەوان ببنە قوتابی وئەوروپیش مامۆستاو فێرکەر، لەسەر ئەو بنچینەش ووڵاتانی عەرەبی ئیستا دروست بووینە، لەوەش زیاتر مامۆستایان بۆ ئەو میللەتانەی مسوڵمان نارد کە فێری دەوڵەتداری و پێشکەوتنیان بکەن، لۆرانسی بۆ وڵاتانی جەزیرەی عەرەب، بۆ عێراق هەریەکە لە (مس بیل) و (برس کۆکس)بۆ عیراق...، تا ئەو ساتەش وا بەدی دەکرێ لەهەر شوێنێك کە کۆمەڵێك میللەت تێکەڵ دەبن دواکەوتوەکانیان ئەو میللەتەیە کە زیاتر بە ئایین پابەندە.

** ** ** **

لە ڕاستیدا هۆکاری بێ باوەڕی گەڵێك زۆرە بەئەندازەی ئەوەی (ان اللە علی کا شئ شهید) ئەوا بەدیوێکی تریش لەهەموو شتێك بێ باوەڕی لێ دەخوێندرێتەوە، بۆیە لەگەڵ زەمان و زەمین دەگۆڕێن، ئەوەی ئێمە دەست نیشانمان کردووە

[١] د علی وردی –لمحات من تاریخ العراق... ج٥ ص٥٦ بنەمای ملتۆن وادەڵێ: ((لا تدع بریطانیا تنسی رسالتها في تعلیم الأمم کیف تعیش)) .

هەوڵمان داوە کۆکراوەی کۆن و نویٚ بێت لەتەوەری سەرەکی، پوختەی ئەوەیە لای موحید وادەرکەوت:

١- باوەڕداران بەڵگەی بوونی خوایان لاوازە، زیاتر ئاین لە نەزانی وترس وبزری هۆکاری ڕووداوەکان هاتوە.

٢- ئەو خوایەی باوەڕداران باسی دەکەن حوکمی بزرە، هەرچی حوکمی دەوڵەت و ئیمپراتۆر و سروشتە ڕوونە.

٣- ئەو کتێبە پیرۆزانەی دەڵێن ئاسمانیە، ڕەنگدانەوەی زەمەن و زەمینی و قۆناغی مێژووی پێوە دیارە بۆیە بەشەریە نەك غەیبی.

٤- ئایین بەشێکە لەچەوساندنەوە و دواکەوتووی و ناتەبایی، یان وەك مارکس لەو بارەیەوە دەڵێ: نەزانینی لیکدانەوەیەکی وورد بۆ کێشە ئابووریەکان لەلایەن هەندی فەیلەسووف بە ووشەی بریقەدارو لێلی وەك:خودا وبەهەشت ودۆزەخ پڕی دەکەنەوە[1].

٥- ئەو جیهانە دروست نەکراوە و هەر هەبووە و هەر دەمێنێ (دهریە).

٦- ڕووداو و سیستەمی سروشتی و زیندەکی بەیاسای سروشتی کاردەکەن نەك بەئەمری خودا.

هەموو ئەوانە زەمینەیەکی هەمیشەی بۆ بەرهەم هێنانی فەلسەفەی موحیدی (نەك موحیدی نەفامی بەڵکو موحیدی عاقلیش) پەیدا دەکا.

[1] کارل مارکس-بؤس الفلسفة ص٢٥٧ .

## ئاین بە نەزانی هاندەری فەلسەفەی مولحیدیە

جار وایە ئایین بەکار هاتوە بۆ بەرژەوەندی تایبەتی بەلام زۆر جاریش دلسۆزهەیە ویستویەتی سود بەئاین بگەیەنی زیانی لیداوە ، بەناوی ئایین کاری کردوەو ڕای دەربڕیوە میژووی نوسیتەوە ..زۆردوور بوە لەئایین ، ئیستاش زۆربەی کۆمەلگەی موسولمان لەو پۆلەن،کاتی خۆی (جمال الدینی ئەفغانی)ووتبووی ئەگەر بمانەویٚ ئیسلام بگەیەنینە ئەوروپا دەبیت یەکەم جار بۆیان بسەلمێنین کە ئیمە موسولمان نین ،غزالیش هاوار بکاو بلێ بلاوبوونەوەی بیٚ بڕوایی نیوەی لە ئەستۆی ئاینپەروەران خۆیانە کەنازانن وەسفی خواو ئاینەکەیان بکەن: (إن انتشار الكفر في العالم يحمل نصف أوزاره متدينون بغضوا الله إلى خلقه بسوء صنيعهم وسوء كلامهم)، ئەوانە وەسفی دۆستە، وەسفی دژانی ئاین زۆر توند ترە، ئەنجلس بە تەوسەوە دەلێ: خوا چەندە بە دەست نەزانی لایەنگرانی خۆی ماندووبوە، دەلێت وەك (فریدریك ولیامی سێیەم)ی لیهاتوە چۆن ئەویش بەدەست جەنەراڵ و سەرکردە عسکریەکان قەلا بەقەلا دەیان دۆڕاندو چەکیان دادەنا، لایەنگرانی خواش بەرامبەر زانست ئاوا وا دەدۆڕێنن.[١] ، ریتشارد داوکینز دەلێ: خوا لە (عهد القديم) وادەردەکەوێ بکوژوقین لەدل و خۆویستی بێ بەزەیی و ڕەگەزپەرست بێت، دیفید میلز لە کتێبی ( atheise univers ) لە بەشی یەکەمی دەلێ ئەگەر کتێبی پیرۆز زۆر بەووردی وزانستیانە بخوێنیەوە یەکسەر بێ باوەڕ دەبی ، زانایەکی تر دەلێ کنیسە ببوە ناوەندی بەرپاکردنی مولحیدی[٢].. هەر لەسەر ئەو بنچینەیە وای لە (بلوخ)کردبوو

---

[١] انجلس- ديالكتيك الطبيعة ص٢٣٠

[٢] الفيزياء والوجودالخالق ص٢٥

بلێت:(مولحیــد مەســیحی ڕاســتەقینەیە، مەســیحی ڕاســتەقینەش مولحیده)[١]...

لـە نوسـینەوەی میـژووی ئیسـلامیش وا دەردەكـەوی ئـایین بكـوژەو ستەمكارە كەچی وانیە نمونە: كوشتن وكەنیزە كردن وتالانكردن ودەعوە چۆن دەبیت ؟نوسینەوەی میژوو پڕە لەو نمونە زیادەڕۆیانە (مبالغات)، لـە كتیبی (مغنـی المحتـاج) چیرۆكەك دەگێڕیتـەوە بـۆ پاساوی هەندی كاری نەشیاو دەلیـت: لەشـەڕی جەلـەولا دەسـتكەوت ١٧ ملیـون بـوو ئـیبن عمـر چاوی كەوتە سەر كەنیزەیەكیان گەردەنی وەك زیو وابوە خۆی پێڕانەگیراو لەبەر چاوی ئەسحابان واو وای كرد[٢] ! جاریێ هەمو رۆژهەلاتی ناوەراست ١٧ملیــۆن نــەبوون ئــەوكاتی ..ئینجــا ئەگــەر غــەزەوات وفتوحــات وبلاوكردنـەوەی ئـاین ئـاوا بووبیـت ئـەوە چ جـۆرە دەعوەیەكـە سـەرومالی بەتالان ببەی وداواشـی لیبكەی وەرە ببە موسولمان ! واتیبینـی دەكریت زۆربەی میژوو وفقهی ئیسلامی دوو ڕەهەندی بەسەر میـژوو وفتواكان زال كردوە ،خوین رشتن وسیكس ، كوشتن وتـالان نمونەیان گەلی زۆرە،سەرنج بـدە تەفسـیری (إِنَّ أَصْـحَابَ الْجَنَّـةِ الْيَـوْمَ فِـي شُـغُلٍ فَـاكِهُونَ – سـورەتی یـس،ئایـەتی:٥٥)دەلـێن ئـەوە مانـای وایـە بەهەشـتیەكان هـەر چـوونە نـاو بەهەشـت ئـیتر سـەرقالی سیكسـی دەبـن و كچـی تازەیـان بـۆ ڕێزكـراوەو ئەوانیش هەر یەكە یەكە خەریكی ئەوەن لەكچەوە دەیانكەنە ژن!! ئەوانەی خوارەوە سەرچاوەی ئەو زانیاریی وتەفسیرە نامۆیەیەن :

---

[١] الماركسية والدين ص٧.
[٢] ابی زكريا النووی –مغنی المحتاج مطبعة مصطفی/القاهرة ١٩٥٨م ج٣ ص٤١٢.

١–ذكر الترمذي الحكيم في كتاب مشكل القرآن له : حدثنا محمد بن حميد الرازي ، حدثنا يعقوب القمي ، عن حفص بن حميد ، عن شمر بن عطية ، عن شقيق بن سلمة ، عن عبد الله بن مسعود في قوله : إن أصحاب الجنة اليوم في شغل فاكهون قال : شغلهم افتضاض العذارى.

٢- قال ابن مسعود وابن عباس وقتادة ومجاهد : شغلهم افتضاض العذارى.

٣- حدثنا ابن حميد، قال: ثنا يعقوب، عن حفص بن حميد، عن شَمِر بن عطية، عن شقيق بن سلمة، عن عبد الله بن مسعود، في قوله ) إِنَّ أَصْحَابَ الْجَنَّةِ الْيَوْمَ فِي شُغُلٍ فَاكِهُونَ ( قال: شغلهم افتضاض العذارى.

٤- حدثنا ابن عبد الأعلى، قال: ثنا المعتمر، عن أبيه، عن أبي عمرو، عن عكرمة، عن ابن عباس ) إِنَّ أَصْحَابَ الْجَنَّةِ الْيَوْمَ فِي شُغُلٍ فَاكِهُونَ ( قال: افتضاض الأبكار.

٥- حدثني عبيد بن أسباط بن محمد، قال: ثنا أبي، عن أبيه، عن عكرمة، عن ابن عباس ) إِنَّ أَصْحَابَ الْجَنَّةِ الْيَوْمَ فِي شُغُلٍ فَاكِهُونَ( قال: افتضاض الأبكار.

٦- حدثني الحسين بن علي الصُّدائي، قال: ثنا أبو النضر، عن الأشجعي، عن وائل بن داود، عن سعيد بن المسيب، في قوله ) إِنَّ أَصْحَابَ الْجَنَّة الْيَوْمَ فِي شُغُلٍ فَاكِهُونَ (قال: في افتضاض العذارى .....

**تا ئەوساتەش هەندێ زانای ئاینی باوەڕیان بەوە نیە زەمین خڕە لەوانە (بن باز) ،بابوەستین لەسەر دەقی فتواکەی لەبارەی دۆخی زەوی و ئاسمان و بەکافر کردنی هەرچی بلێت خڕەو بەدەوری خۆر دەسوڕێتەوە :**

السؤال الثالث من الفتوى رقم (١٨٦٤٧) – والجواب لأبن باز

**س ٣**: في درس للعلوم أدرسه: أن الأرض تدور حول الشمس، وحيث إنني سمعت من الشيخ أبي بكر الجزائري: أن الشمس هي التي تدور حول الأرض، وأن من يدرس هذه المادة

يجب أن يخاف الله، وأن هذا خطر على عقيدته، حيث إن هذا الأمر يكفر صاحبه، فقد قمت بعد أداء الدرس بتوضيح ذلك للطلبة، فهل هذا الأمر صحيح أم أنني مخطئ في ذلك، أفيدوني أثابكم الله وجزاكم عنا كل خير.

**ج ٣:** ما قاله الشيخ أبو بكر صحيح، فإن الأرض ثابتة قارة، والشمس هي التي تدور حولها، كما قال الله عز وجل: {اللَّهُ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ قَرَارًا} وقال سبحانه: {وَالشَّمْسُ تَجْرِي لِمُسْتَقَرٍّ لَهَا} وقال في الشمس والقمر: {كُلٌّ يَجْرِي إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى} ومن قال: إن الأرض هي التي تدور، وأن الشمس واقفة فهو مكذب للقرآن، وتكذيب القرآن كفر أكبر، نسأل الله العافية والسلامة.

وبالله التوفيق، وصلى الله على نبينا محمد وآله وصحبه وسلم[1].

**زۆر نموونەی تر هەیە لەئاستی بەرز بەناوی ئایین کەچی ڕاست نیەو زیانی گەورەش بەئایین دەدات ،وادەکات تیگەیشتن و وێنەیەکی خراپ بە ناوی ئایین بدریتە کۆمەلگە ، لەو سۆنگە قوولەوە وەسفی زۆر خراپی ئاین کراوە، وا هەندێکی تۆماردەکەین:**

**–مارکسیەکان: ئایین ئامرازی چەوساندنەوەیە**

**– جیسف انتورا: ئایین بوویتە عوکاز بۆ ئەوانەی عەقلیان کەمە .**

**– تایلر: ئاین لە گیانە عفریتیەکان هاتووە.**

**– سپنز: لە چیرۆکی مردووەکان هاتووە.**

[1] لە کتیبی(مجموع الفتاوی ج٩ص٢٢٨ ،لە فتوی ژ:١٥٢٥٥ زانایانی تر(عبدالعزیز ال شیخ- صالح فوزان-عبدالله بن غدیان-ابن باز) هەمو فتوای ئەوەیان دا ئەوەی بلی زەوی دەسوری کافرە ،دوای لەوەی پشیمان بۆوە ووتی نابتە کافر بەلام دژ بە ئیسلامە.

– کوندریت مولر: لە ترسی کارەساتە سروشتی یەکان هاتووە.

– بزر: لە مەزنی سروشت هاتووە کۆتایش دێت بە کۆنترۆڵ کردنی سروشت.

– فرۆید: لە پشیمان بوونەوەی باپیرە کوژراوەکەیان هاتووە.

– ج سنتیانا(١٨٦٣-١٩٥٢)ئاین لە شیعرو پەخشان وئەفسانە هاتوە بەگەشەی زانستی سروشتی هەمو ئەو ئاینانە لەناو دەچێ.

بارون دولباخ لەکتێبی(المسیحیه من غیر ستار): ئاین دژ بە سیاسەتی راست ودروست وئاسودەی میلەتانە (ئاین لە دروستکراوی تاغوتەکانە)

غارودی: ئامۆژگاری مسیحی دەکاو دەڵێ ئایندار کات بە فیرۆ دانە

–لینین ئاین گولیکی جوانە بەلاَم بێ بەرە

لەگەڵ زۆر رای تری وا هەر مارکس نەیوتوە (الدین افیون الشعوب)زۆر لەفەیلەسوفانی چاك وخراپ بەهۆی هەلەیی تیروانینی ئاین پەروەران وایان ووتوە، لەوانە: کانگ وهیردر وفیورباخ وبرونو باور وهاینریش..هەمان جەوهەریان دووبارە کردۆتەوە، زۆربەشیان کاردانەوەی بە هەلە وەسفی ئاین وبەکارهینانی ئەو هەڵوێستانەی بۆ دروست کردوونە.

بۆیە ناچاری بۆ تێگەیاندنی ئاینی راستەقینە ئایین وئایندار لیکجیابکەیەوە ، میژووی ئیسلامی وئیسلام لیکجیابکەیەوە ،پەیام وفقە لیکجیابکەیەوە ...،مەزهەب وتایفەو ئایین لیکجیابکەیەوە ، لەدوای ئەو هەنگاوانە ئینجا دەتوانی دیالۆگ لەگەل مولحیدی مەعقول بکەی .

## هۆی تایبەتی فەلسەفەی ئیلحادی لە کوردستان

ئەو هۆکارانەی لەپێشوو باسمان کرد گشتی بوو، بۆ هەر میللەتێکیش هەندێ هۆی تایبەتی هەیە، لەنێو تورك لەلایەن ئیتیحاد تەرەقی و کەمالی وتۆرانیەکان دەگۆترا سیستەمی ئیسلامی و عوسمانی زیانی بەیەکرێزی جیهانی تورك هێنا ، شکستیشی لەجەنگی جیهانی یەکەم (١٩١٤-١٩١٨) زیاتر توندی کردوون، بەتایبەتی دوای سەردانەکەی شای ئەلمانیا (ڤلهالمی دوەم) لە پیش جەنگ کە ئامۆژگاری کردبوون تورك گرنگی بە ئاسیای ناوەڕاست بدا کە هەمووی تورکن باشترە لەرۆژهەلاتی ناوەڕاست.

لە نێوعەرەبیش دەڵێن عەرەب بوە قوربانی ئیسلام، ساتیع حصری دەڵێ عەرەبایەتی ڕەسەن ترە لە ئایین، لەکاتێکدا سێ ئایین گۆڕا بەلام عەرەب هەر عەرەبە، مەلیك فەیسەلیش لە وتارێکی وتبووی (ئێمە عەرەبین پێش محمد و عیسا و موسا)[1]، (ئیبراهیم احمد)ی شاعیر و بیریاری کوردیش بەهۆنراوە دەڵێ: ئێمە کوردین و هەرکورد دەبین،..پێشی ئەدیان هەر کورد بووینە...

هەردوو لای مولحیدانی تورك و عەرەب پێیان وایە ئیسلام هۆکاری دواکەوتن و پارچەپارچەبونیانە[2]، هەرچی ئیلحادە لە کوردستان لەمێژوودا لە دوای ئیسلام سەریهەڵنەداوە، ئەو تومەتەی ئیلحاد کەدراوەتە هەندێ زانای گەورەی کوردی وەك سیف الدین ئامدی ئەوا لەچوارچێوەی ململانێی نێوان فقهو فلسەفە بوە، شۆڕش و شەڕ لەگەڵ سوڵتانی ئایینی کراوە، بەلام ئیلحادی لێ دروست نەبووە، دیاردەیەکی

---

[1] العلمانیە والدولە الدینیە ص٣٩.

[2] شبلی شمیل لە کتیبی(فلسفة النشوء والإرتقاء) باس لەوە دەکا کە ئاین فاکتەری هەرە چالاکی پەرتەوازەی میلەتانە بەتایبەتی میلەتی عرب.

تازەیە لەقۆناغی نویێ ی شۆڕشی کورد لەدوای ١٩٧٥ سەری هەڵدا، پێشووتر تاك و تەرا هەبووە.

ڕەنگە یەکەم نەوەی ئیلحاد لەگەڵ یەکەم نەوەی عەلمانیەتی کوردسەریان هەڵدابێ کە بریتین لە: د.عەبدوللا جەودەت، ئیسحاق سکوتلی، فکری لوتفی، زیاکۆك ئەلب....[١]، بەڵام بەردەوامی بزوتنەوەی ڕزگاری خوازی کوردی لەژێر سایەی زانا و مەلا و شێخە ئایینیەکان وای کرد مولحیدی نەبێتە دیاردە و زیاتر قەتیس بمێنێت لەنێو شیوعیەکان و هەندێ ئینتیمای تری وجودی و دەهری کە زۆر کەم بوون.

لەدوای ١٩٧٥ تاڕادەیەك فەلسەفەی ئیلحادی زیادی کرد و مارکسیەت بوە چرای پێشەنگی کوردایەتی[٢]، بەکورتی هۆکارەکانی ئیلحاد لە کوردستان(سەرەڕای ئەوانەی سەروو) سێ بەشن: بەشێکی کاریگەرن بەو خالآنەی ئیلحادی گشتی (لەپێشوو باسمان کرد)، بەشیکی تریان دەگەڕێتەوە بۆ خودی مولحیدو تیکشیواوی زانیاریەکانی ،بەشی دوایش دەگەڕێتەوە بۆدۆخی ئایندار کەبەکورتی ئەوانەی خوارەوەیە:

١. بەشێکی زۆر کاردانەوەی چەوسانەوەی نەتەوەیی بووە، بەرامبەر ئەو زوڵم و زۆرەی دەکرێ، دەبینین داگیرکەران بەڕووکەش موسڵمانن، واهەست دەکەن هەر دەوڵەتەکان داگیرکەر و زۆردار نین بەڵکو میللەتی مسوڵمانی دەوڵەتەکەش یارمەتی دەرن، کەمتر بینیویانە زانایانی ئایینی لە وڵاتانی عێراق و ئێران و تورکیاوسوریا سۆزی ئایینی بیگرێ لەسەر کورد فەتوایەکی ئیجابی بدا،

---

[٣] مولحید و عەلمانی لێك جیان، مەرج نیە عەلمانی مولحید بێ، عەلمانیەت باوەڕی بەشەریعەت نیە مەرج نیە باوەڕی بە خوا نەبێت.

[٢] تەنانەت پ.د.ك لەسەر ڕێبازی بارزانی – ئایینی بووە، کەچی لە کۆنگرەی – ٩- المنهاج والنظام الداخلی للحزب الدیمقراطی الکردستانی (منهاج)وایان تۆمارکرد :
المادة الخامسة\ یسیر الحزب فی نضاله السیاسی والاجتماعی والاقتصادی علی ضوء النظریة المارکسیة اللینینیة ویقوم بتثقیف النظریة المارکسیة وتسلیح کوادره ومنتسبیه مرکزیاًبها، کما ویستفید من التجارب الشعب الکردی وتراث البارزانی الفکری، ومن التجارب حرکات التحرر الوطنی فی العالم.

(جگە لەهەندێ زانای شیعە) نەبێ بەدەگمەن نەبووە، بەڵکو بەپێچەوانەوە هەندێك لەزانا و موفتی و بزوتنەوە ئیسلامیەکانیش ناوی کورد بە پیلانگێر و سەر بە ئیمپریالیزم و ئیسرائیل وەسف دەکەن.

لەلایەکی تر دەبینین لەکاتی مەینەتی و لێقەومانی کورد کەمتر ولاٌتانی جیهانی ئیسلامی لەسەر کورد بەوەلاٌم دێن، زیاتر ولاٌتانی ڕۆژئاوا و غەیرە ئیسلامیە، ئەوە کاریگەریەکی قوڵ لەسەر ناخ و سایکۆلۆژیەتی تاکی کوردکردووە، باوەڕی بە مسوڵمانان ئیسلامیش لەق بێت.

٢. بەشێکی تری شارەزای مێژووی کورد هۆکارێکی سەرباری تری خاڵی (٢)یان بۆ دروست دەبێت، کاتێ دەبینین هەندێ مەزهەبی فیقهی ئیسلامی و زانای موعتەبەر بەچاوی (مەوالی) و (علوج) و (ڕەچەلەك سوك) بەلای مێژووی کورد داچووە، لەوانە مەزهەبی ئیمامی شافیعی ئیمام سەعالیی و شێخ ئیسلام ئیبین تەیمیە و زۆری تر پێیان وابووە عەرەب پلە یەکەو کورد پلە دووە[1].

بەشێك ڕەچەڵەکی کوردیان کردۆتە عەرەب یان جن یان (ئەعرابی فارس)...، بۆچوونی ئەو زانایانە لەگەڵ تەیاری عروبی ئێستا و بۆچوونیان لەبارەی کورد دیمەنێکی زۆر ناشرینی ئاین دێنێتە پێش چاو، ئەگەر زۆر بەوردی ئەو زانیاریانە لێك نەکەیتەوە و ڕەفتاری مسوڵمان و ئەسلی ئاین لێك جیانەکەیتەوە(کە ئەو تەقەلایەش زۆر کەمە) ئەوا ئەو ڕەوشە دەبێتە زەمینەیەکی زۆر چالاکی ئیلحادی لە کوردستان .

ئەوەی زیاتر ئەو قەیرانە قوول تر دەکاتەوە تا ئەو ساتە لایەنە ئیسلامیەکانیش نەهاتوون لەگەڵ ڕابوونی خۆیان پیشەنگ بن بۆ چاکردنەوەی ئەو دەردە مەزهەبیانە، بەڵکو زیاتر کەوتونە ژێر کاریگەری تەیاری عروبی کەبەسەر

---

[1] ڕۆڵی عەلمانی لەدروست بوونی مەینەتی کورد - ل ٣٠٨-

زۆربەی بزوتنەوە ئیسلامیەکانی عەرەب زاڵە، ئیسلامی کوردستانیش بە توندو نەرمیەوە لەژێرکاریگەریەکی سەختی ئیسلامی عەرەبە بەچەوت وڕاستیەوە، لەودەمە سەرەتای تەقەلایەك بەدی دەکرێ بۆ رزگاربوون لە ژێر ئەو بارە قورسە.

٣. میلەتی کورد زۆر پێویستی بە یەکریزی هەیە، کەچی دەبینن ئەو هەمو کێشەیەی مەزهەبی وفقهی وسیاسی لە نیو موسوڵمانی کورد هەبێ، وادەردەکەوێ ئاین مایەی یەکڕیزی نیە.

هۆکاری لای موڵحیدانی کورد:

٤. ئەوەی ئێستا لەبەشێکی فراوانی عەلمانی کورد و باڵێ ئیلحادی دەبینرێ هێشتا زانیاریە فەلسەفی و زانستی و گەردونیەکانیان زۆر کلاسیکیە، کتێبەکانی (هۆبز) و (نیچە) و (رۆسۆ) و (مۆنتسیکۆ) توخمەکانی فیکری رۆشنبیری کورد پێکدەهێنێ.پیشتریش کتێبەکانی مارکس وئەنجلس ولینین و ترۆتسکی وماوتسی تۆنگ وکیم ئیل سۆنگ و ج پۆلیتزرو...کاریگەر بوون.

٥. بەشێکی تری هۆکاری تایبەتی ئەوەیە زۆربەی رۆشنبیرانی عەلمانی کورد دەردی لاسایی و (تقزم الیقافی) و دوور و قۆڵیان هەیە، لەکاتێکدا لە کوردستان مارکسی گەرم بوو لە ١٩٧٩ بەدواوە ڕاپەڕینێکی کرێکاری لەسەرانسەری ئەوروپایی رۆژهەڵات لەدژی مارکسی دەکرا بەتایبەتی لە پۆڵەندا بە سەرۆکایەتی (لیخ فاونسا)، ئینجا لەهەمان ساڵ ئێران گەورەترین شۆڕشی جەماوەری جیهانی بە هۆی ئاینی کرد، لەڕووی زانستی و ئابوری و فەلسەفی و... مارکسیەت دووچاری قەیرانی گەورەبوو.

٦. دەردیکی تریان ئەوەیە (کە لەخاڵی ١ و٢ هەڵدەهێنجرێ) ئەوان بە ڕوانگەی فەیلەسوفانی میلەتانی تر ڕوانگەی فەلسەفیان بۆ دروست دەبیت ئەوە

لەلایەك ولەلایەکی تربەڕوانگەی نەوەیەکی کۆنی فەیلەسوفان دەڕوانە جیهان وسروشت وئایین ،لەکاتیکا سروشت لەنزیکە خۆیتیان ومالیش نیە قورئانیکی لێنەبیت .

لەگەل زۆر هۆکاری تر وای کردوە ئیلحاد لە کوردستان لەنامۆی دەرچێت و گەڵالەکانی خۆی ڕاستەوخۆ لە پرسیارە فەلسەفیەکانی (بوون و نەبوون) (مادە و رۆح)، (دروستکراو دروستکەر)... گوزارش نەکا، بەڵکو زیاتر لە ریێ ی پرسی مەینەتی کورد و کێشەی مەزهەبی و کێشەی ئافرەت و مافی مرۆڤ و هەندێ کەلێنی زانستی تر بەکاردەهێنێ، رەواجیکی زۆری سیاسی وتەعلیمی پیێ بدرێ.

ئەوانەش بەدەوری خۆی زەمینەیەکی لەبار بۆ جێبوونەوەی فەلسەفەی بەدەر لە ئاین دەکاتەوە.وەك دەبینین هەندێ پاساویان بەدەستە بەڵام خودی ڕەوشەنبیری کورد بە جیایی چین وتوێژەکان قەیرانی عەقڵی هەیە، بۆیە ناتوانێ گرفتە بنچینەییەکانی بدۆزیتەوە، ئەو ڕەوشە بوویتە هۆی دابەشیەکی تری سەربارلە نێو ڕەوشەنبیری کورد، نە ئاینیەکان هەلدەستن بە لیك جیاکردنەوەی ئەسلی ئاین کەزۆر دوورە لەو ڕەگەزپەرستیەی لەلایەن هەندێ مەزهەب وخەلیفە پەیڕەو کراوە، نە ڕەوشەنبیرانی عەلمانیش ئامادەن بەدوای توێژینەوەیەکی ڕاستەقینە بگەڕێن ولە جیاتی حوکم لە تاریکی (دژایەتی ئاین) مۆمیك پیێ بکەن.

بەو شێوەیە وا هەست دەکرێ لەهەردوولا(ئاینی وعەلمانی)ی کورد داهێنانی فکری خۆی نەبێ، زیاتر پەیڕەوی داهێنانی فکری خەڵکی تر دەکەن، هەر بەنمونە: ڕای دوو موفەکیری گەورەی کورد لەو بارەیەوە ببینە: مام جلال لە بەراوردی نێوان ئیسلام وسۆشیالیستی ڕای وایە کە سۆشیالیست دەڵێ بەهەشت بۆ ئەو دنیایە دەهینم هەرچی ئیسلامە دەڵێ خۆ ڕاگرن بەهەشتان لە دوارۆژ پیێ دەدەم[١]، ئەوە

[١] بڕوانە :دەقی ووتارەکەی مام جلال بە بۆنەی یەککگرتنەوەی ئالای شۆرش و(ی ن ك).

دەقی ڕای ئەنجلسە لەبارەی مسیحی دەڵێ : (أن الفارق بين الحركتين يتمثل في أن المسيحيين الأوائل قد نقلوا الخلاص إلي الآخرة بينما تتصوره الاشتراكية في هذا العالم الدنيوي)١ ئەوەش لە بنەچەدا لە پێچەوانەی دروشمی شۆڕشی ئاینی تۆماس مونزیر بۆ رزکاری جوتیارانی١٥١٣ هاتوە، کەبریتی بوولە: وامەزانن تەنها ئاسودەیی بۆ رۆژی دواییە بەڵکو ئاینەکەمان ئەو بەهەشتە بۆ دنیا دەهێنێ،[2] هەمان بەراورد موفەکیری گەورەی کورد عبداللە ئۆجەلان دەیکا دەڵێ: پێغەمبەرو ئیمام علی لە ئێمە سۆشیالیزم تر بووینە ئەوە دەقی وەسفی مارکس وئەنجلس لە مانیفیستی شیوعی دەڵێن سەرکەوتنی ئاینی مەسیحی لەکاتی خۆی سەرکەوتن بوو بۆ مێژووش[3]، د جورج حناش کەدەڵێ پێغەمبەرەکان سۆشیالیستی بووینە پیش ئەوەی سۆشیالیستی بیتە کایەوە[4].

بەو پێیە بەرەی رەوشەنبیری عەلمانی(لەو دەمە) زیاتر بەلای رۆژئاوایی و رەوشەنبیرانی ئاینیش زیاتر بەلای عەرەب، بە تێکڕاییش قەیرانی عەقلیەتی کورد دروست بوە،ئەوەو پرسی داگیرکاری کوردو نەبوونی دەولەت هۆکاری زۆر تایبەتن بۆ بەردەوامی موحیدی لەکوردستان .

[1] مايكل لوفي – الماركسية والدين ترجمة : بشير السباعي ص٣ .
[2] ماركسية قرن عشرين ص١٥٠ .
٣ ماركس— انجلس ، بيان الشيوعى ص٦٤ .
[4] قصة الإنسان ص٦٥ .

## مولحید لـەسەدەی ٢١

بەپێچەوانەی دەقی ئاینی کەلـەیەکەم کتێبی ئاسمانی تا قورئـان بەچەسـپاوی هـاتوە بیری ئیلحـادی لـە گـۆڕان وپێچاوپێچـێکی زۆر دژوار بـوە ،بـارودۆخی زانیـاری ودەروونی موڵحیدی سەدەی ٢١ زۆر جیایە لە موڵحیدانی پیشووی خۆی ، بەجۆریك موڵحیدانی پیشوو سەرچاوەی زانیاریەکانیان لە سروشت وگـەردوون دەهـات ،لـە باری هیرش بوون ترۆپکەکەی سەردەمی مارکسی بوو ،خەریك بـوو ئـەوان ئـازادی ئاین بەیەکجاری قەدەغـە بکـەن ، لـەو بارەیـەوە مـارکس دەڵێـت: (.. ان "حريـة الاعتـقاد" البرجوازية لا تعني بالفعل سوى التساهل بجميع الأنواع الممكنة من" حريـة المعتـقد الديني "وأن يعلن أنه بالعكس يسعى جاهدا إلى تحريـر الضـمائر مـن الأوهـام والخرافات الدينية)[١]، تیکڕای تیۆرە بنچینەییەکانیان لـە ئەبـەدی وئـەزەلی بوونـەوەر دەهات، (مادیە الـدیالیکتیك)بەشێکی سەربەخۆی بەناوی (لانهائية العالم و وحدتـة)[٢] هەبوو ،کەچی ئیستا تیۆری ( بینگ بانگ– bing bang theory) جێی گرتەوە کە جیهان ئەبەدی وئەزەلی و لانهائی نیەو دروست کـراوە ، لەهـەمو زانسـتەکانی فیزیایی وکیمیایی و بایۆلـۆجی وسروشتیەکانی تـر گۆڕانکـاری بـە ئاراسـتەی ئـاینی هاتوە (جگە لەفیزیای کوانتەم ) ، ئەو زانستانەی کیمیاو فیزیاو بایۆلـۆجیاو سروشت بە فلسفەی دەدا لەپیش سەدەی ٢١ زۆر جیایە لـەگـەل ئیسـتا ، بۆیـە ئیلحـاد لـە سەدەی ٢١ دۆمەینی بیرکردنەوەی لێتەسك بوویتەوە ، لەئاسمانەوە دەرکرا بۆ زەوی هاتەوە ، مەیدانی جەدەلی لە سروشت وبونەوەرو گەردوون دوڕا ن ،ئیستا هاتوونـە سەر زەوی لـەویش زیاتر لـەو مەیدانانە ماون کە میژووین ویان هیشتا ساغ نەبووینەوە ،لەکوردستان زیـاتر بـەرۆکی میـژوو و دۆزی کـوردو پرسـی ئـافرەت و..ئەوانـە

---

[١] كارل ماركس- نقد برنامج غوتا ص ١٧.

[٢] بڕوانە : عرض موجز للمادية الديالیكتيكية ص٥٠ .

دەروژێنن کەسوود لە مێژووی شیواو وەردەگرن ،هەر تەنها ئەو مێژوانە ڕاست بکرینەوە و زانستی نوێ بەکوردستان پەرش بکەی مولحید لەکوردستان پاساوی مەعقولی نامینیت ، لەجیهانیش هەر وایە لەمەیدانی زانستی دوا سەنگەریان وا لە فیزیای کوانتەم ماونەوە ، شەڕی زانستی وفلسفی لەوێیە لەناوەخۆیان ، لەگەل پەرەسەندنی ئامرازی نوێ و تاقیگەی بەهێزترو ساغ بوونەوەی هەندێ کیشەی فیزیایی لەویش کۆتایی دێت .

بەوشێوەیە فەلسەفەی مادی بواری بەردەوامی زۆر تەسك بوویەوە، لە کۆنگرەی هەزارەیی کە لە هەفتەی کۆتایی مانگی ٢٠٠٢/٨ نیۆیۆرك بە بەشداری هەزاران زانای جیهانی جۆربەجۆری ئەکادیمی و سیاسی و ئەنسرۆپۆلۆجی، گەیشتنە ئەو قەناعەتەی کە ئاین و سیاسەت و دەوڵەت لێك جیا ناکرێتەوە و سەدەی (٢١)یشیان بە سەدەی گەڕانەوەی ئایین پێش بینی کرد[١]، توکفیل بە پێچەوانەی هوبزو سپینوزا و..دەڵێ:بۆ ئەوەی دەولەتێکی مودیرن وئاسودە دروست بکەین دەبێ لەگەڵ ئاین ئاشتی بکەنەوە[٢] ، ئیستا لەجیهان زۆربەی ڕەهای وڵاتانی جیهان لە دەستورەکانیان ئایینە خواییەکانیان بەفەرمی تۆمار کردووە، هەندێکی بە نمونە وەردەگرین : دەستوری یونان: لە هەردووماددەی (١)و(٤٧)، دانمارك: مادەکانی (١، ٢)، نەرویج: مادە(١٢)، سوید: مادە(٤)، کولومبیا: مادە(٥٤)، کورسیکا: مادە(٦٦)، سلفادور: مادە(١٢)، اسبانیا: مادە(٦)، برتغال: مادە(٢٤)، بارکوای: مادە(٣)، أرجنتین: مادە(٢)... زیاتر لەوەش هەندی وولات ئاین وەك مەرجی دەستوری بۆ شاو سەرۆکی وولاتی دیاری کراوە، لەوانە: مادە(٤) لە دەستوری سویدی، مادە(٩) ئیسبانیا...

---

[١] مەوسوعەی جودی ل٥٣

[٢] د محمد ناصر- اختاروا إحدی السبیلین الدین او لادینیة ص٥٠ (محمد ناسر سەرۆك وەزیرانی ئەندونیسیا بوو)